ساڵی سیانزەهەم پایزی ٢٠١١
گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕانو کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

# سەردەم
68

خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

ڕاوێژکاری گۆڤار
ڕێبین هەردی

دەستەی نووسین
هیوا قادر
هەورامان وریا قانع

دیزاین
ئومێد محەمەد

تایپ و هەڵەچن
ڕێبوار سەدرەدین

بەرگ
ئارام عەلی

# پێڕست

## فیکرو فەلسەفە ٤ - ٥٣



## مەلەفی ژمارە ٥٤ - ٩٣

### ئەدەب و سێکس



## گفتوگۆ ٩٤ - ١١٧

## ئەدەب و هونەر ١١٨ - ١٧٣



## ویستگەکانی سەردەم ١٧٤ - ٢١٧

# فیکر و فەلسەفە

* ئیبن روشد..
* لیبرالیزم..
* دیموکراسی کەڵکەڵە قوڵەکانی هابرماس..
* ئەویتر لەدیدی فەیلەسوفە بەراییەکانی رۆشنگەرییەوە ..
* فەلسەفەی پۆچگەرایی ..

# ئیبن روشد (ئاڤێرویس)

نووسینی: گێرت هێندریش
و. لە ئەڵمانییەوە کاوە جەلال

فەیلەسوفی عەرەبی، ئیبن روشدی قورتوبەیی، کاریگەرییەکی زۆرتری لەسەر چەرخی نێڤینی ئەوروپی نواند وەک لە رۆمانەکەی ئیبن توفەیل («حەی ئیبن یەقزان») لە سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمی ئەوروپیدا. دانتە لە «کۆمیدیای خودایی»دا بەم چەشنە ئیبن روشدی ناوبردووە: «ئاڤێرویس کە راڤە (شەرح)ی مەزنی نووسیوە» (Inf IV, 144). ئەوە لە بنەڕەتدا دیاردەیەکی تایبەتیی مێژووی هزرە، کە فەلسەفەی ئیبن روشد لە هزری ئەوروپی-دیانیدا گەورەترین کاریگەریی نواند نەک لە هزری عەرەبی-ئیسلامیدا. وەرگرتن (رێسەپسیۆنی) و دانوستانی فراوانی ئیبن روشد لە ناوچەی کولتووری ئیسلامیدا سەرەتا بەهۆی سەرەنجامەکانی مۆدێرنەوە، بەڵام بەتایبەتی لە سیی ساڵی

**ئەو ئیشانە کە تێیاندا هزری خۆیی ئیبن روشد بە ڕوونترین شێوە دەردەکەوێت و ئەمڕۆ زۆرترین گرنگیان پێدەدرێت، بەزۆریی بریتی بوون لە خەریکبوونە ڕەخنەییەکانی لەتەك هێرشی تیۆلۆژەکاندا بۆ سەر فەلسەفە، بۆ نموونە لەتەك "تهافت الفلاسفە"ی غەزالیدا. ئیبن روشد سەرەتا بۆ ئەم نووسینە ڕاڤەیەکی مەزنی نووسی و تێیدا ئەرگومێنتەکانی غەزالی وەك خۆیان دەخاتە ڕوو، پاشان بە شێوەیەکی سیستەماتیکی هەڵیاندەوەشێنێتەوە**



ئیبن روشد

رابووردوودا، دەستپێکرد، ئەمەش سووڕهێنەرە: ئاخر فەیلەسوفێکی چەرخی نێڤین چیی پێیە کە بە جیهانێکی مۆدێرنەی بڵێت، جیهانێک کە پارادیگمی هۆشەکی و کێشەی کۆمەڵایەتیی تەواو جیاوازی هەیە؟ ئەمڕۆ ئیبن روشد لە جیهانی عەرەبیدا زۆر زیاتر لە هەر فەیلەسوفێکی دیکەی عەرەبی-ئیسلامی وەک هزرمەندی ترادیسیۆنێکی ڕۆشنگەری دادەنرێت کە تایبەتە بە خودی کولتووری ئیسلامی و ئۆتۆنۆم و سەربەخۆیە لە ئەوروپا. بەم پێیە مرۆڤ لە لایەک کاریگەریی کەمی ئیبن روشد لەنێو ئەم کولتوورەدا دەگەڕێنێتەوە بۆ نێوەندی شوێنەواری ژیانی، لە لایەکی دی جەخت لە واتای ئەو دەکات بۆ دیسکورزی سەردەم: کاتێک هزری ئەو لە سەردەمی خۆیدا بە شوێنەوارێکی کەمێک ئامادەی کۆمەڵایەتی و هۆشەکی گەیشت، ئەوا ڕاکێشەریی فەلسەفەکەی لەم سەردەمەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شرۆڤە ڕەخنەییە کە لە پەیوەندیی نێوان ئاوەز و ئیماندا ئەنجامی دا، کەواتە دەگەڕێتەوە بۆ بابەتێک کە واتایەکی سەنتراڵیی هەیە بۆ دیسکورزی ئەمڕۆی ئیسلام.

ئەبولوەلید موحەمەد ئیبن ئەحمەد ئیبن روشد، کە لە فەلسەفەی ئەورووپیدا بە ئاڤێرۆیس ناسراوە، ساڵی ١١٢٦ لە کۆردۆبە هاتە جیهانەوە: وەک کوڕی خێزانێک کە تێیدا پشتاوپشت دادوەران (قازی) بە کاریگەریی سیاسییەوە هەڵکەوتبوون. ئیبن روشد ڕێگەی خوێندنێکی گشتگیری گرتە بەر، بەڵام ئەم خوێندنە تەنیا فەلسەفە و ماتماتیک و زانستی سروشتیی لە خۆ نەگرتبوو، بەڵکو هەروەها پزیشکی و دادوەریش، لەم پەیوەندییەشدا هاوکات لە تیۆلۆژیی ئیسلامیدا پێگەیەنرا. ساڵی ١١٦٩ ئەبو یەئقوب یوسف کە حوکمداری ئەلموەحیدینەکان بوو لە مەڕاکیش (مەغریب)، بۆ ڕاڤەکارێک (شارح) دەگەڕا تاکو فەلسەفەی ئەریستۆتێلیسی بۆ ڕوون بکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ئیبن توفەیل کە ئەو دەمە پزیشکی کۆشک بوو، پێشنیاری ئیبن روشدی لاوی کرد. ئێمە دەتوانین وای بۆ بچین کە ئیبن

توفەیل لەو کاتە بەدوواوە فێرکار و پشتیوانی ئیبن روشد بووە. ئیبن روشد لە ساڵی ١١٧١ بەدواوە دادوەری باڵای کۆردۆبە بوو و پاشان ساڵی ١١٨٢ وەک پزیشکی کۆشک جێی ئیبن توفەیلی گرتەوە. ئەو چەند ساڵێکی درێژخایەن، هەتا ئەو کاتە کە حوکمدار غەزەبی لێگرت، لە فەرمانگەی جیاوازدا کاری بۆ ئەلمووەحیدینەکان کرد. کتێبەکانی ئیبن روشد بە ئاشکرا سووتێنران، ئەو خۆیشی ناچار بوو کۆچ بکات بۆ تاراوگە. پێدەچێت پەستانی زانایانی کۆنزەرڤاتیڤی ئایین لەسەر میر بەرپرسیار بووبێت لەم رووداوە. بەڵام ئیبن روشد لە کۆتاییدا بەڕێی چەند تێزێکی پرواتاوە سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان ئیمان و ئاوەز دەرکەوتەوە. بێگومان نەفیکردنی ئیبن روشد تەنیا ماوەیەکی کورتی خایاند، دەبێت هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی بەهێزی ئەو لەسەر میری ئەلموەحیدینەکان و هەروەها بۆ ناوبانگی باشی کۆمەڵایەتیی خۆی. ئیبن روشد دوای گەڕانەوەی بۆ لای میر سەرلەنوێ هەتا مردنی رۆڵی فەرمیی لە کۆشکی حوکمداردا وەرگرتەوە.

## مێتافیزیك

ئەوە جێی سەرنجە کە «تەرقیە»ی ئیبن روشد وەک فەیلەسوف بە راڤەیەک (شەرحێک) سەبارەت بە ئەرپستۆتێلیس سەرەتای گرت. ئاخر ئەو تەواو ئەرپستۆتێلی بوو، چەرخی نێڤینی ئەورووپیش ئەوی سووک و ئاسان ناو نا «راڤەکارەکە» (الشارح) ی ئەرپستۆتێلیس. هەندێک جار ئەم پابەندبوونەی ئەو هێندە زۆرە، کە ئیتر لەدژی مەعریفە نوێکانی توێژەرانی عەرەبی-ئیسلامی بەرگری دەکات لە ئیدێکانی ئەرپستۆتێلیس لەمەڕ فەلسەفەی سروشت و فزیک، جا گەرچی ئەو توێژەرانە بەئاشکرا باشتر لە مامۆستاکەی ئەنتیکە وەڵامی پرسیارەکانیان دابۆوە. ئیبن روشد بەهۆی ئەم کەللەڕەقییەوە تانوتی ئەوەی لێدرا کە ئەو گوایە تەنیا لاساییکەرەوەی ئەرپستۆتێلیس بێت. بەڵام فەلسەفەی ئەو لە بنەڕەتدا زۆر لە فەلسەفەی ئەرپستۆتێلیس تێپەڕدەکات: ئەو، لەپاڵ راڤەی ئەرپستۆتێلیسدا، هەروەها هزری فەیلەسوفانی دیکەی ئەنتیکەی روونکردەوە، وەک بۆ نموونە «کۆمار» ((Politeiaی پلاتۆن (ئەم ئیشەی ئەو تەنیا بە وەرگێڕانێکی حیبری گەیەنراوە)، ئەوجا "ئیساگۆگە" (Isagoge)ی پۆرفیریۆس یان "ئالماگێست" ((Almagestی پتۆلێمیۆس. ئیبن روشد هاوکات هەڵوێستێکی نەساز بەرانبەر ئیبن سینا وەردەگرێت: لە ئیشە سەرەکییەکەیدا بە ناونیشانی "تهافت التهافت" بەرگری لە ئیبن سینا دەکات لەدژی هێرشەکانی غەزالی، بەڵام هاوکات زۆر رەخنەیی خۆی بە هزری ئیبن سیناوە خەریک دەکات و هەندێک لە تێزە سەنتراڵییەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەمەش بەتایبەتی تیۆریی ئیدێکانی پلاتۆن دەگرێتەوە، کە لە چەرخی نێڤیندا ناو دەنرا ریالیزمی یونیڤێرساڵەکان (تێگەکان). شتەکان کە سێنسیانە شیاوی دەرکپێکردنن و بۆ ئەزموون کراوەن، لە ریالیزمی یونیڤێرساڵەکاندا وەک ریالێتی نابینرێن، بەڵکو لە پشتیانەوە جەوهەری سەربەخۆ لە شێوەی "ئیدێ" یان "یونیڤێرساڵ"دا خۆیان حەشار داوە. بەڵام ئیبن روشد بە پێچەوانەوە وایدادەنێت کە یونیڤێرساڵەکان بریتین لە سەرەنجامی کاریگەریی زەینی چالاک لەسەر دەروونەکانی مرۆڤ و بەم شێوەیەش هیچ هەبوونێکی خۆییان لە دەرەوەی دەروون پێنادات. زەین (ملکه الفهم / Verstand) خۆی تێگە یونیڤێرساڵەکان (گشتییەکان) چێدەکات، ئەویش کاتێک فۆرمەکان (ئیدێکان) لە تاکە شتەکانی ئەزموون جیادەکاتەوە. فۆرمەکان بریتین لە توخمی جیهانی هۆشەکی و لە ناخی شتە ئەستوییەکاندان. بەم پێیە ئیبن روشد هەڵوێستێکی ناوگەرایی (nominalistisch) میانەڕەو وەردەگرێت، واتا: یونیڤێرساڵەکان لە راستیدا تێگەی دروستکراوی زەینن، بەڵام لەبەر ئەوەی فۆرمەکان گشتێتین یان بریتین لە "ئیدێ" لەنێو تاکە شتەکاندا، ئەوا نەک تەنیا زەین پێویستیی

بە لێڕوانینی تاکە شتە کۆنکرێتەکان هەیە بۆ ئەوەی بە "ئیدێ"ی فۆرمەکان بگات، بەڵکو هەروەها خودی جیهانی هۆشەکییانەی فۆرمە پەتییەکان پێویستیی بە شتە کۆنکرێتەکان هەیە تاکو خودی خۆی ریالیزە بکات. مرۆڤ دەتوانێت لەمە هزرێکی ماتەریالیستی تێبگات- وەک چۆن ئێرنست بلۆخ لێیتێدەگەیشت. بەڵام کێشەکە لە بنەڕەتدا بۆ ئیبن روشد ئەوەیە کە مەعریفەی هۆشەکی هەمیشە بریتییە لە دیاریکردنی (تێگەیشتنی) گشتێتیی ریال، کەواتە دەشێت بوونی شتەکان لەنێو خودی شتەکانی ئەزموونی سێنسیدا ئاشکرا بکرێت، بەبێ ئەوەی پێویست بێت لەتەک پلاتۆندا گریمانە بکرێت کە شتەکان بەسەر دیاردە و کرۆکدا بەش دەبن. ئەم ئیدێیانە لە فەلسەفەی ئەورووپیی چەرخی نێڤیندا سەرلەنوێ لە ناوگەرایی میانەڕەودا سەرهەڵدەدەنەوە و لێرەشدا هەڵوێستی ئەریستۆتێلیزم بەهێز دەکەن.

ئەو ئیشانە کە تێیاندا هزری خۆیی ئیبن روشد بە روونترین شێوە دەردەکەوێت و ئەمڕۆ زۆرترین گرنگیان پێدەدرێت، بەزۆریی بریتی بوون لە خەریکبوونە رەخنەییەکانی لەتەک هێرشی تیۆلۆژەکاندا بۆ سەر فەلسەفە، بۆ نموونە لەتەک "تهافت الفلاسفه"ی غەزالیدا. ئیبن روشد سەرەتا بۆ ئەم نووسینە راڤەیەکی مەزنی نووسی و تێیدا ئەرگومێنتەکانی غەزالی وەک خۆیان دەخاتە روو، پاشان بە شێوەیەکی سیستەماتیکی هەڵیاندەوەشێنێتەوە. "تەهافوت ئەلتەهافوت" ( Destructio destructionis, Die Inkohärenz der Inkohärenz) بە ئیشە سەرەکییەکەی ئیبن روشد دادەنرێت. ئەو لەم نووسینەدا هەروەها بە شێوەیەکی رەخنەیی لەتەک تێگەی هۆئەنجامیی (کاوساڵێتیی) غەزالیدا خەریک دەبێت، لێرەشدا دەگەڕێتەوە بۆ نموونەکەی غەزالی لەمەڕ پارچەیەک لۆکە کە دەکەوێتە نێو ئاگرەوە. غەزالی سەبارەت بەم نموونەیەی دەبێژێت، کە مرۆڤ دەتوانێت گریمانەی پەیوەندییەکی پاشیەکییانەی (post hoc) نێوان ئاگر و سووتان بکات، بەڵام هەرگیز ناتوانێت گریمانەی نێویەکی / هۆئەنجامی (propter hoc) بکات. ئاگر بۆ غەزالی تەنیا هۆکارێکی "مەجازی"ی سووتانە. ئێستاش ئیبن روشد بەپوختی پرسیار دەکاتەوە: ئایا مرۆڤێک کە بەرێکەوت دەکەوێتە نێو ئاگرێکەوە، تەنیا بە شێوەیەکی مەجازی دەسووتێت؟ بۆ ئیبن روشد روون و ئاشکرایە (ئێڤیدێنتە) کە سەرجەم شتەکان خاوەنی ئەدگارن و ئەم ئەدگارانە شتەکان دەکەن بە خودی شتەکان خۆیان. ئەمە بۆ نموونە لە حاڵەتی ئاگردا بریتییە لە سووتانی ئەو شتە کە بەر ئاگرەکە دەکەوێت، لێرەشەوە دەبێت ئاگرەکە وەک هۆکار ببینین، چونکە گەر وا نەبێت، ئەوسا مرۆڤ ناتوانێت هیچ گۆتەیەک (مەقولە) نە لەبارەی شتەکان و نە لەبارەی رێکخراوێکی جیهان دەرببڕێت، بەمەش ئیتر هیچ شیمانەیەک نامێنێت بۆ ئەوەی لە خودا یەکەم هۆکار تێبگەین و بەمەش هەبوونی بسەلمێنین. ئیبن روشد لەپاڵ "تهافت التهافت"دا چەند لێکۆڵینەوەیەکی بچووکی سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان ئاوەز و ئیمان نووسی کە بریتین لە: "فصل المقال» و «الكشف عن مناهج الادلـه». ئەم نووسینانە ساڵی ١٨٧٥ وەرگێڕران بۆ ئەڵمانی و لەژێر ناونیشانی «فەلسەفە و تیۆلۆژیی ئاڤێرویس»دا دانران.

### ئیمان و ئاوەز

ئیبن روشد لە «فصل المقال»دا، وەک چۆن لە «تهافت التهافت»دا، هەوڵ دەدات ئەو تۆمەتی دەرچوونە لە ئیمان لەکاربخات، کە غەزالی دابوویە پاڵ فەیلەسوفەکان بە گشتی و فارابی و ئیبن سینا بەتایبەتی، لێرەشدا لەسەر ئەو پرنسیپە دەڕوات کە هەروەها فەیلەسوفانی پێش خۆی نوێنەرایەتیان

کردبوو، ئەم پرنسیپەش بریتییە لە: راستییەکانی ئایین و فەلسەفە دژبێژیی یەکتری ناکەن. ئیبن روشد دەبێژێت:

«بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم یاسا ئایینییانە (شەریعەت) راستین و داوای لێڕوانین (النظر) دەکەن کە دەبێت بە پاڵهێزی گەیشتن بە راستی، ئەوا ئێمەی موسڵمانان بەتەواوی دەزانین کە لێڕوانین/لێهزرین ی بورهانی نابێت بە هۆی گەیشتن بە پێچەوانەکەی یاسای سروشیی (شەرع). ئاخر ناشێت راستی دژبێژیی راستی بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەتەکیدا یەکدەگرێتەوە و شایەتیی بۆ دەدات.

(...)

بەڵام گەر شەریعەت (سەرچاوەی ئایین) خۆی لێی بدوێت، ئەوا دەرکەوتەی نوتق لەتەک ئەوەدا کە بورهان دەبێت بە پاڵهێزی پێگەیشتنی، یەکدەگرێتەوە یان یەکناگرێتەوە. گەر لەتەکیدا یەکبگرێتەوە، ئەوسا پێویست ناکات زیاتر بگوترێت، بەڵام گەر لەتەکیدا یەکنەگرێتەوە، ئەوسا راڤەکردنی (تەئویل) پێویست دەبێت.

واتای تەئویل ئەوەیە کە مەغزای وشە لە مەغزایەکی راستەقینە دەربکێشرێت و بکرێت بە مەغزایەکی مەجازی، بەبێ ئەوەی بەو رێیەوە ئادەتی ئاخافتنی ئەرەبەکان کاری نێگەتیڤی تێبکرێت»[1].

کەواتە تەنیا بەرواڵەت دژبێژییەک هەیە لە نێوان راستییەکی فەلسەفەیی سەلمێنراو و مەغزای وشەیی تێکستێکی ئایینیدا، ئەم دژبێژییەش هەڵدەوەشێتەوە گەر مرۆڤ بە شێوەیەکی مەجازی لە تێکستی ئایینی تێبگات. بەڵام ئەمە هەروەها واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت، کە فەیلەسوفەکان خۆیان لەسەر هەمان ئاستی هزرمەندانەی (ئینتەلەکتوێلیی) «یاسادانەرانی ئایینی» و فەلسەفەش خۆی لەسەر هەمان ئاستی ئایینی سروشی دەبینێتەوە، وەک چۆن ئیبن روشد لە راڤەی «کۆمار»ی پلاتۆندا پیشانی دەدات: مەبەستی تەنەبوء «لەخۆدا هەمان جۆر و مەبەستی فەلسەفەیە» (ئیبن روشد، ١٩٩٦و ٩٣). بێگومان ئەوە چەند رۆشنە کە «ناشێت راستی دژبێژیی راستی بکات»، ئەوەندەش توانستی مرۆڤ بۆ ناسینی راستی نارۆشنە، چونکە «هەموو مرۆڤان بەهۆی سروشتیانەوە ناتوانن بورهان (بەلگە) قبوڵ بکەن، تەنانەت ناتوانن دیالۆگە (ئەلئەقاویل) دیالێکتیکییەکان، جا نەخوازە دیالۆگە بورهانییەکان قبوڵ بکەن»، ئەوجا لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەوە «مەبەستی شەرع تەنیا فێرکردنی هەمووانە، ئەوا پێویستە شەرع هەموو جۆرەکانی مێتۆدگەلی راستاندن و هەموو جۆرەکانی مێتۆدگەلی تێگەیشتن (تصور) لە خۆ بگرێت»[2]، لێرەشدا زۆرترین بەشیان لە فۆرمی سیمبۆلی و وتاربێژی (خیتابە) ئاڕاستەی جەماوەری ئیمانداران دەکرێت و تەنیا بەشێکی کەمیان لەسەر سوورەتی ٥٩، ئایەتی ٢ی قورئان دەڕوات: «ئێوە کە تێڕوانینتان هەیە، هەروەها بهزرێن!» (فأعتبر یا أولي الابصار). کەواتە تەنیا کەمینەیەکی زانایان دەتوانن لە راستییەکانی فەلسەفەی نەزەریی (نضری / سپێکولاتیف) تێبگەن. ئەم جەختکردنەی ئیبن روشد لە تەرخانکراویی فەلسەفە، راڤەکارانی هەنووکەی ئەوروپیی گەیاند بەو تێڕوانینە کە گوایە داواکارییەکەی ئیبن روشد بۆ ئازادیی هۆش تەنیا

١) ابو الولید بن روشد: فصل المقال فیما بین الحکمة والشریعة من الأنصال. دراسة وتحقیق: د. محمد عمارة. المؤسسة العربیة للدراسات والنشر. بیروت ١٩٨١. ص ٣١-٣٢

٢) هەمان سەرچاوەی یەکەم ص - ٥٥

هەڵوێستێکی ئێلیتییە و لەم هەڵوێستەدا زانین و تێڕوانینی فەلسەفەیی دەسوێژێک نین بۆ رزگارکردنی مرۆڤ. لە بنەڕەتدا ئەم نرخاندنە نیشانەیەکە بۆ ئەوە کە مرۆڤ کەم دەتوانێت تێبگات لە دۆخی هزرمەندێکی نێو کولتوورێکی چەرخی نێڤین، کە تێیدا ئایینێتیی ئۆرتۆدۆکس و دەسەڵاتداریی دێسپۆتی سەروەر بوون.

خودی ئیبن روشد تەواو رۆشن لە دۆخە سیاسییەکانی سەردەمەکەی دەدوێت. لە راڤەی «کۆمار»ی پلاتۆندا پەیوەندییەک چێدەکات لە نێوان دەسەڵاتی سیاسی و رەواییەدرانی ئایینیدا: لە دەوڵەتی «تیرانی»دا «دەسەڵاتداران پەیوەست بە جەماوەرەوە هیچ مەبەستێکی دیکەیان جگە لە مەبەستە خۆییەکانیان نییە، بۆیە هاوشێوەیی لە نێوان دەوڵەتی پیاوانی ئایینی (priesterlich) و تیرانیدا زۆر جار سەرەنجامێکی ئەوتۆ دەخاتەوە، کە ئەو بەشەی پیاوانی ئایین کە لەنێو ئەو دەوڵەتەدایە، دەبێت بە بەشە تیرانییەکە و ئەو کەسە رسوا دەکات کە مەبەستێکی ئایینیی هەیە، وەک چۆن ئەمە لە حاڵەتی ئەو پیاوانەی ئاییندا بەدیدەکرێت کە خۆیان لەنێو دەوڵەتەکانی ئەم سەردەمەماندا دەبیننەوە". پاشان ئیبن روشد ئەم رەخنەیە کە بە ئاشکرا لە عولەمای ئایینی دەگرێت، بە نموونەی کۆنکرێت بەرجەستەی دەکات: "نموونەیەک بۆ ئەمە بریتییە لەو دەسەڵاتدارییە کە لە کۆردۆبای وڵاتماندا هەیە" (ئیبن روشد، ١٩٩٦، ١١٩ بەدوواوە). ئیبن روشد لە راڤەی "کۆمار"ی پلاتۆندا ئەم تێزە بەرەنگاری پەیوەندییە هەبووەکان دەکاتەوە: دەبێت یاسا ئایینییەکان (شەریعەت) هەمیشە بەگوێرەی گونجانیان بەو یاسایانە بنرخێنرێن، کە لە لایەن مرۆڤانەوە دانراون. پێوەرەکانی ئەم گونجاوییە بریتین لەو رێسایانە کە پێناسەی ئەوە دەکەن، داخۆ چ رێکخراوێک (ی سیاسی) بە کرۆکی مرۆڤ دەگونجێت، ئەمەش بێگومان لەو شێوەیەدا، کە چۆن ئەو رێسایانە لە لایەن فەلسەفەوە وەک زانستی ئاوەز دادەنرێن. کەواتە داواکاریی بۆ باڵادەستیی فەلسەفە لە سەرەتاوە هەڵوێستێکی ئێلیتییانە نییە، بەڵکو سووره لەسەر فەزلدان بە بناغەڕشتنی ئاوەزیانەی یاساکان و رێکخراوە سیاسییەکان، ئەمەش تەواو بە پێچەوانەی ئەو داواکارییەوە کە دەڵێت گوایە پێویستە یاساکانی مرۆڤ هەمیشە پابەند بن بە یاسا ئایینییەکانەوە.

## زەینی نەمر

ئەم گەشبینییەی مەئریفە هەروەها لە تیۆریی زەینی ئیبن روشددا کارا دەبێت. تیۆریی زەین هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ ئەو پۆلێمیکە کە لە فەلسەفەی ئیسلامی و دیانیدا ئاڕاستەی ئەو کرا. ئەڕیستۆتێلیس مرۆڤی وەک زیندەوەرێک پێناسە کردبوو کە بەڕێی زەینییەوە لە سەرجەم زیندەوەرەکانی دیکە جیا دەبێتەوە و هەروەها دەتوانێت لە فۆرمی گشتی و لەناونەچوو تێبگات. بەڵام لەم جۆرە دیاریکردنەی مرۆڤەوە کێشەیەک دەکەوێتەوە: پێویستە روونبکرێتەوە کە چۆن زەینی مرۆڤێک لە لایەک لە فۆرمە گشتی و لەناونەچوو و سەرکەسییەکان تێدەگات، بەڵام لە لایەکی دی تەنیا زەینی کۆنکرێتی تاکە مرۆڤێکە. ئەڕیستۆتێلیس بۆ وەڵامی ئەم کێشەیە جیاوازیی کرد لە نێوان دوو زەیندا: زەینێکی ناچالاک (پاسیڤ) کە لەناودەچێت و بمرە و بەمەش بریتییە لە هێزی پێشبینیی هەر تاکەکەسێک، هەروەها زەینێکی چالاک (ئەکتیڤ) کە فۆرمە هۆشەکییە ئەزەلییەکان لە وێنەکانی هێزی پێشبینی دادەماڵێت (تەجرید دەکات). زەینی چالاک سەربەخۆیە لە لەشی کۆنکرێت و نەشیاوی لەناوچوونە، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانێت پێشبینییەکانی زەینی ناچالاک بکات

به کردەکێتی (ئەکتوالیزە بکات)، ئەوا پێویستیی به ناوەندیاریی زەینێکی شیمانەییە intellectus) possibilis)، ئەم زەینەش بریتییە لە توانستی مەعریفەی مرۆڤ و لە رووی ناوەرۆکیشەوە هیچ دەبێت گەر هاتوو زەینی چالاک کاریگەر نەبێت. بەڵام بەمە ئەو کێشەیە چارەسەر نەکرا، کە داخۆ جیهانی پێشبینیی بمر و سنوورداری تاکە مرۆڤان چ پەیوەندییەکی بە جیهانی هۆشەکییانەی زەینی چالاکەوە هەبێت، بە پێچەوانەوە کێشەکە تەنیا گواسترایەوە بۆ ئاستێکی دیکە. بەڵام ئیبن روشد لە زەینی شیمانەیش وەک زەینێکی نەشیاوی لەناوچوون تێدەگەیشت. ئەو زەینی شیمانەیی ناو دەنێت "زەینی ئەستویی"، ئەوجا ئەرگومێنت دەهێنێتەوە، کە ئەم زەینە ئەستوییە تەنانەت بەشدارە لە فۆرمە هۆشەکییەکاندا، بەشداریکردنەکەشی لەوەدایە کە فۆرمە هۆشەکییەکان بە زەینی ناچالاک دەگەیەنێت، بەڵام ئەو خۆی هاوکات زەینی کۆنکرێتی مرۆڤێکی گەرەکە، کەواتە زەینی ناچالاکی بە پێشبینیی و وێنە خۆییەکانییەوە لەمەڕ جیهان پێویستە. لەمەوە پێگە تایبەتییەکەی زەینی ئەستویی روون دەبێتەوە. زەینی چالاک لە دەرەوەی مرۆڤدایە و فۆرمە هۆشەکییەکان لە خۆ دەگرێت. زەینی ناچالاک بەشێکە لە پێکەوەلکاویی لەش و دەروون و هاوشێوەی هەردووکیان تایبەتە بە لەناوچوون. بەڵام گەر مرۆڤێک بمرێت، ئەوسا هیچ گومانی تێدا نییە کە یەکێتییەکەی لەش و دەروون و لەتەک ئەویشدا زەینی ناچالاک لەناودەچێت، بەڵام زەینی ئەستویی لەناوناچێت. ئەم وەک زۆرێتی سەر بە تاکە مرۆڤان نییە، بەڵکو وەک یەکایەتی سەر بە رەگەزی مرۆڤە. کەواتە گەر زەین (Verstand / ملکه الفهم) ی مرۆڤ بەرێی زەینی ئەستوییەوە بە مەئریفەی فۆرمە هۆشەکییەکان، واتا بە مەئریفەی راستییە ئەزەلییەکان بگات، ئەوا بەم رێیەوە کارەکتەرێکی گەردوونی وەردەگرێت.

بەڵام بڕوابوون بە نەمریی دەروونی کەسی یەکێکە لە دۆگمە بنەڕەتیەکانی ئیسلام و دیانەتی. کاتێک ئیبن روشد تاکە دەروونە خۆییەکان بە بمر و تەنیا زەینی ئەستویی وەک شێوەیەکی "دەروونی رەگەزی" بە نەمر دادەنێت، ئەوا بەم رێیەوە فەلسەفەکەی دەکەوێتە ناکۆکییەوە لەتەک دۆگمە ئایینییەکاندا، سازاو بەمەش ئۆرتۆدۆکسیی ئایینی لە هەردوو ئایینەکەدا پەرچەکرداری دوژمنانەیان بەرانبەر نواند. بۆ نموونە بیشۆپی پاریس ساڵی ١٢٧٠ سیازدە تێزی فەلسەفەیی مەحکوم کرد، لێرەشدا تیۆریی ئیبن-روشدییانەی دەروون یەکێک بوو لەو تێزانە. تۆماسی ئەکوینی بە نووسینێکی پۆلێمیکی بە ناونیشانی "لەبارەی یەکایەتیی زەین لەدژی ئاڤیرۆیستەکان" (De unitate intellectus contra Averroistas) هەڵوێست وەردەگرێت، ئەم نووسینە لە بنەڕەتدا کەمتر راستەوخۆ روودەکاتە ئیبن روشد، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەزۆری روودەکاتە فەیلەسوف سیگەر فۆن برابانت کە بە ئاشکرا لایەنگریی خۆی بۆ تیۆریی زەینی ئیبن روشد راگەیاندبوو. دەنگدانەوەی تیۆریی ئاڤێرۆیستی هەروەها لە "دی مۆنارشییا" (De Monarchia, ١٣١٣)ی دانتەدا دەبینرێت. تێگەیشتنی ئیبن روشد سەبارەت بە زەینی نەمری رەگەزی مرۆڤ ئەوە بوو کە ئەم زەینە بەردەوام لە رەوتی پەرەسەندنی زانین و توانستی پەرچاندندا پێشدەکەوێت؛ دانتە ئالیگیری لەم تێگەیشتەی ئیبن روشدەوە بۆ زەینی نەمر زەرورەی رێکخراوێکی سیاسیی وەک دەرەنجام بردەوە، کە دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ پرۆسەیەکی هاوشێوەی گەشەسەندن و خۆیشی تەنانەت سوود لەو پرۆسەیە دەبینێت. بەڵام بەم رێیەوە ئێستا سەرەنجامێکی ئەوتۆ دەکەوێتەوە کە ئیتر رێکخراوی

ئاكاریی كۆمەڵگەی مرۆڤ بریتی نابێت لە بەرهەمی ڕێكخراوێكی راگەیەنراوی خودا، بەڵكو بریتی دەبێت لە بەرهەمی ئاوەزی مرۆڤ و تەنیا بەڕێی ئاوەزەوە رەوایەتیی پێدەدرێت. تێزەكەی ئیبن روشد لە كۆنتێكستێكی هاوشێوەدا هەروەها لە سەرەنجامەكانی رۆشنگەریی ئەوروپیشدا دەردەكەوێت. هێردەر لە نووسینەكەیدا بە ناونیشانی "ئیدێگەل سەبارەت بە فەلسەفەی مێژووی مرۆڤایەتی" (١٧٨٤/٩١) هێرش دەكاتە سەر تێزەكەی ئیبن روشد: "فەلسەفەی مێژووی ئێمە ناچێتە سەر ئەم رێگەیەی فەلسەفەی ئاڤێرۆیستی، كە روانگەكەی ئەوەیە، گوایە سەرجەم رەگەزی مرۆڤ تەنیا یەك، بەڵێ یەك دەروونی زۆر نزمی هەیە و ئەم دەروونە تەنیا تا رادەیەك خۆی بە تاكە مرۆڤ دەگەیەنێت" (Herder, ٣٣٨ ,١٩٨٩). ئەم تیرە كە وا دەردەكەوێت ئاڕاستەی نووسینەكەی لێسینگ بە ناونیشانی "پەروەردەی رەگەزی مرۆڤ" كرابێت، لە بنەڕەتدا راستەوخۆ ئاڕاستەی كانت كراوە. ئاخر كانت لە نووسینەكەیدا بە ناونیشانی "ئیدێی مێژوویەكی گشتی لە روانگەی هاوڵاتێتیی جیهانییەوە" (١٧٨٤) نووسیبووی: "لە مرۆڤدا (وەك تاكە مەخلوقێكی ئاوەزمەند لەسەر زەمین) ئەو توانستانەی سروشت كە روودەكەنە بەكارهێنانی ئاوەزی ئەو، تەنیا لەنێو رەگەزدا نەك لەنێو تاكەكەسدا بەتەواوی دەگۆڕرێن" (Kant, 1968, VIII 18). ئەوە لە بنەڕەتدا بریتی دەبێت لە مەزنەیەكی شایانی گرنگیپێدان، كە داخۆ كانت لێرەدا بەڕاستی "ئاڤێرۆیستییانە" ئەرگومێنت بهێنێتەوە یان داخۆ بە پێچەوانەوە بتوانین دەرەنجامێكی ئەوتۆ ببەینەوە، كە مەبەستی ئیبن روشدیش بریتی بووە لە شێوازە هزرینێكی هاوشێوە. بەڵام مەبەستی كانت لە بنەڕەتدا روو ناكاتە فیگورێكی تیۆریی دەروون لە مەغزای كلاسیكی ئەریستۆتێلییانەدا، بەمەش رووناكاتە پرسیار سەبارەت بە نەمریی دەروونی كەسی (ئیندیڤیدوێل)، بەڵكو روودەكاتە كارەكتەری مێژوو وەك پێشكەوتنی ماف: بەوەدا كە مرۆڤان وەك بوونەوەری ئاوەزمەند خۆیان دەست دەدەنە چاكسازیی پەیوەندییەكانیان، ئەوا وەك بوونەوەری رەگەزی رۆڵێك بۆ ئەوە دەگێڕن، كە لەنێو پرۆسەی مێژووییدا مەرجەكان بۆ شیمانەی ئاوەڵابوونی ئاوەز و ئاكار لەنێو تاكە مرۆڤدا ئامادەدەكرێن و لە كۆتاییشدا بەتەواوی ئاوەڵا دەبن. بێگومان نابێت ئەو ئۆتۆنۆمییە، كە ئیبن روشد لێرەدا بۆ مرۆڤی ئاوەزمەند رایدەگەیەنێت، هاوشێوەی ئیدێی ئەو ئۆتۆنۆمییە دابنێین كە كانت لێیدەدوێت: ئیبن روشد واز لە بڕوا بناغەییەكەی پارادیگمای ئۆنتۆلۆژی ناهێنێت، كە تێیدا راستی وەك مەعریفەی بوونەوەری راستەقینە دادەنرێت، بەڵام ئۆتۆنۆمیی سەبژێكت لە لای كانت لەو بنەمایەوە دەردەچێت، كە مرۆڤ ناتوانێت بگات بە مەعریفەی راستییەكی بەو چەشنە، هەر لەمەشدایە بناغەی ئۆتۆنۆمیی مرۆڤ و تەنانەت ئۆتۆنۆمیی ئاكاریش. بەمەش ئاوەز بۆ كانت بریتییە لە نێوەندێكی دادوەریی بێسنوور و هەر خۆی دەتوانێت سنوورەكانی خۆی دیاری بكات. ئاوەز بۆ ئیبن روشد مێدیومی بەشداریكردنە لە رێكخراوێكی بووندا كە لە دەرەوەی ئاوەزی سنوورداری مرۆڤدایە. كەواتە تانوتی ئاڤێرۆیزم كە هێردەر دەیگرێتە كانت، بریتییە لە بەهەڵەتێگەیشتن، بەڵام ئەم تانوتە هەروەها پیشانی دەدات، كە هەتا چ رادەیەك ئەم فەیلەسوفەی چەرخی نێڤین دێتە نێو هزری مۆدێرنەوە و بەمەش بەشداری دەكات لە دانانی بناغەكاندا بۆ وەرچەرخانی پارادیگماكە رووەو فەلسەفەی سەردەمی نوێ. بێگومان ئەمە تەنیا لە فەلسەفەی ئەوروپیدا رووی دا. فەلسەفەی

ئیبن روشد لە جیهانی ئەرەبی-ئیسلامیدا دەرکپێکرا، بەڵام ئەمە لە رادەیەکی زۆر کەمتردا وەک لە ئەوروپا و هەروەها بەزۆریش لە شێوەی رەتکردنەوەدا.

### سەرچاوە:

Geert Hendrich, Arabisch-Islamisch Philosophie, Campus Verlay 2005

### تێبینی:

بۆ وەرگێڕانی سیتاتەکانی (ئیقتیباسەکانی) " فصل المقال» و «قورئان» بە پێویستمان زانی بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە عەرەبییەکان، چونکە وەرگێڕانی بابەتە عەرەبییەکان لە ئەڵمانییەوە بۆ کوردی لە مەبەستی سەرچاوەکان دووریان دەخستینەوە.

### فەرهەنگۆك

بیشۆپ: (اسقف).

پۆلێمیک: شەڕی زانستی.

تیرانی: دەسەڵاتداریی تاکەکەسێکی زۆردار.

دێسپۆتی: دەسەڵاتداریی تاکەکەسێکی زۆردار.

دێمۆکراتی: دەسەڵاتداریی جەماوەر.

ریالیزم: واتاکەی جیاوازە لە واتای مۆدێرنی ریالیزم، لەم رێبازە هزرییەدا کە لە پلاتۆنەوە دەردەچێت، ریالیزم ئەوەیە کە لە واتای مۆدێرندا ناودەنرێت ئیدیالیزم.

ریالیزمی یونیڤێرسالەکان: لە ریالیزمی یونیڤێرسالەکاندا بوونی راستەقینە دەدرێت بە تێگەکان، گشتێتییەکان، کە پابەند بەوانەوە شتە تاکەکان دەخولقێنرێن.

زەین: توانستی تێگەیشتن (ملكه الفهم).

زەینی ناچالاک و چالاک: لای ئەرپستۆتێلیس زەینی ناچالاک بریتییە لە توانستی دەرککردنی مرۆڤ، کە لە پرۆسەی دەرککردندا بە «مەعریفە»ی بابەتێک (درەختێک) دەگات، پاشان ئەوە ئەرکی زەینی چالاکە کە دەست بەسەر ئەم مەعریفە شیمانەییەدا بگرێت و بە دیاریکردنی فۆرمەکەی بە بونیادێکی بوون بگات.

سێنس: بریتییە لە تۆمارگریی فیزیۆلۆژیانە لەنێو مرۆڤ و ئاژەڵە پێشکەوتووەکاندا. سێنسەکان بریتین لە سێنسی بینین، بیستن، چێژتن، بۆنکردن، گرتن.

فۆرم: ئایدۆس، ئیدێ، گشتێتی. فۆرم بریتییە لە هەقیقەتی کەرەسەیەک. کاتێک پلاتۆن بوونێکی سەرمەدی بە فۆرمەکان (ئیدێکان) دەدات، واتا سەربەخۆ لە جیهانی فەزا-کاتی دایان دەنێت، ئەوا ئەرپستۆتێلیس پەیوەندییەکی تێلیۆلۆژیانەی (هۆئەنجامیی) نێویەکی لە نێوان فۆرم و کەرەسەدا وەردەگرێت.

کردەکێتی: بە گریکی 'ئێنێرجێیا'، بە لاتینی 'ئەکتوالیتاس'، بریتییە لە تێگەی گشتگیری ئەوە کە بەڕاستی هەیە، هەروەها مەبەستی تێگەکە رووەکاتە کرۆکی هەبووەکە. بە پێچەوانەی کردەکییەوە، هێزەکی یان شیمانەیی (پۆتێنسیالێتی) هەیە کە هێشتا کردەکی نییە. کردەکی بریتییە لە پرنسیپی کامیلبوونی فۆرم (ئایدۆس)، بەڵام هێزەکی بریتییە لە پرنسیپی ئەستوو (ماتەری)، لێرەدا جارێ ئەستوو نەفۆرماوە، نەبووە بە کردەکی.

کۆنسەرڤاتیڤ: پارێزەری بەها کۆنەکان کە وەک سروشتی نەشیاوی گۆڕان دایان دەنێت.

یونیڤێرسال: ئیدێ، تێگە، گشتێتی.

ئەستوو: مادە، ماتەری.

ئەریستۆکراتی: دەسەڵاتداریی دەوڵەمەندە بەگزادەییەکان.

ئیدێ: بوونەوەری هەمیشە هەبوو.

# لیبرالیزم:
# تاکگەرایی یان خود سەنتەری١

نووسینی: د. ئارەش نەراقی
و. لەفارسییەوە موسعەب ئەدهەم

-١-

زۆرێک لە رەخنەگرانی لیبرالیزم لە ناو ئەم قوتابخانەیەدا رەخنەیان دۆزیوەتەوە، ئەمەش لەو ڕووەوە کە لەسەر «تاکگەرایی» بونیاد نراوە. لە دیدی ئەم رەخنەگرانەوە «تاکگەرایی» لە رووی ئەخلاقیەوە بە لایەنی کەمەوە دوو کێشەی گرنگی هەیە:
یەکەم: ئەوەیە کە تاکگەرایی لەگەڵ رۆحیەتی «خۆشویستنی ئەویتر» و خۆبەخشیەوە کۆناکرێتەوە. واتە کەسی لیبراڵ لەو روەوە کە تاکگەرایە، «خود سەنتەر» و «خۆویست»ە.
دووەم: بریتیە لەوەی کە تاکگەرایی دواجار بە نادیدەنەگرتن و بە هەند وەرنەگرتنی «مافی گشتی» کۆتایی دێت. واتە لە چوار چێوەی گریمانەکانی دیدگای لیبراڵ

**لیبرالیزم لەم مانایەیدا بینا لەسەر جۆرێك «تاکگەرایی ئەخلاقی»یە، واتە تاکی لیبراڵ لە کۆتاییدا لە رووی ئەخلاقیەوە تاك بە گرنگ و و بەردی بینای جیهانی ئەخلاق دەژمێرێت، هاوڕا و بە پێی ئەم دیدگایە لە رووی ئەخلاقیەوە گرنگترین پەروای ئێمە دەبێت پاراستن و پارێزگاری لە تاکی مرۆیی و کەرامەت و رێزی خودی ئەو بێت**



ئارەش نەراقی

بە تەواوی «مافی تاکەکەسی» بە فەرمی دەناسرێت و چەمکی «مافی گشتی» مانایەکی ڕوون و شایەنی بەرگریکردنی نابێت.

ئامانجی من لەم نووسینەدا ئەوەیە کە ئەوە پیشان بدەم: یەکەم: لیبراڵیزم بە «خودسەنتەری ئەخلاقی» کۆتایی نایەت، و دووەم: دەتوانرێت دەرکێکمان لە «مافی گشتی» هەبێت کە لەگەڵ گریمانە بنەڕەتیەکانی لیبراڵیزم سازگار بێت.

لەم نووسینە دا مەبەستی من لە «لیبراڵیزم» زیاتر وپێش شتێکی تر ئەو دیدگایەیە کە هاوڕای ئەوە رۆڵی سەرەکی دەوڵەت بریتیە لە دابینکردن و زامنکردنی مافی بنەڕەتی سیاسی و مەدەنی تاکی کۆمەڵگەیە. ئەم مافە بنەڕەتیانە لە گوتەزای مافی تاکەکەسیەوە دەردەچن و هەندێک لە گرنگترین تایبەتمەندی و پێوەرەکانی بریتیە لە هەبوونی ئازادی ڕادەبڕین، مافی ئازادی بیروباوەڕ و مەزهەب، مافی ئازادی کۆبوونەوەکان، مافی بەشداری سیاسی کاریگەر، مافی دادگای عادیلانە و هەروەها مافە یەکسانی فرسەتەکان.

لیبرالیزم لەم مانایەیدا بینا لەسەر جۆرێک «تاکگەرایی ئەخلاقی»یە، واتە تاکی لیبراڵ لە کۆتاییدا لە رووی ئەخلاقیەوە تاک بە گرنگ و و بەردی بینای جیهانی ئەخلاق دەژمێرێت، هاوڕا و بە پێی ئەم دیدگایە لە رووی ئەخلاقیەوە گرنگترین پەروای ئێمە دەبێت پاراستن و پارێزگاری لە تاکی مرۆیی و کەرامەت و رێزی خودی ئەو بێت. لیبرالیزم وەکو پێویست لەگەڵ «تاکگەرایی میتافیزیکی یان وجودی» نزیکیەکی نیە، تاکگەرایی میتافیزیکی یان وجودی دیدگایەکە کە بە لایەنی کەمەوە بە یەکێک لەم دوو ئامۆژەیە قایلە:

شتێک بە ناونیشانی «گروپ» یان «کۆمەڵ» بوونی دەرەکی نیە، بەڵکو هەرچی هەیە، تاکە تاکەی مرۆڤەکانە کە لە کەناری یەکدا «گروپ» یان «کۆمەڵ» دروست دەکەن.

دەتوانین هەموو تایبەتمەندی و سیفەتەکانی «گـروپ» یان «کۆمەڵ»ێک بە تایبەتمەندی و سیفەتەکانی ئـەو تاکانەی کە ئـەو گروپە یان کۆمەڵەیان پێکهێناوە کەم بکەینەوە.
تاکی لیبراڵ لەو روەوە کە لیبراڵە پێویست ناکات کە «الف» یان «ب» بە گریمانەی راست دابنێت، پێویستی دیدگای ئەو بە تەواوی ئەوەیە کە «تاک» لە رووی ئەخلاقیەوە کانونی بنەڕەتی بکاتە جێگەی سەرنج و هەستیاری خۆی.

-٢-

بەڵام ئایا « تاکگەرایی ئەخلاقی « لیبرالیزم بە پێویست بە « خودگەرایی ئەخلاقی» کۆتایی دێت؟

لە وەڵامدا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، سەرەتا ئەوە باشە سەرنجی ئەوە بدەین کە «تاکگەرایی ئەخلاقی» و «خودگەرایی ئەخلاقی» دوو چەمکی لێکجیاوازن. تاکگەرایی ئەخلاقی بـەو جـۆرەی کە بینیمان، دیدگایەکە کە بە پێی ئەو دیدگایە، گرنگترین کانونی سەرنجدان و دوودڵی ئەخلاقی تاکی مرۆڤە، بەڵام خودگەرایی و خود سەنتەری ئەخلاقی دیدگایەکە کە بە پێی ئەو دیدگایە تاکی مرۆڤ وەزیفەیەکی ئەخلاقی زیاتری نیە و ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە بە دوای دابینکردنی سوودی تاکەکەسی خۆی بێت و هەوڵ بدات زۆرترین سوود مومکین وەدەست خۆی بخات. لەبەرئەوە پرسیاری سەرەکی ئەوەیە کە ئایا داننان بە «تاکگەرایی ئەخلاقی» مستلزم بنەڕەتی داننانە بە « خود گەرایی ئەخلاقی»یە.؟ لەو سنوورەی کە من وا دەزانم بە موتڵەقی پەیوەندی پێویست لە نێوان ئەم دوو چەمکەدا بوونی نیە و لە کرنگترین ریوایەتەکانی لیبرالیزم، تاکگەرایی ئەخلاقی، بنەمایەک بۆ نەفیکردنی خود سەنتەری ئەخلاقی دەربـڕاوە. لەبەرئەوە حەزدەکەم لێرەدا بەرگری لە دوو بانگەشەی خوارەوە بکەم:

یەکەم: خودگەرایی ئەخلاقی دیدگایەکی نادروست و هەڵەیە.

دووەم: تاکگەرایی ئەخلاقی گریمانەکراو لە لیبرالیزمدا دەتوانێت بە چاکی لەگەڵ رۆحـی خۆشویستنی ئەویتر سازگار بێت.

بەڵام بۆچی «خودگەرایی ئەخلاقی» دیدگایەکە شایەنی بەرگریکردن نیە؟

سەرەتا لەبەرئەوە «خودگەرایی ئەخلاقی» ناتوانێت بنەمای پەسەندی ژیری بۆ شیکارکردنی دژیەکی و پێچەوانەبوون لە نێوان سوودەکان پێشنیار بکات. بۆ نموونە گریمانەی ئەوە بکەن کە جەنابی «الف» و جەنابی «ب» هەردووکیان بونەتە هەڵبژێردراوی سەرۆکایەتی کۆمار و گریمانەی ئەوە بکەن کە سوود و بەرژەوەندی هەر یەکێکیان پێویست دەکات کە خۆی بە سەرۆک هەڵبژێردرێ. بەڵام هەڵبەتە تەنها یەکێک لەم دوو کەسە دەتوانێت لە هەڵبژاردنەکاندا سەربکەوێت.

لەبەرئەوە سەرکەوتنی جەنابی «الف» بە سودی ئەو و بە زیانی جەنابی «ب»یە و سەرکەوتنی جەنابی «ب» بە زیانی جەنابی «الف»ە و هەریەکێکیان دەبێت جۆرێک لە جۆرەکان ئەویتریان فەرامۆش بکەن. لەبەرئەوە بە پێ ی دیدگای «خودگەرایی ئەخلاقی» وەزیفەی ئەخلاقی ئەو ئەوەیە کە لە کاتی پێویستدا ئەمکارە بکات و ئەگەر ئەنجامی ئەمکارە بەو جۆرە نەبێت، ئەوا وەزیفە و ئەرکی

ئەخلاقی خۆی ژێر پێ خستوە و تووشی کارێکی ناپەسەند بووە، هاوشێوەی ئەم بەڵگەهێنانەوە بە سوودی جەنابی «ب» یش دەتوانین بخەینە روو.

بەڵام ئەم ئەنجامە هەڵە و ناڕاست دەردەکەوێت، ئـەخـلاقـێـک کـە لـە کـاتـی دژیـەکـی سـوود و بەرژەوەندییەکان، یەکێکیان سزا بدات و بەڵکو وا دەخوازێت کە لە کاتی بوونی بەرامبەر و رکابەر لەگەڵیدا بڕوات ، لەگەڵ بێ ئەخلاقیدا دووریەکی نیە .

دووەم ئـەوەی کە «خۆویستی و خودگەرایی ئەخلاقی» هەر بەو جۆرەی کە بینیمان لە نێوان «خود» و «ئەوانیتر»دا جیاکاری دەکات و پاشان سوودەکانی خۆی بەسەر سوود و بەرژەوەندییەکانی ئەوانیتردا پێش دەخات. بەڵام ئەم جیاکارییە تاکو چ رادەیەک و سنوورێک لە ڕووی ئەخلاقیەوە شایەنی بەرگریکردنە؟ هەر جۆرە جیاکارییەک لە نێوان مرۆڤەکان و پێشخستنی سوودی گرووپێک بەسەر گرووپێکی تردا لە کاتێکدا لە ڕووی ئەخلاقیەوە جێگەی سەرنجە و ئاراستەکراوە کە بە جۆرێکی دڵخوازانە و بە بێ بنەمای عەقڵی ئاراستەکراو رووینەدا بێت. بۆ نموونە: نەژادپەرستی لەو ڕووەوە کە لە ڕووی ئەخلاقیەوە ناڕەوایە کە مرۆڤەکان لەسەر بنەمای نەژاد یان یان رەنگی پێستیان لە یەکتری جیابوونەتەوە و لەسەر ئەو بنەمایە سوود و بەرژەوەندی نەژادێک بەسەر نەژادێکی تردا لە پێشتر بووە. بەڵام جیاکاری و جیاکردنەوەی ئەخلاقی لە نێوان مرۆڤەکاندا لەسەر بنەمای نەژاد یان رەنگی پێست، لە رووی عەقڵیەوە شایەنی بەرگریکردن نیە. بە روونکردنەوەیەکی تر وا پێدەچێت کە شهودی ئەخلاقی ئێمە ئەم بنەما ئەخلاقیەی خوارەوە قبوڵ دەکات ( با ناوی « بنەمای یەکسانی و بەرامبەری ئەخلاقی مرۆڤەکان» لێبنێین):

بنەمای یەکسانی ئەخلاقی مرۆڤەکان: دەبێت لەگەڵ مرۆڤەکاندا بە شێوەیەکی یەکسان ڕەفتار بکەین، مەگەر ئەوەی کە بتوانرێ ئەوە پیشان بدرێت لە نێوانیاندا جیاوازی واقیعی و لە ڕووی ئەخلاقیەوە پەیوەندی بوونی هەیە کە بەو ئیعتیبارە دەتوانرێت جیاوازی لەو ڕەفتارەدا ئاراستە بکرێت.

ئەوانەی قایلن بە «خودویستی سەنتەری ئەخلاقی یان خودسەنتەری ئەخلاقی» دەبێت ئەوە ڕوونبکەنەوە کە بینا لەسەر کام مەبنای عەقڵانی بەرگریلێکەر «بنەمای یەکسانی ئەخلاقی مرۆڤەکان» پێشێل دەکەن و سوودی «من» هەمیشە و لە ژێر هەر هەلومەرجێکدا لەسەر سوودی «ئەوانیتر» پێشتر دەخەن. لە کاتێکدا من وادەزانم هیچ بنەمایەکی عەقڵانی بەرگریلێکەر لەسەر لە پێشخستنێکی لەمجۆرە بوونی نیە. لە هەر حاڵێکدا بەرپرسیاریەتی بەڵگەهێنانەوە لێرەدا لەسەر شانی ئەوانەیە کە قایلن بە دیدگای «خـود سەنتەری ئەخلاقی». ئەگەر ئەوە قبوڵ بکەین کە لە پێشتر بوونی « رەها وهەمیشەیی» سوودەکانی «خود» بەسەر «ئەوانیتر»دا بنەمای عەقڵانی بەو جۆرەیان نیە کە شایەنی بەرگریکردن بن، ئەو کاتە ناچار دەبێت ئەوە بسەلمێنین کە «خود سەنتەری ئەخلاقی» پێشێلی « بنەمای بەرامبەری ئەخلاقی مرۆڤەکان»ە و لەگەڵیدا کۆ نابێتەوە.

بەڵام لە لایەکی تـرەوە « تاکگەرایی ئەخلاقی» بە تەواوی لەگەڵ « بنەمای بەرامبەری ئەخلاقی

مرۆڤەکان» سازگارە، واتە تاکی لیبراڵ دەتوانێت لە هەمانکاتدا کە تاکی مرۆیی دەکاتە جێگەی سەرنج و ڕوانگە و دەغدەغەی ئەخلاقی خۆی، بۆ تاک تاکی مرۆڤەکان بە بەهایەکی ئەخلاقی یەکسان قایل بێت و جیاوازی لە ڕەفتار لەگەڵ مرۆڤەکان تەنها لە کاتێکدا ڕێگە پێبدات کە بنەمای عەقڵی ئاراستەکەری بۆی هەبێت. پێش ئەوەی باس لە بانگەشەی دووەم بکەین بە تایبەت پەیوەندی « تاکگەرایی ئەخلاقی» و «خۆشویستنی ئەویتر»، حەزدەکەم جەخت لەسەر دوو خاڵ بکەمەوە:

یەکەم ئەوەیە کە دەبێت لە نێوان « ڕەفتارە خۆویستەکان» و « هەوڵدان بۆ دابینکردنی سوود و بەرژەوەندی تاکەکەسی» جیاکاری بکرێت. ناتوانین هەر جۆرە هەوڵێک بۆ بۆ دابینکردنی سوود و بەرژەوەندی تاکەکەسی سەلمێنەری ڕەفتاری خۆویستانە بزانین. بۆ نموونە: کاتێک کەمن بۆ دەرمانی نەخۆشی خۆم سەردانی پزیشک دەکەم، لە ڕاستیدا بۆ دابینکردنی سوودی خۆم هەوڵدەدەم. بەڵام دژوارە کە بتوانین ئەم کارە بە هەنگاوێکی «خۆویستانە» دا بنێین. ڕەفتاری من لە کاتێکدا «خۆویستانە»یە کە من لە ئەنجامی ئەودا سوود و بەرژوەندی ئەوانیتر « لە کاتێکدا کە ڕەچاوکردنی ئەو سوودانە لەسەر من فەرزن « بە هەند وەرنەگرم.

دووەم: بریتیە لەوەی کە هەبوونی پەروای خود و لە پێشتربوون و خەمی خود، بە پێویست بەو مانایە نیە کە تاک ناتوانێت پەروا و خەمی ئەوانیتری هەبێت. تاک دەتوانێت لە هەمان ئەوکاتەی کە بەدوای سوود و بەرژەوەندی خۆیەوەیەتی، ڕێز وحورمەت لە سوودی ئەوانی تریش بگرێت و بەهرەمەندی ئەوانی تریش لە کەناری بەهرەمەندی خۆیدا بە گرنگ و ڕێزدار بزانێت.

ئەمە ڕاستە کە لە هەندێک لە شتەکاندا لە نێوان سوودەکانی ئێمە و ئەوانیتردا دژیەکی ڕوودەدات و تاک دەبێت لەم نێوەندەدا یەکێکیان هەڵبژێرێت، بەڵام بەو جۆرە نیە کە ئێمە هەمیشە ناچار بین لە نێوان سوودەکان خۆمان و ئەوانیتردا یەکێکیان هەڵبژێرین. هەندێجار لە نێوان سوودەکانی ئێمە و ئەوانیتردا بەریەککەوتن بوونی نیە و تاک دەتوانێت لەسەرووی دابینکردنی سوودە تاکە کەسیەکانی خۆی هەوڵ بۆ دابینکردنی سوودی ئەوانی تریش بدات.

هەندێجاریش ئێمە دەتوانین سوودەکانی ئەوانیتر دابین بکەین، بە بێ ئەوەی کە ئەمکارە کاریگەری ئەرێنی یا نەرێنی لەسەر سوودە تاک کەسیەکانمان هەبێت. لە زۆرێک لە شتەکانیشدا ئێمە لەبەر خاتری بەرامبەرەکانمان سوودی ئەوانیتر دەخەینە پێش خۆمانەوە، بە تایبەت کاتێک کە «ئەوانیتر» دۆستان و ئەندامانی خێزانەکەمان بن.

بەڵام ئایا «تاکگەرایی ئەخلاقی» دەتوانێت لەگەڵ ڕۆحیەتی « خۆشویستنی ئەویتر» سازگار بێت؟

بەگومانی من لە چوارچێوەی گریمانەکانی لیبرالیزم، « تاکگەرایی ئەخلاقی» لەسەرووی «بنەمای یەکسانی و بەرامبەری ئەخلاقی مرۆڤەکان «دەتوانێت بنەمای پەسەندکردنی ژیرانە بۆ» خۆشویستنی ئەویتر» فەراهەم بکات. بە ڕوونکردنەوەیەکی تر، لە چوارچێوەی گریمانەکانی لیبرالیزم دەتوانین بۆ «خۆشویستنی ئەویتر» بەڵگە بەم شتانەی خوارەوە بهێنینەوە:

١-لە رووی « تاکگەرایی ئەخلاقی « نیاز و پێداویستیەکان، سوودەکان و بەرژەوەندییەکان تاکی مرۆیی لە گرنگی بنەڕەتی بەشدار و خاوەن شتن. لەبەرئەوە «من» بە ناونیشانی تاکێکی مرۆیی مافی ئەوەم هەیە کە بۆ دابینکردنی نیازەکان، مەبەستەکان، و بەرژەوەندییەکانی خۆمان هەوڵ بدەم ( مادەم کە دەستپێشخەرییەکانم زیانێکی نائاراستەکراوی نەخاتە سەر بەرامبەرەکانم.)

٢-هاوڕای « بنەمای یەکسانی ئەخلاقی مرۆڤەکان» دەبێت لەگەڵ هەموو مرۆڤەکان ( لەوانە «من» و «ئەوانیتر» ) بە یەکسانی رەفتار بکرێت مەگەر ئەوەی کە بەڵگەیەک پێچەوانەی ئەوە بوونی هەبێت. بە ڕوونکردنەوەیەکی تر، بە پێی ئەو بنەمایە بە شێوەیەکی گشتی لە نێوان «من» و « ئەوانیتر» جیاوازی واقیعی و لە رووی ئەخلاقیەوە پەیوەست بوونی نیە. ( مەگەر ئەوەی لە رووی ئەخلاقیەوە بسەلمێت.)

٣-لەبەرئەوە بە هەمان ئەندازە کە نیازەکان، سوودەکان و بەرژەوەندیە تاکەکسیەکانی «من» گرنگە. نیازەکان، سوودەکان و بەرژەوەندیەکانی «ئەوانیتر»یش دەبێت بە گرنگ دابنرێن ( بەو مەرجەی کە بەڵگەیەکی دیار و ئاراستەکراو پێچەوانەی ئەوە بوونی نەبێت.) بە روونکردنەوەیەکی تر بینا لەسەر هەمان ئەو بنەمایە کە «من» بۆ نیاز و مەبەست و سوود و بەرژەوەندییەکانی خۆم بە هەند بزانم و لە لام گرنگ بن، دەبێت نیاز و مەبەست و سوود و بەرژەوەندییەکانی «ئەوانی»تریش بە گرنگ بزانم ( مەگەر ئەوەی کە بەڵگەیەک دژی ئەوە بوو هەبێت).

**ئایا پێداویستی « تاکگەرایی ئەخلاقی» گریمانەکراو لە لیبرالیزمدا ئینکاری بوونی « مافی گشتی» یە؟ رەخنەرگرانی لیبراڵیزم بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەگەر ئامۆژەی « تاکگەرایی» مان قبوڵ بێت، ناچار دەبێت دان بەوا نێین کە رەسەنێتی لەگەڵ تاکدایە و بوونەوەرێك لە ژێر ناونیشانی « گشت» سەربەخۆ و لە پشت تاکەکانەوە بوونی نیە. لەبەرئەوە لە چوار چێوەی لیبراڵیزمدا ناتوانین « مافی گشتی» جگە لە تاکەکان بۆ شتیکی دیکەی بگێڕینەوە. لەبەرئەوە لێرەدا لە ڕێگەیەك زیاتر لەبەردەم تاکێکی لیبراڵدا کراوە نیە**

بۆ نموونە، مومکینە بپرسم کە لە چوار چێوەی گریمانەکانی لیبراڵیزم بۆچی من دەبێت پەروای برسیەکانم هەبێت و خۆم بە بەرپرسیار بزانم کە تاکو رادەی توانا یارمەتیان بدەم و بەرەو پیریان بڕۆم؟ بە گومانی لە چوارچێوەی گریمانەکانی لیبرالیزم تاک دەتوانێت وەڵام بداتەوە کە ئەگەر من خۆم برسی بووم، تاکو رادەیەک لە هەموو دەرگایەکم دەدا تاکو خۆراکێ□کم دەست بکەوێت. واتە لەو هەلومەرجانەدا باوەڕم وابوو کە پێویستنی و نیازی من بۆ خۆراک دەبێت بێتە دی و پێداویستسم پڕ ببێتەوە. بەڵام ئەگەر لە نێوان برسیەتی من و ئەوانیتردا جیاوازی بوونی هەبێت؟ ئایا برسیەتی بۆ ئەوانیتر رەنج و ئازارێکی کەمتر دروست دەکات؟ ئایا ئەوانیتر کەمتر لە من شایەنی ئەوەن کە لە ڕەنج و ئازاری برسیەتی رزگارییان ببێت؟

ئەگەر لە نێوان «من» و «ئەوان» هیچ جیاوازییەک لە ڕووی ئەخلاقیەوە پەیوەست بوونی نەبێت، لەوکاتەدا بینا لەسەر هەمان ئەو بنەمایەکە دەبێت پێداویستی من بۆ خۆراک نەمێنێت، دەبێت نیاز و پێداویستی ئەوانیش بهێنرێتە دی. بە روونکردنەوەیەکی تر بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە من شایەنی بەهرەمەندی لە مافی ژیان و گوزەرانم، ئەوانیتریش شایەنی بەهرەمەندین لەو مافە بۆ ژیان و گوزەران. هەروەها بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە لە کاتی برسیەتیدا ئەوانیتر لەسەر شانیان و ئەرکیانە یارمەتیم بدەن، لە کاتی برسیەتی ئەوانیتریشدا منیش وەزیفەی هاورکاریکردنی ئەوانم هەیە.

لەبەرئەوە لە چوارچێوەی لیبرلیزمدا، «تاکگەرایی ئەخلاقی» هاوڕای «بنەمای بەرامبەری ئەخلاقی مرۆڤەکان» دەتوانێت لە رووی ئەخلاقیەوە ئەوە لەسەر من پێویست بکات کە ئازار و رەنجی مرۆڤەکان تر بە هەند وەربگرم و بە گرنگی بزانم و لە ڕووی ئەخلاقیەوە ئەوە لەسەر پێویست بکات کە هەوڵ بۆ تیمارکردنی ئازارەکانی ئەوانیتر بدەم.

## -٣-

ئایا دەتوانرێت لە چوارچێوەی گریمانە بنەڕەتیەکانی لیبرالیزم، چەمکی «مافی گشتی» بە فەرمی بناسین؟

زۆر چاکە سەرەتا دەرکی خۆم لە چەمکی « مافی گشتی «روونبکەمەوە. گرنگترین رووی لێکچووی « مافی تاکەکەسی» و «مافی گشتی « ئەوەیە کە مافی تاکەکەسی تایبەت بە تاکەوە وتاک بە شێوەیەکی گشتی دەتوانێت سەربەخۆ لەو مافە بەهرەمەند ببێت. بەڵام مافی تاکەکەسی، نەک تایبەت بە تاکەوە، بەڵکو بۆ کۆمەڵێک تاک دەگەڕێتەوە و تەنها بە شێوەیەکی گشتی و کۆیی یان بە لایەنی کەمەوە بە نوێنەرایەتی کۆمەڵ جێبەجێ دەکرێت.

لە ڕوویەکی دیکەوە مافی گشتی وکۆیی بڕیارە سوود یان بەرژەوەندی گشتی دابین بکات. واتە سوود یان بەرژەوەندی ئەگەر دابین بکرێت و دەستەبەر بکرێت، ئەوە بۆ هەموو یان زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵ دەگوازرێتەوە و پێیان دەگات. بۆ نموونە: مافی موڵکایەتی خەڵکی لەمەڕ خەزێنە نەوتیەکان لە ریزی « مافی گشتی» ئەواندایە. واتە هیچ تاکێک بە تەنیایی ناتوانێت لەم مافە بەهرەمەند بێت. هیچ تاکێک یان هیچ گروپێک ناتوانێت بەکارهێنان لەم

سەرمایە نەتەوەییەدا بکات و بەکاری بهێنێت. مەگەر ئەو کاتەی کە نوێنەری واقیعی خەڵکی بۆ خۆی دەستەبەر کردبێت. هەڵبەتە کاتێک کە مافی خەڵکی لەمەڕ ئەم سەرمایە نەتەوەییەدا نەفەوتێت و بدرێت، گریمانە لەسەر ئەوەیە کە هەمووان یان زۆرینەی خەڵکی لێی بەهرەمەند دەبن.

ئایا پێداویستی « تاکگەرایی ئەخلاقی» گریمانەکراو لە لیبرالیزمدا ئینکاری بوونی « مافی گشتی» یە؟ ڕەخنەرگرانی لیبراڵیزم بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەگەر ئامۆژەی « تاکگەرایی» مان قبوڵ بێت، ناچار دەبێت دان بەوا نێین کە ڕەسەنێتی لەگەڵ تاکدایە و بوونەوەرێک لە ژێر ناونیشانی « گشت» سەربەخۆ و لە پشت تاکەکانەوە بوونی نیە. لەبەرئەوە لە چوار چێوەی لیبراڵیزمدا ناتوانین « مافی گشتی» جگە لە تاکەکان بۆ شتیکی دیکەی بگێڕینەوە. لەبەرئەوە لێرەدا لە ڕێگەیەک زیاتر لەبەردەم تاکێکی لیبراڵدا کراوە نیە.

الف- دەبێت لە کۆتاییدا مافی گشتی بۆ کۆمەڵێک لە مافی تاکەکەسی کورت بکرێتەوە.

ب -دەبێت ئینکاری لە بوونی « مافی گشتی» بکات.

ج- دەبێت لیبراڵیزم بخاتە لاوە و فەرامۆشی بکات. لە بۆچوون و ڕوانینی ئەم ڕەخنەگرانە، ئینکاری بوونی «مافی گشتی» و هەروەها کەمکردنەوەیان بۆ کۆمەڵێک لە مافی تاکەکەسی مومکین نیە و لەبەرئەوە دەبێت بوونی « مافی گشتی « بە پێشێلکەری ئیعتیباری لیبرالیزم دەرببرین. بهێڵن گریمانەی ئەوە بکەین کە ماف و ڕاستی لای ئەم ڕەخنەگرانەیە کە بوونی مافی گشتی ئینکاری ناکرێت و هەروەها ناتوانین ئەم مافەش بۆ کۆمەڵێک مافی تاکەکەسی کورت بکەینەوە ( واتە گریمانەی ئەوە بکەین کە بەڵگەی ئەمان لەم دوو شتەدا هەرچی هەیە، دانپێدانراوە). بەڵام ئایا ئەم دان پێدانانەی ئەم دوو بانگەشەیە بە پێویست نەفی لیبرالیزم دەکەن؟ بە گومانی وەڵام نەرێیە.

بەڵگەی یەکەم ئەوەیە کە ئەم بەڵگەیە تەنها لە کاتێکدا دەگاتە ئەنجام و دەرەنجامێکی دەبێت کە» تاکگەرایی « گریمانەکراو لە لیبراڵیزمدا بە جۆرێک لە « تاکگەرایی میتافیزیکی یان بوونگەرایی» بزانین، نەک « تاکگەرایی ئەخلاقی». هەر بەو جۆرەی کە پێشتر ئاماژەم کرد، « تاکگەرایی میتافیزیکی یان بوونگەرایی» بە گریمانەی بوونەوەرێک بەناوی « گشت «، سەربەخۆ و لە پشت تاکەکان، ناسازگارە. بەڵام « تاکگەرایی ئەخلاقی « بە پێویست بە پێشگریمانەیەکی میتافیزیکی پاپەند نیە و پێداویستی لیبراڵیزمیش بە تەواوی سەلماندنی « تاکگەرایی ئەخلاقی «یە، نەک « تاگەرایی میتافیزیکی یان بوونگەرایی».

بەڵگەی دووەم، بەڵام گرنگترە، وا پێدەچێت کە پێشگریمانەی ئەو ڕەخنەگرانە ئەمە بووە کە:

یەکەم: مافی تاکەکەسی دەتوانرێت بە شێوەیەکی « تاکگەرایانە « ئاراستە بکرێت، واتە ئەم مافە تەنها لە کاتێکدا ئاراستەکراوە کە سوود یان بەرژەوەندی تاکەکەسی دابین بکات.

دووەم: « تاکگەرایی» ناتوانێت بوونی مافی گشتی و کۆیی بە شێوەیەکی سازگار بە فەرمی بناسێت، بە ڕونکردنەوەیەکی تر، ناتوانرێت مافی گشتی بە شێوەیەکی تاکگەرایانە ئاراستە بکرێت.

ئەم دوو پێشگریمانەیە هەردووکیان وا پێدەچێت ناڕاست بن، چونکە:

یەکەم، ئەوەیە کە زۆرێـک لە مافە تاکەکەسیە گرنگەکان دەتوانین بە شێوەیەکی « نا تاکگەرایانە « ش ئاراستە بکرێن، بۆ نموونە، مافی ئازادی رادەربڕین لەبەرچاو بگرن، راستە کە هێنانەدی ئەم مافە دەتوانێت سوود و بەرژەوەندی تاکەکەسی ئەندامانی کۆمەڵگە دابین و زامـن بکات، بەڵام لەسەرووی ئەمەشەوە رەچاوکردنی ئەم مافە دەتوانێت سوود و بەرژەوەندییەکانی ئەو گروپانەش کە لە دەوری بەها هاوبەشەکان کۆبوونەتەوە، بپارێزێت.

لە رووی مێژووییەوە، دابینکردن و زامنکردنی مافی بنەڕەتی سیاسی و مەدەنی بە مانەوە و درێژەدانی گروپەکان و کۆمەڵە گەلێک کۆتایی هاتووە کە لە کەمینەدا بوون یان لە بنەوەی هەرەمی دەسەڵاتی کۆمەڵگەی سیاسیدا بوون. لەبەرئەوە بە تەواوی دەتوانرێت مافی ئازادی ڕا دەربڕین لەسەر مەبنای ئەو خزمەتەی کە بۆ دابینکردن و زامنکردنی ئەو گروپانە ( لەو روەوەی کە کۆمەڵ و گروپن ) دەکات، ئاراستە بکرێت. لەبەرئەوە لیبراڵیزم تەنانەت لەمەڕ مافی تاکەکەسیشدا پێویست نیە پابەندی ئاراستە و رێنمایی «تاکگەراکان» یش بێت، چ بگات بەو شتانەی لە بارەی مافی گشتییەوەن.

دووەم ئەوەیە کە دەتوانین مافی گشتی بە شێوەی تاکگەرایانەش ئاراستە بکرێت. بۆ نموونە، نەتەوە جیاوازەکان مافی ئەوەیان هەیە کە فەرهەنگی تایبەتی خۆیان بپارێزن، مافی نەتەوەیەک لەمەڕ پاراستنی فەرهەنگی تایبەتی خۆی لە مافە گشتیەکانە. بەڵام پاراستنی فەرهەنگێک بە تایبەت بە هۆی گرنگی و ئەو بەهایەی کە ئەو فەرهەنگە بۆ تاکە تاکەی ئەندامانی هەیەتی، گرنگ و بەهادارە.

لـەبـەرئـەوە، دەتوانین مافی نەتەوەیەک لەمەڕ پاراستنی فەرهەنگی خۆی لەسەر بنەمای ئەو رۆڵە گرنگەی کەئەو فەرهەنگە لە ژیانی تاکەکەسی ئەندامانی ئەو نەتەوەیە دەیگێڕێت، ئاراستە بکرێت. بە روونکردنەوەیەکی تر هیچ یەک لە پایە بنەڕەتیەکانی لیبرالیزم توانای ئاراستەکردنی تاکگەرایانەی مافی گشتی نامومکین ناکات.

لەبەرئەوە تاکی لیبراڵ لەو روەوە کە لیبراڵە، بەشێوەیەکی گشتی دەتوانێت لە هەمان ئەو کاتەی کە بە « تاکگەرایی ئەخلاقی» قایلە، « مافی تاکە کەسی لەسەر بنەمای تێبینی گشتی یان « مافی گشتی و کۆیی» لەسەر بنەمای تێبینی تاکەکەسی ئاراستە بکات. لەبەرئەوە تاکی لیبراڵ بە شێوەیەکی گشتی دەتوانێت بە بێ ئەوەی کە ئینکاری بوونی مافی گشتی بکات، یاخود لە کۆتاییدا بۆ کۆمەڵێک مافی تاکەکەسی کەم بکاتەوە، ئەو مافە لەسەر بنەمای تێبینیە تاکە کەسیەکان ئاراستە بکات. « تاکگەرایی ئەخلاقی « گریمانە کراو لە لیبراڵیزمدا بە تەواوی لەمەڕ ئەم توانایە کراوە و والایە.

-٤-

دەرەنجام و بەرهەمی ئەوەی کە ئەگەر بەڵگەکانی ئەم نووسینە موعتەبەر و ددانپێدانراو بن، ناچار دەبێت ئەوە قبوڵ بکەین کە تاکگەرایی ئەخلاقی گریمانەکراو لە لیبراڵیزمیشدا بە رۆحیەتی «خۆشویستنی ئەویتر» سازگارە و هەم بە شێوەیەکی گشتی و بە پێی بنەماکان دەتوانێت «مافی گشتی» بە فەرمی بناسێت.

سەرچاوە: سایتی فەرمی « دکتۆر ئارەش نەراقی»

# دیموکراسی
# کەڵکەڵە قوڵەکەی هابرماس

نووسـنی: بەهرام مەحیی
و. لە فارسییەوە: کاوە کەریمی

بەباوەڕی هابرماس ناکرێ حاشا لەمە بکرێت کە ئێمە بــەردەوام بینەری دەرکەوتنی شەڕانگێرزیو توندوتیژین. بەڵام شەڕانگێزی دەرکەوتەیەکی درۆزنانەی پەیوەندیە مرۆییەکانە، نەک نـاوەرۆکو ناواخنی ڕاستەقینەی. ناسینەوەی قووڵی هـزری مـرۆڤ دەتوانێت ئەم دەرکەوتە درۆزنانەیە دەربخاتو لانیکەم ڕێوشوێنی لەبار بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیانەی جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان ببینێتەوە، تا لەم ڕێگایەوە چارەسەرکردنی شەڕانگێزانەی ناکۆکییەکان کۆتایی پێبێت.

**یورگین هابرماس پاش تێزی دوکتۆراکەی لەسەر فەلسەفەی "شیلێنگ"، دەستی دایە نووسینی وتاری کولتوری- کۆمەڵایەتیو فەلسەفی- سیاسیو کۆمەڵێك نووسراو بەمەستی ناساندنی فەیلسووفگەلێکی وەك "یاسپێرس"، "هایدیگێر"و "بلۆخ". بەڵام پاش بڵاوبوونەوەی تێزە مامۆستاییەکەی بوو لەژێرناوی "گۆڕانکاریی بنەڕەتیی بواری گشتی"، کە بەردی بناغەی ناوبانگە زانستیەکەی دانرا**



هابرماس

بێگومان یورگن هابرماس ئێستا ناسراوترینو دەرکەوتووترین فەیلەسووفی کۆمەڵایەتی ئەڵمانیایە. هابرماس کە لە نـەوەی دووەمـی «قوتابخانەی فرانکفۆرت» (١)ە، لەو میراتگرە دەگمانەنەیە کە درێـژەی بە نەریتی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەم قوتابخانەیە دا لە دوای نـەوەی یەکەمەوە و لە پەیوەندیدا بە «تیورەی رەخنەگرانەوە« . هابرماس لەساڵی ١٩٢٩ لە شاری دۆسلدۆرف لەدایکبوو. لە تەمەنی بیست ساڵیدا دەستیکرد بە خوێندن لە بواری فەلسەفەو دەروونناسیو ئەدەبی ئەڵمانی، لە زانکۆکانی گوتینگێنو زوریخو بۆن. لەساڵی ١٩٥٤ەوە وەک مامۆستا لە زانکۆی هایدێلبێرگ دەستیکرد بە وتنەوەی فەلسەفە. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧١ بۆ ١٩٨٢ وەک سەرۆکی ئەنێستیتۆی ماکس پلانک سەرقاڵی توێژینەوە لەبواری کاریگەریی زانستو زانیاریی بووە بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا. لە ساڵی ١٩٨٣وە بۆ جارێکی ترو ئەمجار فەلسەفەی لە زانکۆی فرانکفۆرتدا وتۆتەوە.

هابرماس تائێستا چەندین خەڵاتی زانستیو فەلسەفی وەک خەڵاتی هێگڵ، خەڵاتی فرۆیدو خەڵاتی ئادۆرنۆی وەرگرتوە. ناوبانگی جیهانیی هابرماس دەرەنجامی ساڵانێک مامۆستایی فەخرییە لە زانکۆ بەناوبانگە ئەمریکییەکان، وەک زانکۆی هارڤارد. زۆرێک لە بەرهەمو نووسراوەکانی وەرگێڕدراونەتەوە سەر زمانە بیانییەکان وەک ئینگلیزیو فەڕەنسیو زمانە گرینگەکانی تری جیهانو کاریگەریی بیرۆکەکانی بەسەر فەلسەفەی هاوچەرخو بەتایبەت لە ئەمەریکا، لەم ساڵانەی دواییدا حاشاهەڵنەگرەو بەردەوام لە پەرەسەندندا بووە.

زمانی فەلسەفیی هابرماس، هـەر وەک نەریتی فەیلسووفە ئەڵمانییەکان ئاڵۆزە. لیرەوە بۆ ناساندنی بیرکردنەوەکانی کتێبو وتارێکی زۆر لە چاپدراوە کە تێگەیشتن لـە جـەوهـەری بیرکردنەوەکانی ئاسانتر دەکات. لەم ئاراستەیەدا دەکرێت ئاماژە بە بەرهەمەکانی «ئاکسێل هۆنت» (٢)و «تامس مـەکـکـارتـی» (٣) بکرێت. گرینگترین کتێبو

وتارەکانی یورگن هابرماس برێتین لە: «گۆڕانی بونیادی بواری گشتی» (٤)، «ناسینو ویستن» (٥)، «لەبارەی لۆژیکی زانستە کۆمەڵایەتیەکان» (٦)، «سیاسەت، هونەر، دین» (٧)، «تیۆری کرداری پێوەندیگرتن» (٨)و «داهاتووی سروشتی مرۆیی» (٩). لەم وتارەدا جگە لە ڕوانینێک بۆ فەلسەفەی سیاسیو کۆمەڵایەتیی یورگن هابرماس، ئاوڕێکیش لە تیۆرییەکانی کرداری پێوەندیگرتنو پەرەسەندنی دەداتەوە.

## فەلسەفەی سیاسی

یۆرگن هابرماس پاش نامەی دوکتۆراکەی لەسەر فەلسەفەی «شیلێنگ»، دەستی دایە نووسینی وتاری کولتوری- کۆمەڵایەتیو فەلسەفی- سیاسیو کۆمەڵێک نووسین بەمەستی ناساندنی فەیلسووفگەلێکی وەک «یاسپێرس»، «هایدیگێر»و «بلۆخ». بەڵام ناوبانگی زانستی هابرماس ئەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبەنەوەی نامەی مامۆستاییەکەی لەژێرناوی «گۆڕانی بونیادی بواری گشتی»دا.

هابرماس لەم وتارەدا، بەوردی لێکۆڵینەوەی لەسەر ئاراستەی سیاسیو شێوازی پێکهاتنی ڕای گشتی، لە یەکەمین قۆناغەکانی دیموکراسی بۆرژوایی تا پێکهاتنی دەوڵەتە مۆدێرنەکانی ئەمڕۆی کردووە. هەڵسەنگاندی ئەو لەم بابەتەدا، بەگشتی ڕەشبینانەیە. هابرماس باس لەوە دەکات کە بە چ ساناییو خێراییەک دەکرێت ڕای گشتی لە بواری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو بەڕێوەبەرێتیی سیاسیدا بخرێتە ژێر کاریگەریی ئاراستەیەکی دایاریکراو و ناوەرۆکە مەعنەویەکەی پوچەڵ بکرێتەوە. لەم وتارەدا تەوەرەت سەرەکی بیرکردنەوەی هابرماس بریتییە لە پێوەندیی دوولایەنەی نێوان دەوڵەتو هاوڵاتیانی کۆمەڵگا. بەباوەڕی هابرماس سەرەتا پێداویستیی گەشەی بازرگانی هاوکاتە لەگەڵ گەشەکردنی خێرای بۆرژوازیو پتەوبوونی ئەو پەیوەندیانەی لەسەر بناغەت هاوڵاتی بونن. پرۆسەیەکی لەو چەشنە پێویستیی بازرگانەکان بۆ زانیاری گەرما و گەرم زیاد ئەکات. ئەم حاڵەتە خەسلەتی تایبەتیی زانیارییەکان لەناودەباتو لە ئاستێکی بەربڵاودا دەیباتە ناو بواری گشتییەوە. بەمشێوەیە زانیارییەکانی ناو کۆمەڵگا لەڕێگەی گەشەی بازرگانیو پیشەسازییەوە خەسڵەتێکی گشتی وەر ئەگرن. ئەم ڕەوتە بە دەستێوەردانی روو لە زیادبونی دەوڵەت لە بابەتە بازرگانییەکاندا بەهێز دەبێت، چونکە دەوڵەت ناچارە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیو ئابووریەکان، نەک هەر بەردەوام ڕێساکانی باجدان، بەڵکوو کۆمەڵێک یاسای نوێو ئاڵۆزیش دابڕێژێت. هابرماس پێی وایە لە دەرەنجامی ئەم پرۆسەیەدا عەقڵانیەتی هاوڵاتیان دروست ئەبێتو دەیانکاتە «بینەرانی ژیرو عاقڵ» کە ڕەوایەتی یاسا دانراوەکان ئەخەنە بەر باس و لێکدانەوە و لە حاڵەتی پێویستیشدا دژایەتی ئەکەن. خەڵک چاوەڕوانییان لە دەوڵەت ئەوەیە کە پاساو بۆ یاساکان و هەنگاوەکانی خۆی بهێنێتەوە. خەڵک لە ڕێگە عەقڵانییەوە داکۆکی لەسەر مافەکانیان دەکەنو ئەمەش بە مانای ئەوەیە کە حوکمڕانانیش چیتر ناتوانن تەنها ئەو کردەوانە بنوێنن کە بە بیانووی «پاراستنی ئاسایش»، (بارودۆخ) بەرتەسک دەکاتو دادەخات، بەڵکوو دەبێ بە پشت بەستن بە بەڵگاندن هاوڵاتیان قانع بکات. حوکمڕانان تەنها لەم ڕێگەیەوەیە دەتوانن شەرعیەتی دەسەڵاتو پاوانکردنی توندوتیژیان مسۆگەر بکەن. بەباوەڕی هابرماس لە دیموکراسییە بۆرژواییەکاندا، ئەرکێکی لەم چەشنە بەشێوەی بەردەوام لەلایەن حوکمڕانانەوە ناشیرینو خاڵی لە واتا دەکرێت.

چونکە سیستەمی سیاسی بەوشێوەیەی کە پێویستە و ئەبێ، کۆبوونەوەیەک نییە بۆ باسە عەقڵانییەکان بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشە سیاسییەکان، بەڵکو تەنها دەبێتە ڕوخساری حزبەکان کە سیاسەت دادەبەزێنێت بۆ جۆرێک لە «سیرکی هەڵبژاردن»؛ سیرکێک کە گرنگترین ئەرکی ئەوەیە کە خەڵک حزبێک بە پێی بەرنامەیەکی تا دەکرێ ناروون و قابیلی راڤەکردن هەڵبژێرن. بەڵام ماوەیەکی زۆرە لایەنگری خەڵک بۆ ئەم یان ئەو حیزب، خەسڵەتێکی هەستەکیی (ئیحساسی) بەخۆوە گرتووەو زیاتر ئاشکراکەری شوناسی تاکەکەسیە، تا هەڵبژاردنێکی عاقڵانەی سیاسی. دیارە هابرماس جەخت لەوە ئەکات سیستێمێکی لەو جۆرە تا ئەوکاتە کاردەکاتو لەسەرپێیە، کە دەوڵەت بتوانێت لەڕێگەی باشترکردنی بارودۆخی ئابووری ژیانی خەڵک شەرعیەتی هەبوونی خۆی بچەسپێنێتو لەڕاستیدا لەڕوخساری «دەوڵەتی دابینکەر»دا دەربکەوێت. بەمشێوەیە رۆحیەتی مەسرەفکردن لای هاوڵاتیان، جێگەی بەشداریی سیاسی دەگرێتەوە. بەڵام ئەگەر دەوڵەت ڕۆڵی خۆی کورتکاتەوە بۆ دابینکردنی پیداویستەکانی کۆمەڵگا، ئەوا ئەو ئەگەرە لەدەست دەدات کە بڕیارەکانی بەشێوەی عەقڵانی بخاتە بەرباسو تاوتوێکردن. لە سەردەمی قەیرانە ئابوورییەکاندا، بارودۆخی خراپی دەوڵـەت بـەتـەواوی دەردەکـەوێـتو ئەم ئاڵۆزییە تووشی حزبە سیاسییە جەماوەرییەکانیش دەبێت. بە گشتی قەیرانی ئابووری زوربەی جار هاوکاتە هاوکاتە لەگەڵ قەیرانی رەوایەتی حزبە سیاسیەکانو بەشێوەی سەرەکی، دەوڵەت. دەوڵەتێک کە بەردەوام لە پێش چاوی هاوڵاتیان خۆی وەک ناوەندێکی ڕێکخستنی بـڕیـارە عەقڵانییەکان نیشانداوە، ئەگەر نەتوانێت قەیران کۆنترۆڵ بکات، هەبوونی دەکەوێتە مەترسییەوە. لە ناو هاوڵاتییاندا هەستی دورەپەرێزی لە سیاسەتو بێ متمانەیە تێکدەرانە بەرامبەر دەوڵەتو حزبە سیاسییەکان دروستدەبێت. مەترسییەکانی ئەم کەشو هەوایە بەتەواوی پێشبینی ناکرێت، بەڵام هەستی دورە پەرێزی لە سیاسەتی خەڵک، ڕێگا بۆ زاڵبوونی بیرکردنەوە ناعەقڵانییەکان لە کۆمەڵگادادەکاتەوەو ئەژدیهای دیکتاتۆرىو تۆتالیرایزم لە ئاسۆی سیاسیدا دەردەکـەوێـت. لە نووسینە سەرەتاییەکانی هابرماسدا، هۆکاری سەرەکیی کێشەیەکی لەوچەشنە، لە چوارچێوەی بەرهەمهێنانەوەی ئابووریدا تەفسیر ئەکرێت، بەڵام لە بەرهەمەکانی دواتریدا، لێکدانەوەی بۆ کێشەیەکی لەوجۆرە زۆر ئاڵۆزتر ئەبێت. بەمحاڵەوە خاڵێک بەردەوام لە شیکارییەکانی هابرماسدا وەکوو خاڵی ناوەندی دەمێنێتەوەو ئەوەش قەیرانی وەفـاداری هاوڵاتییانە بە دەوڵەت کە سەر ئەکێشێت بۆ قەیرانی پاڵنەر بۆ بەشداریی سیاسیی هاوڵاتییان. لەم ڕووەوە شەرعیەت یا نەبوونی شەرعیەتی دەوڵەت، بەشێوەی بەردەوام بەستراوە بە پشتیوانیکردن یا نەکردنی هاوڵاتیانەوە. دەوڵەت دەبێ بۆ سووربوون لەسەر شەرعیەتی خۆی، بڕیاردانو یاساکان بخاتە بەردیدی لێکدانەوەی ڕای گشتیەوە.

یۆرگن هابرماس لە فەلسەفەی سیاسیی خۆیدا، خوازیاری پاراستنی دەسکەوتەکانی فەسلەفەی ڕۆشنگەرییە. هابرماس پێیوایە بەسیاسی کردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، واتە ئەو شتەی کە کارل مارکس بەبێ توندبونی ململانێی چینایەتی بە وەهمی دەزانی، بە نوێکردنەوەی گوتاری عەقڵانی لە کۆمەڵگادا دەکرێت. بەڵام هاوکات پێداگریی لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پرۆسەیەکی لەوجۆرە تایبەتمەندییەکی ئایدیالی هەیەو هەرگیز بەتەواوی نایەتە دی، بەڵکو دەبێ لە ڕەوتێکی بـەردەوام، تێروتەسەلتر، قووڵترو بەربڵاوتردا دروست بکرێت.

بۆیە بابەتێکی لەوچەشنە وەک بۆچوونێکی ئایدیالە کە دەبێ کردارو ئەندێشەی سیاسیمان دیاری بکات. بەرفراوانتر لەوە، دەکرێت واقیعی ئێستا بە بەراورد لەگەڵ ئەم ئایدیالەدا هەڵبسەنگێندرێتو بڕیار درێت کە بـارودۆخـی ئەمڕۆی ئێمە، تا چ ڕادەیــەک لە ئایدیالەکانی سیستێمە دیموکراتیکەکانەوە دوورە.

## فەلسـەفەی کـۆمـەڵایـەتـی

یۆرگن هابرماس پاش بڵاوکردنەوەی وتاری «گۆڕانی بونیادی بـواری گشتی»، دەستی دایە نووسینی کۆمەڵە وتارێکی فەلسەفی کە دواتـر لەژێرناوی «تیۆریو کردار»دا (١٠) بڵاوبووەوە. لەم وتارانەدا هەوڵ دەدات ئەو بابەتە بسەلمێنێت کە بارودۆخی سیاسیو ڕەنگدانەوەی کۆمەڵایەتیی زانستەکان لە کۆمەڵگا ئەمڕۆییەکاندا، تا ڕادەیەکی زۆر لەژێر کاریگەریی نەریتە دیارە فەلسەفییەکاندایە. ئەم هەوڵە هـاوکـات ئـەو شتەش لە خۆدەگرێت کە دەیسەلمێنێت بانگەشە سیاسیو فەلسەفییەکان لە چ ئاستێکدا هاتوونەتە دی، یا دەبێ بێنە دی. هابرماس لەم وتارانەدا، نەک تەنها کاریگەریی هێگڵو مارکس لەسەر سیاسەتو ئابووری لێکدەداتەوە، بەڵکو تیشکیش دەخاتە سەر نەریتی پۆزیتیویستەکانو پراگماتیستەکانو فەلسەفەی دیلیتی (١١)ش، کە دوای جەنگی دووەمی جیهانی تا ئاستێکی بەرچاو لە بیرچووبووە. بیرۆکەی سەرەتایی ئەم نووسینانە، دواتر بەشێوەی داڕێژراو لە کتێبی «زانینو ویستن»دا ڕەنگی دایــەوە، کە تێیدا هابرماس تێزێکی بەم ناوەڕۆکەوە پێشکەش کردووە کە ڕەخنەی مەعریفە تەنها وەکـوو تیۆرییەکی کۆمەڵایەتی دەتوانێت بوونی هەبێت. لە نووسینەکانی دوایـیـدا وەک «لەبارەی لۆژیکی زانستە کۆمەڵایەتیەکان»ەوە، هابرماس بۆجارێکیتر وێنەیەک لە کاریگەری دوولایەنەی تیۆرییە کلاسیکەکانی پەرەسەندنی سیاسیوکارکردنی زانستە مۆدێرنە کۆمەڵایەتی، تەکنیکیو فەلسەفییەکانی بەدەستەوەداوە.

واتای سەرەکیی ئەم نووسینانە کە ڕەنگدانەوەی هەڵوێست گرتنی تیۆری هابرماسە، فەلسەفەی مێژووە لە ڕوانگەی کـردەوەیـیـەوە. پێشمەرجی بابەتێکی لەو چەشنە، نۆژەنکردنەوەی مێژووی کولتووری، ئابووری، سیاسیو زانستییە. بابەتێکی وا دەبـێ سەلمێنەری ئـەوە بێت کە ڕێگەچارەی ئاشتیانەو دوور لە توندوتیژیی لە پێکدادانە سیاسیو ئابوورییەکاندا، چ دەستکەوتێکی مەعنەوی گرنگی بۆ مرۆڤ هەیە. لە ناوەندی ئەم نۆژەنکردنەوەیەدا، چەمکی دیاریکەری «عەقڵانیەت» ئامادەیە. ئەم چەمکە لای هابرماس واتایەکی چەندلایەنەی هەیەو لە پێداچوونەوە بەسەر هەڵسەنگاندنەکانی مرۆڤ لەسەر ڕووداوەکانی ڕابـردوو، تا لێکدانەوەی شەرعیەتی کردارو نۆرمەکانو هەروەها ئەگەری تاقیکردنەوەی پەیڕەوکردنی نۆرمەکان، تا تێگەیشتنی ئەزموونە زیندووەکان لە خۆدەگرێت.

لە یەکێک لە لوتکە گرنگەکانی کتێبی «زانینو ویستن»دایە کە یۆرگن هابرماس ڕەخنەی بنەڕەتیی خۆی لە کارل مارکسو فەلسەفە کۆمەڵایەتییەکەی دادەڕێژێت. ڕەخنەی هابرماس لە مارکس ئەوەیە کـە مـارکـس لـەنـێـوان شـێـوازێـک کـە مرۆڤەکان پەیوەندیان لەگەڵ سروشتدا ڕێکدەخەنو شێوەیەک کە پـەیوەندەیە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان خۆیان ڕێکدەخەن، جیاوازییەکی دانەناوە. بەواتایەکی تر، مارکس لەسەر ئەم بنەمایە ڕێدەکات، کە ناسینی مرۆڤ بۆ ڕەوتە سروشتیەکان جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ناسینی مرۆڤ بۆ سەر ڕەوتە کۆمەڵایەتیەکان نییەو ئەمە لە ڕوانگەی هابرماسەوە هەڵەیەکی قورسە، چونکە ئەو پێی وایە جۆری هەڵسوکەوتی

مرۆڤەکان لە پێوەندیی لەگەڵ سروشتدا، لە بنەڕەتەوە جیاوازە لەگەڵ جۆری هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکتر. بەباوەڕی هابرماس مرۆڤەکان لە کاتێکدا کە پاڵپشتیان هێزی عەقڵ بێت دەتوانن جیاوازییەکانیان دوور لە بەکارهێنانی زەبروزەنگو توندوتیژیو لە سەر بنەمای هەڵسەنگاندنو لۆژیک چارەسەر بکەن، چونکە لە پێوەندیەکانی نێوانیاندا پیداویستیەکی تەواویان بە پاساوهێنانەوە بۆ ئەو ئامانجانە هەیە کە مەبەستیانە و ئەمەس لە ڕووووی چۆنایەتەوە جیاوازە لە پێوەندیەکانی نێوان مرۆڤو سروشت. بەباوەڕی هابرماس، ئەم ڕاستیە کە مارکس جیاوازیەک لەنێوان کار (وەکو پرۆسەی زاڵبوون بەسەر سروشتدا)و پێوەندیی نێوان مرۆڤەکاندا دانانێت، دەبێتە هۆی ئەوەی کە مارکس چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی پەیوەندیان بە ڕێنماییو دابەشکردنی سامان لە کۆمەڵگادا هەیە لەسەر بنەمای عەقلانیەت پێ بابەتێکی مەحاڵ بێت. مارکس ناکۆکبوونی بەرژەوەندیەکان بە پێشمەرج دادەنێت، بۆ ئەوەی لەڕێیەوە هەر چەشنە ڕێکخستنێکی سیستێماتیک بۆ چارەسەرکردنی کێشمەکێشەکان، وەک شاردنەوەی پەیوەندیە نادادپەروەرەکان بە قازانجی سەرمایەداران نیشان بدات. مارکس بەم شێوەیە، «خەرمانێکی پیرۆز» بە دەوری پێکدادانی چینایەتیو تێکشکاندنی شۆڕشگێڕانەی سەرمایەداردا دەکێشێت. ئەڵبەت مارکس خۆی پێشمەرجی ئەم بابەتە بە پەرەسەندنی بێ وەستانی کەرەستەکانی بەرهەمهێنان دادەنێت، واتە تەکنیکو داهێنانو گەشەی لێهاتووییو زانیاریی کرێکاران. لەڕاستیدا هەر ئەم پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنانە کە پێکدادانی لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان زیاتر دەکاتو دەیباتە خانەی دژایەتی نێوانیانەوە. هابرماس ڕاستو دروستیی ئەم تێزە مارکسیستیە ڕەددەکاتەوە. (هاوکات) پێی وایە پەرەسەندنی پرۆسە کۆمەڵایەتیەکانی ئێمە، نابێت بەتەنها وەک پەیامی پەرەسەندنی زاڵبوونی تەکنیکیی ئێمە بەسەر سروشتدا فام بکرێت. گەشەی ئامانجداری کرداری کەرەستەیی ئێمە لە ڕێگەی بەزانستیکردنی کەرەستەکانی بەرهەمهێنانەوە، بەتەنها خۆی ناتوانێت خاڵی کۆتایی بۆ ستەمی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ بۆسەر مرۆڤ دابنێت. بەباوەڕی هابرماس، مارکس تەنانەت لە هزری خۆیشیدا بەشێوازێک ناشێلگیرە، چونکە پروسەکانی هوشیاری کە بۆ ئەنجامدانی پێکدادانی چینایەتی پێویستن، لە عەقلانیەتی زاڵبوون بەسەر سروشتەوە بەدەست ناهێنێت. هابرماس بە ئیلهام وەرگرتن لە هێگڵ، دروستبونی هوشیاری کۆمەڵایەتی ڕەخنەگرانە بە مەسەلەیەکی تایبەت بە ناسینی قوڵی بیرکردنەوە ئەزانێت. ناسینێکی لەوچەشنە دەریدەخات کە پێوەندیی نێوان مرۆڤەکان ناتوانێو نابێ لە سەر بنەمای کرداری توندوتیژوانە بێت. ئەڵبەت بەباوەڕی هابرماس ئەمە حاشاهەڵنەگرە کە ئێمە بەردەوام بینەری سەرهەڵدانو دەرکەوتنی زەبروزەنگو توندوتیژین، بەڵام زەبروزەنگنواندن دەرکەوتەیەکی درۆزنانەی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانە، نەک ناوەڕۆکو خەسڵەتی ڕاستەقینەی. ناسینی قووڵی بیرکردنەوەی مرۆڤ دەتوانێت ئەم دەرکەوتە ناڕاستە جیابکاتەوەو لانیکەم زەمینەیەکی لەبار بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشمەکێشە کۆمەڵایەتیەکان دەستەبەر بکات، تا لەوڕێیەوە چارەسەرکردنی شەڕانگێزانەی کێشمەکێشەکان بخرێتە پەراوێزەوە. بەبڕوای هابرماس بابەتێکی لەوجۆرە تەنیا لە کاتێکدا دێتە دی کە تیۆریزەکردنی کۆمەڵایەتی، وەکو تیورەی ناسین «ئەبستمۆلۆجیا» بێتە ئاراوەو بیسەلمێنێت کە ناسینی سروشتو ناسینی پەیوەندی نێوان

مرۆڤەکان دوو جۆری جیاوازن. تەنها لە ڕوانگەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانەوەیە کە بابەت یا ‹لایەنی وەستاوی ناسین› (gegenstand)ی، هاوکات بکەری ناسێنەریش دەگرێتەوەو سووژەی ناسراو لە بکەری ناسێنەر جیاناکرێتەوە. مرۆڤ لە ناسینی هاوجۆری خۆیدا (مرۆڤ_و_)، خۆی دەناسێتو بەپێچەوانەوە. ئەگەر ئەم ناسینە کامڵ نەبووە، دەکرێ چاوەڕێ بین کە ناسینێکی لەوشێوەیە هیچکات کامڵ نابێت، تیورە شتێک نابێت، جگە لە ڕەخنەو هەڵسەنگاندن.

## تیۆرییەکانی کرداری پێوەندیگرتنو پەرەسەندن

تیۆرییەکانی کرداری پێوەندیگرتنی هابرماس، دڵی فەلسەفەی کۆمەڵایەتیەکەی پێکئەهێنێ. هەروەک باسکرا، هابرماس هەوڵدەدا بیسەلمێنێت کە کێشمەکێشە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەی ئایدیال پێویستە بە بێ بەکارهێنانی زەبروزەنگو توندوتیژی چارەسەر بکرێن. ئەوەش بەو واتایەیە کە پێویستە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بنیات بنرێت کە تێیدا بڕیاردانو جێبەجێکردنی بڕیارەکان لە ڕێگەیەکی عەقڵانیەوە ئەنجام بدرێت. ئەم باوەڕە ئایدیالە لەبارەی پێوەندی بێ ناچارکردن، لەلایەن هابرماسەوە لە نووسینە جۆربەجۆرەکانیداو، هەرجارە لە ڕوانگەیەکی نوێیە هاتووەتە بەرباس.

بەباوەڕی هابرماس، پەرەسەندی مێژوویی- سیاسی ڕاستی کە پێکهاتنی ڕای گشتیش لەخۆ دەگرێت، بەشێوەیەکی بەردەوامو لە لایەنە جۆربەجۆرەکانەوە ئایدیالی پێوەندیی ئاشتیخوازانەو دوور لە توندوتیژیی مرۆڤەکانی خەوشدار کردووەو دەیکات. لێرەوە ئەبێت بەدوای وەڵامی پرسیارێکەوە بین کە چۆن شیاوە و ئەشێت کە بەدیهاتنی پەیوەندیە زیهنی و گشتیەکان هەمیشە ئەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤەکان ئەوەیان لەبیر بچێت کە ڕێک پاراستنی ئەم پەیوەندیە هاوبەشانەیە کە ئەتوانێت لە مەودای دوردا ببێتە هۆی بەدەزگایی بونی ئەو هەنگاوانەی کە ئەتوانن ئەو جیاوازیانەی بەهۆی دابەشکردنی سامانی مادیەوە دروسی ئەبێ.
بێ توندوتیژی چارەسەر بکەن

بەباوەڕی هابرماس ئەوە ڕێکەوت نیە کە بەئامرازکردنی بیرکردنەوەی سیاسیی ئێمە، یا بە دەربڕینێکی تر ئەو ڕاستییەی کە ئێمە پەیوەندیە مرۆییەکانیش لە چوارچێوەی عەقڵانیەتی سنووردار لە ژێرناوی «ئامرازو ئامانج»دا لێکدەدەینەوە، بەشێوەی مۆدێل لە تیۆری مەعریفەشدا ڕەنگ دەداتەوە. چونکە زانینیش ئەمڕۆ بووەتە ئامرازی دەسەڵاتو دەتوانێت خاوەن هێزێکی زۆری بەلاڕێدا بردن و گەوجاندن بێت. هابرماس تاوتوێی مەسەلەی باباتیبون و بێلایەنی لە زانستە کۆمەڵایەتیکانیشدا ئەکات. ئەو پێی وایە بەگشتی دەکرێت زانستەکان بەسەر سێ ڕوانگەدا دابەش بکرێت:

١- زانستە ئەزموونگەرو شیکاریەکان کە لە چوارچێوەی بەرهەمهێنانەوەی سروشتیی ئێمەدا پەرەیانسەندووە .

٢- زانستە کەلتووریو هێرمێنۆتیکیەکان کە نەریتە مرۆییەکان مسۆگەر دەکەنو ڕێگەیان بۆ خۆش دەکەن.

٣- زانستە ڕەخنەگریەکان، کە بەشێک لە وەدیهێنانی ئازادی، یەکسانیو دادپەروەرییان لە ئەستۆدایە.

بەباوەڕی هابرماس زانستەکانی بەشی یەکەم باس لە بابەتی کار دەکەنو زانستەکانی بەشەکانی دووەمو سێیەم تایبەتن بە پێوەندیی نێوان مرۆڤەکانەوە.

بەمشێوەیە دەكرێ بگەینە ئەو دەرەنجامەی كە هەر لەم دوو گرووپەی دواییدایە كە تیۆرەی پێوەندی دەورێكی سەرەكی ئەبینێت. كرداری مرۆڤەكان تەنها لە پێوەندیی لەگەڵ سروشتدا نییە، بەڵكوو لە پێوەندیی لەگەڵ یەكترو خۆشیاندا، كردار دەنوێنن. بەڵام سەركەوتنی كرداری كۆمەڵایەتی لە هەلومەرجێكی تردا روودەدات، تا سەركەوتنی كردار لە پێوەندیی لەگەڵ سروشتو بابەتەكانیدا. لەكاتێكدا سەركەوتنی كردار لەپێوەندیی لەگەڵ سروشتدا، تەنها لە كاریگەربوونی وەها كردارێكدا هەڵئەسەنگێنرێ، ئەوا لە كرداری كۆمەڵایەتیدا (بە مەرجێک توندوتیژیی تێدا نەبێت) چوار مەرجو داواكاری بایەخیان هەیە: فامكردنو تێگەیشتن لە بۆچونەكان، حەقیقەتی وتەكان، قەبوڵكردنی ڕاستیو دروستیی لایەنەكانی وتوویێژو دواجار ڕاستیو دروستیی وتە سروشتیەكان. ئەڵبەت لای هابرماس ڕوونە كە ئەم مەرجگەلە هیچكات بەتەواوی نایەنە دی، بەڵام ئەگەر قبووڵی بكەین كە ئەم مەرجگەلە ڕەواییان نییەو نابێت لە ڕەوتی پێوەندیی نێوان مرۆڤەكاندا ڕەچاو بكرێن، بنەمای پێوەندی تێكدەچێت. لەوروەوە كە هەر ئەم خاڵەش بۆ روداوی پەیوەندی زمانی ئەتوانێت و ئەبێت ببێت بە هوشیاری، هەلومەرجی گفتوگۆ كە هەڵگری هەلومەرجی رودان و عەقڵانی بوونیشە، رەهەندێكی زیاتر لە كرداری ئامرازی وەرئەگرێت كە مەرجی سەركەوتنی لە چوارچێوەی پراكتیكی خۆیدا قابیلی رونكردنەوە نیە. لەڕاستیدا هەر ئەم تێفكرینو ڕامانە لە زمانی مرۆییو كرداری پێوەندیگرتنەكانێتی كە هابرماس بۆ ئەو بیروباوەڕە ڕێنوێنیی دەكات كە كرداری پێوەندیگرتن، مۆدێلێكە بۆ هەموو كردارەكانی تر.

هابرماس لە كتێبی دووبەرگیی «تیۆریی كرداری كۆمەڵایەتی»دا، شیكاری هۆكاری قەیرانە كۆمەڵایەتیەكانی كۆمەڵگا ئەمڕۆییەكانو برەوو توانای تیورەكانو فەلسەفەی كۆمەڵایەتی دەكات. هابرماس بە ئیلهام وەرگرتن لە تیۆریی ماكس ڤێبر سەبارەت بە پەرەسەندنی عەقڵانیەت لە كۆمەڵگا ڕۆژاواییەكاندا، جەخت لەوە ئەكات كە لە بواری كۆمەڵایەتیدا، گۆڕانێكی بنەڕەتی لە پێوەند لەگەڵ میكانیزمە گرنگەكانی كۆنترۆڵو شەرعیەتی سیستەمە سیاسیەكان هاتووەتە ئاراوە. ئەم سیستەمانە چیتر وەک ڕابردوو لە ڕێگەی تەفسیرە ئەفسانەیەكان، یا شەرعیەتە تاكەكەسیو بنەماڵەییەكانەوە لەسەرپێ نین، بەڵكوو لەسەر بنەمای ڕێكەوتن لەسەر ئامانجە سیاسیەكانو ڕاو ویستی ئازادی هاوڵاتیان بەندن. ریكەوتنی لەو جۆرە، بەتەنها لەخۆگری پەیمانە كۆمەڵایەتیەكان نییە، بەڵكوو كردارە ئەخلاقیەكانو پێوەرەكانی هەڵسەنگاندن لەسەر ئەوانیش لە خۆ دەگرێت.

بەشێكی تر لە بونیادی فكریی هابرماس، تیۆرەی پەرەسەندن (Evolutionstheorie) یەتی. هابرماس لەم تیۆریەدا بەدوای وەڵامێكدا دەگەڕێت بۆ ئەم پرسیارە كە چ فاكتەرگەلێک بۆ پێشخستنو پەرەسەندنی تەكنیكیو كەلتووریی ئێمە دیاریكەرە؟ پرسیار لە بابەتێكی لەوچەشنەش لە ڕوانگەی ئەگەری باشتربوونی پەیوەندیە سیاسیو كۆمەڵایەتیەكانەوە دێتە ئاراوە. هابرماس لە فەلسەفەی مێژووی خۆی لە ڕوانگەی زانستیەوە، لەو خاڵەوە دەستپێدەكات كە پەرەسەندنی ئێمە دەبێ بەواتای دووبارە سەرهەڵدانەوەی فۆرمە ئەخلاقیەكان، واتە داڕشتنی داخوازییەكانی ئێمە بۆ ڕێگەچارەیەكی بەدوور لە توندوتیژی بەمەبەستی بەدەستهێنانی دادپەروەری،

ئازادیو یەکسانی بخرێتە بەر باسەوە. ئەڵبەت ئەم داخوازیانە لەوانەیە لە کورتخایەندا سەرکوت بکرێن، بەڵام لە مەودای دوردا نە دەکرێ ڕەواییان لێ بسندرێتەوەو نە دەشکرێ لە بەین ببرێن. دەکرێت تێزی هابرماس لەم بارەیەوە بەم شێوەیە بەکورتی باس بکرێت: چارەسەرکردنی کێشە تەکنیکیەکانی ئێمە، واتە کێشە بەرهەمهاتووەکان لە پێوەندیی لەگەڵ سروشتو لە چوارچێوەی بەرهەمهێنانەوەی سروشتیی ئێمەدا، پێویستی بە تواناییگەلێکە کە بە تەنها لە ڕێگەی ئاوێتەبوون لەگەڵ کێشە تەکنیکیەکاندا، واتە کرداری کەرەستەیی ئێمەدا گەشە ناکەن، بابەتێکی لەو چەشنە پێویستی بە ئاستێکی باڵایە لە عەقڵانیەت. هابرماس، سەرچاوەی عەقڵانیەتێکی لەوجۆرە لە پەرەسەندنو بەرزبوونەوەی ئاستی پێوەندیی دوولایەنەی سروشتی (normativ)دا دەبینێت. تەنها لە ڕێگەی چەمکو سەرهەڵدانی پێوەندیی دوولایەنەی سروشتیەوە دەکرێت لە ڕۆڵو پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان تێبگەین، نەک لە ڕێگەی عەقڵانیەتی ئامرازی کارەوە. بەڵام هەردوو لایەنی ئەم کردارانە لە ئاستی پەرەسەندنی ڕاستەقینەی کۆمەڵایەتیدا، لە پێوەندیەکی دوولایەنەو توندوتۆڵدان. لە ئاستی بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵایەتیدا لەوانەیە پرسو کێشەی سیستەمی بێتە ئاراوە کە دەبێ لە ئاستی ڕوخسارە گرێدراوە کۆمەڵایەتیەکاندا چارەسەر بکرێت. چارەسەرکردنی ئەوجۆرە کێشەگەلە کە سیستەم ڕوبەڕوی مەترسی دەکەنەوە، پێوەندی بە پەرەسەندنی پرۆسەی پەروەردە و فێربونی کۆمەڵایەتیەوە هەیە. بەباوەڕی هابرماس، کۆمەڵگاکان دەتوانن لە سێ لایەنەوە فێر ببن: ١- لە بواری زاڵبوون بەسەر سروشت، یا پەرسەندنی هێزە بەرهەمهێنەکانی تەکنیکو داهێناندا.

٢- لە بواری سیستەمی سیاسی- کۆمەڵایەتیدا.
٣- لە بواری پێوەندیی کراوە (expressiv)ی نێوان خەڵک. هابرماس هەوڵ دەدات نیشانی بدات کە پرۆسە فێرکارییەکان لە بوارەکانی سەرەوەدا، پەیڕەوی لە لۆژیکێکی پەرسەندنی تایبەت بە خۆیان ئەکەن. ئەڵبەت پێویستە بایەخ بەو بابەتەش بدرێت کە پرۆسەکانی دینامیکی پەرەسەندن دەتوانن خاو ببنەوە یان ڕابوەستنو تەنانەت بگەنە بونبەست. ئەو پرۆسانە تەنانەت دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ دواوە. بەڵام بە باوەڕی هابرماس ئەو ئەگەرە لە ئارادایە کە شتێک وەک ئامانجی کۆمەڵێکی پێکەوە پەرسەندوو لەبەرچاو بگیرێت.

هابرماس بە مەبەستی دیاریکردنی ئامانجێکی لەوجۆرە، جارێکیتر دەگەڕێتەوە بۆ تیۆری کرداری پێوەندیگرتن. شیکردنەوەی هەلومەرجێک کە دەبێ لە ئارادا بێت بۆ ئەوەی پێوەندیی مرۆڤەکان سەرکەوتوو بێت، لە بارودۆخی زمانەوانیی ئایدیالدا، نەتەنها پێوەرێک بۆ هەڵسەنگاندنی پێوەندییەکی تایبەت دەدات بە دەستەوە، بەڵکوو هەروەها ئەم ئایدیالە وەک ئامانجی پەرەسەندنیش پیشان ئەدات. تەنها کاتێک دەکرێت بیر لە ئازادی، یەکسانیو دادپەروەری بکرێتەوەو بێنە دی کە نۆرمەکان خەسڵەتێکی جیهانییان هەبێتو بەواتایەکی تر، بۆ هەر کەس لە هەر سەردەمێکدا بایەخیان هەبێت. بەشێوەیەک کە هەر کەس لە هەر کاتێکدا بیەوێت، بەپێی ئەو نۆرمانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت. هابرماس بۆ وردکردنەوەی ئەم ڕایە نیشانی دەدات کە مەرجەکانی سەرکەوتنی پێوەندیی زمانەوانی، لە دوا شیکردنەوەدا مەرجە ئەخلاقیەکانن. لە پێوەندیی زمانەوانیی نێوان مرۆڤەکاندا، بەتەنها قسە لەسەر گۆڕینەوەی زانیاریەکانو چارەسەرکردنی

کێشە دیاریکراوەکان نییە، بەڵکوو بە مەبەستی گەیشتن بە ڕێکەوتنگەلێکە لەسەر بایەخی ڕێساو نۆرمەکان لە بواری وتەو کردەدا. هابرماس هەر لەم بنەمای بایەخی نۆرمی زمانیەوەیە کە پێوەرەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دەردەهاوێت.

یەکێک لەو فاکتەرە تیژانەی تیۆری پەرەسەندنی هابرماس، لێکچوونێکە کە لە نێوان پەرەسەندنی هوشیاری ئەخلاقی تاکەکەسیو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا بەدیدەکات. بەباوەڕی هابرماس، تایبەتمەندیی سیمای پەرەسەندنی تاکەکەسی ئەوەیە کە دەتوانێت خۆی لە بەکاربردنی دەقاودەقی نۆرمەکان ڕزگار بکاتو لە ڕەوتێکی ڕوو لە گەشەدا نەک تەنها کردارەکان لە ڕوانگەی دەرئەنجامەکانیەوە، بەڵکو بە لەبەرچاوگرتنی ویستو ئامانجی مرۆڤەکانی تر هەڵبسەنگێنێت. مرۆڤی پێگەیشتوو دەتوانێت لەسەر بنەمای ئەخلاقییە جیهانیەکان، بەشێوەیەکی سەربەخۆیانە ئەوە هەڵسەنگێنێت کە کامە نۆرمی ڕێگەپێدراو دەتوانێت لە بارودۆخێکی دیاریکراودا بایەخی خۆی لەدەست بدات. پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیش لای هابرماس، وەکوو ڕەوتی پەرەسەندنی لۆژیکی هوشیاری ئەخلاقی هەژمار دەکرێن. هابرماس هێڵێکی تەریب لە نێوان پەیوەستبونی تەواوی تاکەکەس بە نۆرمە داسەپاوە دەرەکیەکان، تا سەربەخۆی تاکەکەسیو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیی کولتوورەکانی ڕابردوو، تا سەردەمی ئێمە دیاری دەکات.

## وتەی کۆتایی

پرسی ناوەندی لە هزری فەلسەفیی هابرماسدا، شێوەی هەڵسوکەوتی دیموکراسییە مۆدێرنەکانو کەلکەڵەی قوڵکردنەوەیەتی. لە لێکۆڵینەوەکانی هابرماسدا، بایەخدان بە فاکتەرە ڕێگرو هەڕەشەکەرەکان لە دیموکراسی جێگەیەکی تایبەتیان بۆخۆیان تەرخان کردووە. هابرماس لایەنگری بەشداریی ڕۆژلەدوایڕۆژی خەڵکە لە بڕیاردانەکان لە ڕێگەی بەشداری سیاسیەوەو ڕای گشتی هوشیار بە دڵنیابەخشترین بارمتە بۆ بەرگرتن بە خراپبەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی دەزانێت. هابرماس پێیوایە کە دەبێ لە ڕێگەی بەکارهێنانی هەموو کەرەستەو ئامرازەکانەوە بەر بە وروژاندنی زەبروزەنگو توندوتیژی لە کۆمەڵگا ئەمڕۆییەکاندا بگیرێت، چونکە زەبروزەنگو توندوتیژی بەردەوام بەهێزبوونی لایەنە نادیموکراتیکو دواکەوتوخوازەکانی لێدەکەوێتەوە. لە جیهانبینی هابرماسدا، تیۆرە فەلسەفیەکان گرنگیەکی تایبەتییان هەیە، چونکە ئەم تیۆرانە نەک تەنها توانایی ئاشکراتر کردنی ئاسەوارەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگای مرۆییان هەیەو بیرۆکەی کۆمەڵایەتیش بۆ گەیشتن بە دنیایەکی باشتر شادو زیندوو دەهێڵنەوە، بەڵکوو دەشتوانن ڕۆڵێکی پاڵنەریان ببێت بۆ بەشدارییپێکردنی ئەکتیڤتری خەڵک لە ژیانی سیاسیدا. هابرماس پێیوایە کە لەگەڵ پەرەسەندنی دیموکراسییە مۆدێرنەکاندا، مرۆڤەکان ڕۆژلەدوایڕۆژ لە فێربوونو خوێندەوارییەکی زیاتر بەرهەمەند دەبنو لەگەڵ گەشەی خێرای پێوەندیەکانو ڕۆڵی بەربڵاوی کەرەستەکانی پێوەندیی گشتی، دەستپێڕاگەیشتن بە هەواڵو زانیاریەکان ئاسانتر دەبێتو ئەمەش کاریگەری پۆزەتیڤی لەسەر قوڵبونەوەی ناسینی مرۆڤ بۆ دیاردەکانی دەوروبەری ئەبێت. هەروەها پێیوایە لە سەردەمی زانیاریو پەیوندیکانی مانگی دەستکردا، لەخۆیدا ناکرێت تاکەکان لە بواری پیشەییو...هتدەوە بە شێوەی بەرفراوان لە فێربوونە باڵاترەکان بەهرەمەند بکرێنو هاوکات هەوڵ بدرێت لەڕووی سیاسیەوە بگەوجێندرێن؛ هابرماس ئەم بابەتە بە پارادۆکس دەزانێت.

پەراوێزو سەرچاوەکان :

١ - «قوتابخانەی فرانکفۆرت» نـاوی کۆڕێکە لـە بیرمەندو نـووسـەرە فەلسەفی، سیاسیو کۆمەڵناسیەکانی هـاوچـەرخ کـە لـە گۆشەنیگا جۆربەجۆرەکانەوە فەلسەفەی کۆمەڵایەتیان تیۆریی ڕەخنەیی (Kritische Theorie) کردووە. مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ «ئەنستیتۆ بۆ توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکان» لە شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیا کە ‹ماکس هۆرکایمەر› فیلسوفـو کۆمەڵناسی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٣٠دا سەرۆکایەتیی لە ئەستۆ بوو. ئەڵبەت لە بەرهەمە پێشکەشکراوەکان لە لایەن نوێنەروانی ئەم کۆڕەوە، هەولێک بۆ دروستکردنی قوتابخانەیەکی فکری لە سەر بنەمایەکی دیاریکراو هەست پێناکرێت، بەڵکە زیاتر دەکرێت وەک ڕێکەوتنێکی بنەڕەتیی نێوان گەورەکانی بەرەی یەکەم وەک ماکس هۆرکهایمەر، تیۆدۆر ئادۆرنۆو هێربێرت مارکۆزە، لەگەڵ نوێنەرانی دواییدا وەک یۆرگن هابرماس لەسەر بۆچوونێکی فکری لە دیاریکردنی مەسەلەو کێشەکانی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان ناوببرێت.

2-Honneth, A./ Bonss, W. (Hrsg.): Sozialforschung als Kritik. Frankfurt/M. 1980.
3-McCarthy, Th.: The critical Theory of Jürgen Habermas. Cambridge, Mass. 1978; dt.: Kritik der Verständigungsverhältnisse. Frankfurt/M. 1980.
4-Habermas, J. : Strukturwandel der Öffentlichkeit. Berlin 1962.
5-Habermas, J. : Erkenntnis und Interesse. Frankfurt/M. 1968.
6-Habermas, J. : Zur Logik der Sozialwissenschaften. Frankfurt/M. 1970.
7-Habermas, J. : Politik, Kunst, Religion. Stuttgart 1978.
8-Habermas, J. : Theorie des kommunikativen Handelns. 2 Bände, Frankfurt/M. 1981.
9-Habermas, J. : Die Zukunft der menschlichen Natur, Frankfurt/M. 2001.
10-Habermas, J. : Theorie und Praxis, Neuwied/Berlin, 1963

١١ - ویلهێڵم دیلتی (Wilhelm Dilthey) (١٨٣٣ - ١٩١١) فیلسووفی ئەڵمانی، هەوڵی داڕشتنی زانستە ئەزموونگەرییەکانی دا بە مەبەستی دیـاردە دەروونـیـەکـانو تێگەیشتن لـە پرۆسە مێژووییەکانی دەروونی مرۆڤ لە ڕێگەی زانینەوە. بە زۆری خۆی بەلای قوتابخانەکانی ئایدیالیزمی ئەڵمانیو ڕۆمانتیزمو بەتایبەت ئەندێشەکانی شلایر ماخر دا کێشاند. لەمڕێیەوە بەسەر ڕەخنەی «عەقڵی مێژوو»دا زاڵبوو بووبە داهێنەری تیۆریی مەعریفەی زانستە ئەزمونگەرییەکانو هەوڵیدا سەربەخۆیی ئەم زانستە لە زانستە سروشتیەکان، هەم لەڕووی بابەتیو هەم لە ڕوانگەی مێتۆدەوە بسەلمێنێت.

سەرچاوە: باشگاه اندیشه

http://www.bashgah.net/

# ئەویتر لە دیدی فەیلەسوفە بەراییەکانی ڕۆشنگەرییەوە

نووسینی: هاشم ساڵح
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ڕۆشنگەری ئەورووپی بۆ یەکەمینجار جەختی لەسەر گەردوونیبونی عەقڵ و ڕەگەزی مرۆڤ و مافەکانی مرۆڤ کرد. ئەوە ڕۆشنگەری ئەورووپی بوو تیۆلۆژیای مەسیحی تایفەگەری سەدەکانی ناوەڕاستی ڕوخاند، (واتە ئەوەی تەنها بڕوای بە مافەکانی مرۆڤی مەسیحی هەبوو، بگرە مافەکانی کاسۆلیکی ئەگەر زۆرینەی وڵات کاسۆلیک بوایە، یاخود پرۆتستانتی ئەگەر زۆرینەی وڵات پرۆتستانت بوایە).
لە شوێنیدا فەلسەفەی سیاسی مۆدرێنی جێگیرکرد کە بڕوای بە مرۆڤ وەک مرۆڤ هەیە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی مەرجەکانی ڕەگەز یان ئاین یاخود مەزهەب.
تەماشای مۆنتسکیۆ، ڕۆسۆ، ئینسایکلۆپیدیەکان، کانت، بەرژەوەندخوازانی ئینگلیز بکە کە پێیانوابووە نرخ و پێوەرو بەهای هەر


هاشم صالح

**گومانی تێدانییە هەندێ فەیلەسوفی ڕۆشنگەری هەیە دژ بە کۆڵۆنیالیزمن، وەك ڕۆسۆو دیدرۆو ئەوانی دیکە. بۆ نمونە ڕۆسۆ دەڵێ: (ڕژێمی کۆیلایەتی تەنها لەبەر ئەوە ڕەتناکرێتەوە کە شەرعیەتی نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە بێ کەڵكو بێهودەیەو هیچ مانایەکی نییە. ڕژێمی کۆیلایەتیو یاسا بە هیچ جۆرێ پێکەوە کۆنابنەوە، ئەوانە دژی یەکترن**

ڕەفتارێک ئەمەی خوارەوەیە: خزمەتکردنی تاک و کۆمەڵگا وەک گشتێک، نەک تەنها خزمەتکردنی هۆز یان عەشیرەت. پێویستە بزانین سەدەی ڕۆشنگەری سەرەتای یەکەمین دەستپێکردنی جیهانگیری بووە، وەک ئەوەی فەیلەسوفی فەرەنسی «لۆک ڤێری» لە دواهەمین کتێبە نایابەکەیدا باسی دەکات و ئێمە لێرەدا پشت بە هەندێ لە تێزەکانی دەبەستین (١) ئەوە جیهانگیرییەکی گەردونی بووەو گەشبین بووە بە ئایندەی مرۆڤو ڕەگەزی مرۆڤایەتی. ئەو فیکرەی زاناکان و فەیلەسوفانی ئەو سەردەمە بەرهەمیانهێناوە، بڕوای بەوەبووە بارودۆخی مرۆڤایەتی وردە وردەو لەسەرخۆ و پلەبەپلە باشتردەبێت. ئەم باشتربونەش لەیەککاتدا لە ڕێگەی زانست و سیاسەتەوە دەبێت. زانست وەک ئەوەی دیکارت وتویەتی وادەکات مرۆڤ گەورە و سەرداری سروشت بێتو بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەوە زانستە وادەکات ئامێرە تەکنەلۆژییەکان دابهێنرێن کە هیلاکیو ماندوبونی مرۆڤەکان کەمدەکاتەوە، یان تەنانەت بە تەواوی نایهێڵێتو مرۆڤ لەو ماندوبونە درێژخایەنەی بە دەستییەوە دەیناڵاند ڕزگاردەکات.

فیکری ئەوروپی لەگەڵ هاتنی ڕۆشنگەری، سەردەمی لاهوتی مەسیحی تێپەڕاند کە هەمو خەمەکانی خۆی لە بەرژەوەندی کەسی ئیمانداری مەسیحیدا کورتکردبوەوە. لە تێروانینی لاهوتیدا تەنها مرۆڤی ئیماندار مرۆڤێکی تەندروستو تەواوە.

لێرەوە ڕۆشنگەری گوتاری خۆی ئاراستەی مرۆڤ دەکرد لە هەر شوێنێک بێت، بەبێ گوێدانە مەسەلە ئاینیو ڕەگەزیو مەزهەبییەکان. ئیدی خودی مرۆڤی عەلمانی (یان مرۆڤی شارستانی وەک ئەوەی ئێستا دەوترێت) بووە خاوەن بەهاو چیتر بەهای مرۆڤ تەنها پەیوەست نەبوو بە مرۆڤی لاهوتییەوە. بەم مانایە گوتاری ڕۆشنگەری هەمو ئاینەکانو ڕەگەزەکانو تایفەکانی دەبڕیو بە تەواوی تێیپەڕاندن. بەجیهانیبوون یان بە گەردونیبوونی ئەم گوتارە ئالێرەدایە. پاشان لەگەڵ دۆزینەوەی پرنسیپی (العگالە الژاتیە)و هێزی ڕاکێشانی گەردون،

شۆڕشی زانستی لە ئەوروپا، بۆ یەکەمجار لە مێژوی مرۆڤایەتیدا، گوتاری ئاراستەی سەرجەم مرۆڤەکان دەکرد کە دەکەوتنە پشت ئەو سنورانەی لەیەکتریان جیادەکاتەوە.

لە کۆندا گوتارەکان تەنها ئاراستەی کوڕوکاڵی ئاینێک یان ڕەگەزێک دەکراو تەواوی ڕەگەزی مرۆڤایەتی نەدەگرتەوە، بگرە هەرگیز بە خەیاڵیشیدا نەهاتووە تـەواوی رەگـەزی مرۆڤایەتی بگرێتەوە. تەنانەت لەناو تەنها یەک ئاینیشدا، گوتارەکان ئاراستەی کوڕوکاڵی مەزهەبێک یان عەشیرەتێک دەکرا، بەبێ لەبەرچاوگرتنی مەزهەبو عەشیرەتەکانی دیکە. ئەگەر تۆ لە شارێکدا بویتایە زۆرینەی کاسۆلیک بوایە، ئەوا ئەو مرۆڤەی تەواوی مافەکانی هەبوو مرۆڤێکی کاسۆلیکی بوو، بەڵام ئەگەر تۆ لە شارێک بویتایە زۆرینەی شارەکە پرۆتستانت بوایە، ئەوا پێچەوانەکەی ڕاست بوو. دەکرێ هەمان شت لەسەر مرۆڤی سونیو مرۆڤی شیعی نێو جیهانی ئیسلامی بوترێت.

بـەڵام دوای سـەردەمـی ڕۆشنگەری، گوتارەکان وایانلێهات ئاراستەی تـەواوی مرۆڤایەتی بکرێت. ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤـو هاوڵاتیبوون کە شۆڕشی فەرەنسی هێنایەئارا، تەنها ئاراستەی فەرەنسییەکان نەکرا یان تەنها ئاراستەی کاسۆلیکەکانی ناو ئاینی مەسیحی نەکرا، بەڵکو ئاراستەی هەمو مرۆڤەکان کـرا، بـەدەرلـەوەی ئاینەکەی یـان مەزهەبەکەی هەرچییەک بێت: مەسیحی، موسڵمان، جوولەکە، کاسۆلیکی، پرۆتستانی، سونی یان شیعی...هتد. دەکـرێ هەمان شت لەسەر جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨ بڵێن کە نەتەوە یەکگرتووەکان ڕایگەیاندو زیاتر تۆکمەو تێروتەسەلتر بوو. دابڕانی گەورەی مۆدێرنە یان دابڕانی ڕۆشنگەری ئالێرەدایە.

ئەمە ئەو دابڕانەیە تاکو ئێستا لە جیهانی عەرەبی یان ئیسلامیدا ڕوینەداوە، گەورەترین بەڵگە بۆ ئەوە، ئەوەیە کە حاڵی حازر لە وڵاتەکانماندا ڕوودەدات. ئێمە تا ئێستاش لە گوتارو نوێژەکانماندا دەپاڕێینەوە کە: خودایە ئیسلامو موسڵمانان سەرخەو ناڵێن خودایە هەمو مرۆڤەکان سەرخە یان بەزەیت بە هەموياندا بێتەوە. زۆر بە دەگمەن دەڵێین: خودایە بێدەسەڵاتە زوڵملێکراوەکانی سەر زەوی، لە هەرکوێیەکدابنو سەر بە هەر دینو رەگەزێکبن، ڕزگاربکە. ئەم شتە لە دەرەوەی هوشیاری ئێمەیەو هەستوسۆزمان بریندار دەکات یاخود بەر هەستو سۆزی تەقلیدی ئیمانمان دەکەوێ کە هەر لە منداڵییەوە لەسەری پەروەردە کراوین. بەڵام رۆشنگەری سەرباری دەستکەوتە گەورەکانی، لەگەڵ دیاردەی کۆلۆنیالیزمو لەگەڵ ئیمپریالیزمی خۆرئاوادا خۆیگونجاند، بگرە هەندێجار لەگەڵ رەگەزپەرستیشدا خۆیگونجاندوە، وەک ئەوەی خودی «لۆک ڤیری» لە لاپـەڕە ٢٥٥کتێبەکەیدا دانیپێدادەنێت. یان ڕاستتر بڵێ ڕۆشنگەری نەیتوانی تەواوی ئەو دیاردانە قەدەغە بکات (٢).

گومانی تێدانییە هەندێ فەیلەسوفی ڕۆشنگەری هەیە دژ بە کۆلۆنیالیزمن، وەک رۆسۆو دیدرۆو ئەوانی دیکە. بۆ نمونە ڕۆسۆ دەڵێ: (ڕژێمی کۆیلایەتی تەنها لەبەر ئەوە ڕەتناکرێتەوە کە شەرعیەتی نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە بێ کەڵکو بێهودەیەو هیچ مانایەکی نییە. ڕژێمی کۆیلایەتیو یاسا بە هیچ جۆرێ پێکەوە کۆنابنەوە، ئەوانە دژی یەکترن. گەر من ڕابەری یەکێک لە گەلانی ئەفریقای ڕەش بومایە، سێدارەیەکم لەسەر سنور هەڵدەخستو یەکەم ئەورووپیم هەڵدەواسی بوێری ئەوە بکات بێتە ناو وڵاتەوە).

مۆنتسکیۆ دەڵێ: (ڕژێمی کۆیلایەتیو بەکۆیلەکردن

دژی یاسای سروشتییەو هەمو خەڵکی بەپێی ئەو یاسایە ئـازادو سەربەخۆن. لێرەوە کۆیلەی ڕەش مافی خۆیەتی ڕابکاتو ئازادی خۆی بەدەستبێنێت. جەنگی سپارتاکۆس شەرعیترین جەنگە لە مێژودا). بەڵام ئەم قسە جوانانەی مۆنتسکیۆ، ڕێگرنەبوو لەوەی مۆنسیکیۆ، وەک زۆربەی فەیلەسوفەکانی دیکەی ڕۆشنگەری، ڕقیان لە ڕەگەزی ڕەش نەبێت، دواتر باسی دەکەین.

جان جۆزێف دو بێشمیرجا دەڵێ: (هەر کەسێک پاساو بۆ ڕژێمی کۆیلایەتی ناشرینو دزێو بێنێتەوە، ئەوا لەلای فەیلەسوفان تەنها شایەنی ئەوەیە بەسوک سەیری بکەنو لای کۆیلەش شایەنی ئەوەیە بدرێتە بەر زەبری خەنجەر). دیدرۆ دەڵێ: (ناچارمانکردن نەک بارودۆخی کۆیلەیان هەبێ، بەڵکو بارودۆخی ئاژەڵ (وشتر)یان هەبێت. کەچی دوای ئەوەش لافی ئەوە لێدەدەین ئێمە عاقڵینو ئێمە مەسیحین!). پاشان دیدرۆ بەردەوام دەبێو دەڵێ: (کرینی قولەڕەشو ناچارکردنیان بـەوەی بە بـارودۆخـی کۆیلایەتی ڕازیببنو بازرگانیکردن پێیانەوە، مەسەلەیەکە دژ بە پرنسیپەکانی ئاینو ئەخلاقو یاساکانی سروشتو هەمو مافەکانی مرۆڤ).

ئەم هەڵوێستە لەسەر ڕژێمی کۆیلایەتی، نمونەیە بۆ نەمریو شکۆمەندی فەیلەسوفانی رۆشنگەری. بەڵام کێشەکە ئەوەیە ئەمە مانای یەکسانی نێوان سپیپێستو ڕەشپێست ناگەیەنێت، گەرچی ڕژێمی کۆیلایەتی ڕەتـدەکـەنـەوەو پرۆتستۆی دەکـەن. ئەم بیرۆکەیە (واتـە بیرۆکەی یەکسانی نێوان سپیپێستو ڕەشپێست)، جارێ کاتی نەهاتبوو، بگرە لای فەیلەسوفانی سەدەی هەژدەهەم شتێکبوو بیری لێنکرابوەوە. هەرچەندە بەشی هەرە زۆری فەیلەسوفان سەرکۆنەو پرۆتستۆی ڕژێمی کۆیلایەتیان دەکرد، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان کۆمەڵێ لایەنی پۆزەتیڤیان تێدا بەدیدەکرد. لەوانە بۆ نمونە ڤۆڵتێرو مۆنتسیکیۆ، ڕاستە ئەو دوانە پێیانوابوو کۆڵۆنیالیزمو بازرگانیکردن بە کۆیلەوە، دوو شتن دژ بە عەقڵو یەکسانی مرۆڤایەتی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێیانوابوو ئەو دوو شتە، لە ئەوروپادا هۆکاری پێشکەوتنی مادیین. هەر ئەو پێشکەوتنەشە بـووە هۆی گەشانەوەی عەقڵو پاشەکشەکردنی عەقڵیەتی غەیبیانیو خورافی مەسیحی. لێرەوەیە مەسەلەکە جۆرێک لە دوفاقی وەردەگرێت.

وەلـێ هـەنـدێ فەیلەسوفی دیـکـە، بـە پاساوی ڕزگارکردنی گـەلان، لەگەڵ کۆڵۆنیالیزمدا بوون: واتە گوایە بە هۆی هێنانی گەلانی دواکەوتوو بۆ نـاو شارستانیەت، ڕەوایـەتـیـان بە کۆڵۆنیالیزم دەدا. پێویستە بزانین کە لامارتینو فیکتۆر هیگۆو جۆل ڤێریو تەنانەت لیۆن بلۆمی سۆشیالیزم، دەستخۆشیان لە پەیامی شارستانیەتی وڵاتەکانیان دەکردو بە پێویستیان دەزانی وڵاتەکەیان گەلانی (بەربەری) ڕزگاربکەنو بیانهێننە ناو شارستانیەتەوە. بەشێوەیەکی گشتی پێیانوابوو ئەوروپای شارستانی ڕۆشنگەر، مرۆڤایەتی تازەدەکاتەوە. جۆل ڤێری لەبەردەم پەرلەمانی فەرەنسی هاوار دەکاتو دەڵێ: (پێویستە زۆر بە ڕاشکاوانە بڵێین: ڕەچەڵەکە بەرزەکان بەرپرسیارەتی ڕەچەڵەکە نزمەکانیان دەکەوێتە ئەستۆ، پێویستە لەسەریان ڕەچەڵەکە نزمەکان گەشەپێبدەنو بەرزیانبکەنەوەو لە حاڵەتی بەربەریەتەوە بیانگوێزنەوە بۆ حاڵەتی شارستانییەت).

مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت، کۆڵۆنیالیزم لانی کەم گەورەترین خیانەتە بە رۆشنگەری. بەڵام وەک وتمان یەکەمین ڕۆشنگەری، کۆتایی بە دەمارگیری تائیفیو

دادگاکانی پشکنینی مەسیحی هێناو نەیدەتوانی لەوە زیاتر تێڕوانینە مرۆڤانەییە لێکبوردەکەی فراوانتر بکات، تاکو بۆ نمونە ڕەشپێستەکانیش بگرێتەوە. لەئێستادا کاتێ لەسەر ئەم مەسەلانە بیروڕای کۆمەڵێ لەو فەیلەسوفانە دەخەینەڕوو، هەندێ شت دەبینین کە دوچاری شۆکمان دەکاتو هەرگیز چاوەڕوانی شتی وانەبوین. بۆ نمونە مۆنتسکیۆ دەڵێ: (ئەوانەی قسەیان لەبارەوە دەکەین لە تەوقی سەریانەوە تاکو بنی پێیان ڕەشە، لوتیان بە ئەندازەیەک فشە کە ناکرێ خەفەتیان بۆ بخۆی یان سۆزت بۆیان هەبێتو بەزەیت پێیاندا بێتەوە. مەحاڵە لەوبڕوایەدابیت خەڵکانی لەو جۆرە مرۆڤ بن). هەرچی ڤۆڵتێرە ئاوا لەبارەیانەوە دەدەوێ: (چاویان دەرپەڕیوە، لوتیان فشە، لێویان هەمیشە ئەستورە، گوێیان جیاوازە، دەماغیان بچوکە، هەمو ئەو شتانە جیاوازییەکی گەورە دەخاتە نێوان ئەوانو مرۆڤەکانی دیکە. ئەم جیاوازییە ناگەڕێتەوە بۆ ژینگە گەرمەکەی ئەفریقا وەک ئەوەی واتێگەشتوین، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە ئەگەر ئەو قولەڕەشانەمان بەنێرو مێوە، لە ژینگە ئەسڵیەکەی خۆیانەوە گواستەوە بۆ وڵاتانی دیکەی سارد، ئەوا بەردەوامدەبن لەسەر بەرهەمهێنانی- لەدایکبونی- ئاژەڵی وەک خۆیان!).

تەنانەت کانت، پیاوە عاقڵو مەزنەکە، هەندێجار کەوتووەتە ناو داوی ئەحاکمی ڕەگەزپەرستییەوەو دەڵێ: (لەنێو ئەو هەزاران ئەفریقییەی گواسترانەوە بۆ دەرەوەی وڵاتەکانیان، یەک کەسی تێدانییە لە زانست یان لە هونەردا بلیمەت بێت. ئەمە بە پێچەوانەی سپیپێستەکانەوە، ئەگەر زۆر دوور بکەونەوەو بگوازرێنەوە بۆ دەرەوەی ژینگەی ئەسڵی خۆیان، کەچی هەر بە بلیمەتی دەمێننەوە). ئاشکرایە کانت ڕەشپێستەکانی لە خواری خوارەوەی هەڕەمی مرۆڤایەتی دادەناو جولەکەکانیشی بە تەڵەکەبازو جامباز وەسفدەکرد.

فیختەی قوتابی کانت، تا دواسنور ستایشی ڕەچەڵەکی ئەڵمانی دەکردو بە پوختە یان بە کرۆکی ڕەچەڵەکی سپی دادەنا: کرۆکی کرۆکەکان. ئەوەندە ڕەقی لە جولەکە بوو پێیوابووە قەدیس یۆحەنا گومانی هەبووە لەوەی مەسیح ئەسڵی جولەکە بێت. بەم شێوەیە بەشداربوو لە دروستکردنی ئەفسانەی مەسیحی ئاری یان لانی کەم مەسیحی ئەوروپی. مەسیح مەسیحێکی ئەوروپی قژ زەردە، نەک ڕۆژهەڵاتیەکی گەنمرەنگ!. «هیگڵ»یش لەوبڕوایەدا بووە ڕەچەڵەکە ڕەشەکان بەسروشتی خۆیان ڕەچەڵەکێکی نزمنو ناتوانن پێشبکەون، ئەویش وەک فیختە پێیوابوو ڕەچەڵەکی ئاری لە ڕەچەڵەکی سلاڤیو لاتینی بەرزترو شکۆمەندترەو زۆر بە توندی هێرشی کردوەتە سەر جولەکە. هەرچی ئینسایکلۆپیدیاکەی دیدرۆو دالامبێرە، ئەوا بانگەشی بۆ یەکسانی نێوان هەمو ڕەچەڵەکەکان دەکرد، داوای ڕەتکردنەوەی کۆیلەبونو کۆیلایەتی دەکرد. هەرچەند دیدرۆ حەزی لە بەرهەمەکانی بازرگانی کۆلۆنیالیزم بوو، وەک قاوەو چکلێتو شەکر، بەڵام ئەو بازرگانیکردنی بە کۆیلەوە بەتەواوی ڕەتدەکردەوەو لەبەرامبەر کۆلۆنیالیزمدا هەڵوێستێکی زۆر ڕوونو ئاشکرای هەبوو.

کۆمەڵێ حوکمی زۆر ناڕەوا بەرامبەر بە جولەکە هەیە، بەتایبەتی لای ڤۆڵتێر، بۆ نمونە ڤۆڵتێر دەڵێ: (چۆن گەلێکی سوکو ڕیسوای وەک ئەم گەلە لەسەر زەوی هەیە)، یان دەڵێ: (ئەگەر مێژوی جولەکەمان خوێندەوە کە لەلایەن مێژونوسێکی سەر بە گەلێکی دیکەی نەیاری جولەکە نوسرابێتەوە، ئەوا بڕوا بەو هەمو ناشرینو ئابڕوچونە ناکەین کە

خرواونەتە پاڵ ئەم گەلە. بەحاڵ بڕوا بەوە دەکەین ئەم گەلە بە فەرمانێکی ڕاستەوخۆ لە یەزدانەوە لە میسرەوە هاتوون، تاکو حەوت یان هەشت نەتەوەی بچوک لەناوبەرن کە پێشتر نەیان ناسیون. هاتوونو بێ بەزەییانە دەستیان کردووە بە کوشتنو سەربڕینی ژنـانو منداڵانو پیرو پەککەوتەکان، تەنها کچە گەنجەکانیان هێشتووەتەوە، ئەویش بۆ ڕابواردنی خۆیان. بە حاڵ بڕوا بەوە دەکەین کە ئەم گەلە لەلایەن خوداوەندەوە سزادراوە، چونکە تەنها یەک کەسی نەکوشتووە! کاتێ هەمو ئەو شتانە دەخوێنینەوە، ئەوا بڕوا بەوە ناکەین گەلێکی سوکو ڕیسوای وەک ئەم گەلە چۆنو بە چ شێوەیەک لەسەر زەوی هەیە. ئێمە وایدادەنێین ئەمە مێژونوسێکی نەیار نوسیویەتی تاکو ئابڕوویان بەرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی جولەکەکان هەمو ئەو شتانە لە کتێبە پیرۆزەکانیاندا، لەسەر خۆیان دەگێڕنەوە، ئەوا ناچارین بڕوایان پێبکەین). یـان دەڵــێ (جولەکە گەلێکی خورافەتخوازن، چاوچنۆکنو چاویان بڕیوەتە سەروەتوسامانی ئەوانی دیکە، بەربەرن). یان دەڵێ (جولەکە دوژمنی ڕەگـەزی مرۆڤایەتین). دواتـر ڕابـەری ڕۆشنگەری ئەوروپی بەراوردی نێوان عەرەبو جولەکە دەکاتو عـەرەب بە شایستەتر دادەنێتو دەڵــێ: (ئەگەر ئیسماعیلییەکان-واتە عەرەب- لە ڕووی هەڵچونو تینوێتی بۆ دزیو ڕاوەڕوت لە جولەکە بچن، ئەوا لە ڕووی ئازایەتیو دەستبڵاویو عیزەتی نەفسەوە لەوان باشترنو بەراورد ناکرێن. ئەمە لەکاتێکدایە ئێمە بەدرێژایی مێژوی گەلی عیبرانی هیچ نمونەیەک لەسەر دەستبڵاویو شەهامەت نابینین. ئەوان مانای میوانداریو دەستبڵاویو هاوسۆزیو لێکبوردەیی نازانن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە خۆشبەختیو کامەرانی هـەرە گـەورەی ئـەوان لەسەر وەرگرتنی ڕیبا لە بیانیەکانو ئیستغلالکردنیان تا دواسنور ڕاوەستاوە. ڕۆحی ڕیبا وەرگرتن لە قوڵایی ناخیاندا ڕەگیداکوتاوە، ئەمەش وەک دەزانین بنچینەی هەمو نامەردیو ترسنۆکیو نەفسنزمیەکە. هەمو نەمری ئەوان لە وێرانکردنو تاڵانکردنی ئەو دێهاتانەدایە کە بە ئاگرو ئاسن داگیریان کردووەو منداڵو پیریان سەربڕیوەو تەنها کچە گەنجەکانیان هێشتووەتەوە. ئەوان کاتێ کۆیلەنو دەرفەتیان بۆ هەڵدەکەوێت، سەردارەکانی خۆیان دەکوژنو هەرکاتێ بەهێزو سەرکەوتوو بوون، ئەوا هەرگیز مانای بەزەییو غەفران نازانن. ئەوان دوژمنی ڕەگەزی مرۆڤایەتین).

پێویست بە وتن ناکات ئەم گشتاندنە هەڵەیەو تەنها بەسەر جولەکە توندڕەو زایۆنیزمە دەمارگیرەکاندا پراکتیک دەکرێت. جولەکە لە هەمو بوارەکاندا ژمارەیەکی زۆر بلیمەتی پێشکەش بە شارستانیەتی مرۆڤایەتی کردووە. هەندێ ئەحکامی ڕەگەزپەرستی یان تائیفی پێشوەخت دژ بە موسڵمانەکانیش هەیە، ئەو ئەحکامانە کۆمەڵێ کلێشەی ئامادەکراوی هەڵەیەو تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان لەئارادایە. بۆ نمونە شاتوبریان شتێکی ئاوا دەڵێ: (ئیسلام بەدرێژایی ژیـان مـرۆڤـەکـان لـەسـەر نـەزانـیـنو چەقبەستن ناچاردەکات). ئەمیل زۆلا دەڵێ: (موسڵمانەکان بە سروشتیو لە جەوهەردا دەمارگیرن) (٤).

هەرچی ئارنست ڕێنانە ئـەوا لـەو بـاوەڕەدابـوو ڕەچەڵەکی سامی بۆ شارستانیەتو فەلسەفەو فیکری عەقڵانی نەخولقاوە. لێرەدا مەبەستی لە ڕەچەڵەکی سامی عەرەبە نەک تەنها جولەکە. ئەم جۆرە بڕوایە لەسەدەی نۆزدەهەمدا باوبووە. هەندێ ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی بۆ بەرهەمهێنانی شارستانیەت خولقاوەو هەندێ ڕەچەڵەکی دیکە بۆ شارستانیەت دەستنادەنو لەوانەیە ئەم جۆرە ڕەچەڵەکەیان

بەپێی تیۆرەکەی داروین: (مانەوە بۆ بەهێزەکان) لەناوچوبن. چونکە لەسەر ئەم گۆی زەوییە سودی ڕەچەڵەکی ناشارستانی چییە؟ لێرەدا زۆر لە هێتلەر دوورنین.

ئارنست ڕێنان سەبارەت بە ئیسلام دەڵێ: (ئیسلام بە ڕەهایی پێچەوانەی ئەوروپای شارستانیەتو داهێنانە. ئیسلام بریتییە لە دەمارگیرییەکی کوێرانە. ئیسلام بریتییە لە ڕقلێبونەوە لە زانستو ڕەتکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی. ئیسلام کورتکردنەوەیەکی ترسناکی ڕۆحی سامییەتە. ئیسلام دەماغی مرۆڤ بچوکدەکاتەوە و لەبەرامبەر هەمو بیرۆکەیەکی نەرمونیاندا دایدەخاتو دژ بە هەمو هەستوسۆزێکی ناسکە، دژ بە هەمو لێکۆڵینەوەیەکی عەقڵانییە، هەمو ئەوەش بۆ ئەوەیە لەبەردەم پرتەوبۆڵەیەکی ئەبدیدا دایبنێت کە لەم پەرەگرافەدا خۆیدەنوێنێ: خودا خودایە (٥)). پاشان دەڵێ: (ئیسلام بۆ عەقڵی مرۆڤایەتی هیچ نەبووە تەنها زەرەر نەبێت. ناڵێم لە هەمو ئاینەکانی دیکە فیکری ئازادی چەوساندوەتەوە، بەڵام لەهەموان چالاکتر بووە. ئیسلام ئەو وڵاتانەی کە تێیدا بڵاوبوەتەوە، کردووە بە ناوچەیەکی داخراو، ڕێگای لە هاتنی ڕۆشنبیرییەکی عەقڵانی ڕۆحی گرتووە).

بەڵام ئەوەی سەیروسەمەرەیە ئەوەیە ڕێنان ئەو قسانە دژ بە ئیسلام دەکات، کەچی لە شوێنێکی دیکەدا ئەم گوزارشتە سەرسامە بەرامبەر بە ئیسلام دەردەبڕێتو دەڵێ: (لە ژیانمدا هەر کاتێ چووبمە ناو مزگەوتێکەوە، ئەوا تەزویەکی ئیمانی بەجەستەمدا هاتووە، بگرە دڵگران بووم لەوەی موسڵمان نیم). ڕێنان دانیناوە بە مەزنیو گەورەیی شارستانیەتی ئیسلام لە ڕابردوداو جیهانی ڕوناککردوەتەوەو چەندین زاناو فەیلەسوفی گەورەی بەرهەمهێناوە کە لە ئەوروپادا مامۆستا بوون (٦). بەڵام لە هەمانکاتدا ناتوانێت خۆی لە کۆتوبەندی تیۆرەی ڕەگەزپەرستی ڕزگاربکات کە باڵی بەسەر سەدەی نۆزدەهەمدا کێشابوو. ئەو تیۆرەیەی دەڵێ ڕەگەزی ئەوروپی تەنها ڕەگەزێکە لە ڕووی فەلسەفیو شارستانییەتو داهێنانەوە! مۆرکی دووفاقی سەرسوڕهێنەری ئارنست ڕێنان ئالێرەدایە، لانی کەم سەبارەت بە عەرەبو موسڵمانەکان. هەرچۆنێک بێت ئەم خاڵە پێویستی بە قووڵبونەوەی زیاترە.

کەواتە سەیرنییە هێتلەر عەرەبو جولەکەو قولەڕەشو قەرەچی لە کۆتایی هەڕەمی پۆلێنکردنی ڕەگەزی مرۆڤەکاندا داناوەو لەسەروی هەرەمەکەوە ڕەگەزی ئاری ئەڵمانی داناوە. لێرەوە ئایا هێتلەر ڕاستەوخۆ قوتابییەکی فیختە بووە؟ ئەمە هەرگیز مانای ئەوە نییە ئێمە تاوانبارێکی بەناوبانگی وەک هێتلەر، یەکسان دەکەین بە فەیلەسوفە گەورەکان کە لێرەدا ناویان هاتووە، لەوانەش ڕێنان. هیچ بوارێک بۆ بەراوردکردن نییە!

جگە لەوە پێویستە هەمو ئەو نمونانە لە چوارچێوەی ڕەوتی مێژویی خۆیاندا، پێش دووسەد ساڵ یان تۆزێک زیاتر، دابنێین. ئەمەش بۆ ئەوەیە بیروڕا ئازادەکانی ئەمڕۆمان بەسەر ئەو نوسەرانەدا نەسەپێنین. چونکە ئەگەر وامانکرد ئەوا زوڵم لە هەندێ لە گرنگترین فەیلەسوفانی مێژوی مرۆڤایەتی دەکەین، ئەمە لەلایەک. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، هەنوکە یەک بیرمەندی ئەوروپی چییە نادۆزیتەوە هەڵگری ئەو بیرۆکە دزێوەبێت بۆ گەلانی ڕەشپێست، مەگەر سەر بە ڕەوتی ڕاستڕەوی توندڕەو یان نازی بێت. بگرە تەنانەت خەڵکە سادەوخاکییەکی ئەوروپا، ئەو جۆرە بیرۆکانە ڕەتدەکەنەوە، ئیدی دەبێ ڕۆشنبیرەکان چۆن بن؟

زۆرجار لە شەقامەکانی پاریس یان لەندەن یاخود لە پایتەختەکانی دیکەی ئەوروپادا، ئەوروپییەکی قژ زەرد لە باوەشی قولەڕەشێکی ئەفریقیدا دەبینی. ئەمە لە سەدەی نۆزدەهەمدا شتێکی مەحاڵ بوو. با بۆ ساتێک بیر لە ئابڕوچونە گەورەکەی بۆدلێر بکەینەوە کاتێ شەیدای «جان دۆڤـال»ی کۆیلە بوو. پێکەوە بەنازوفیزەوە بە شەقامەکانی پاریسدا دەهاتنودەچونو هیچ حسابێکیان بۆ بۆرجوازیەتی فەرەنسی نەدەکردو چێژیان لە سوتاندنی ئەعسابی بۆرجوازیەکان وەردەگرت. سوپاس بۆ بۆدلێر! بەڵام هەمو کەسێ وەک بۆدلێر شێت نەبوو: مەبەستم ئەوانەیە کە زۆر پێش زەمەنی خۆیان دەکەون.
لێرەدا جیاوازی نێوان ڕۆشنگەری یەکەمو ڕۆشنگەری دووەم دەبینین، ئەوەی ڕۆشنگەری یەکەم نەیتوانی بەدیبێنێت، ڕۆشنگەری دووەم توانی بەدیبێنێتو هەنگاوێکی زیاتر بە ئاراستەی ڕزگاربوونو ئاقاری مرۆڤانەدا چووەپێش. ئەگەر ڕۆشنگەری دووەم نەبوایە، ئەوا هەرگیز پیاوێکی ڕەشپێستی وەک بارک ئۆباما نەدەچووە سەر تەختی کۆشکی سپی. بەم شێوەیە دەبینین کە جەنگی ڕۆشنگەری جەنگێکی دووردرێـــژ، ئـاڵـۆزەو تەنها بـە چەند قۆناغێک یەکلایی دەکرێتەوە. لێرەوە ناکرێ داوا لە کۆمەڵگا عەرەبییەکانمان بکەین لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا، پرنسیپەکانی ڕۆشنگەری ئاینیو فەلسەفی بەدیبهێنن. ئەمە شتێکە لەم بارودۆخە زۆر قورسو دژوارو پڕ کێشەیەی ئێستادا، لە تواناو وزەی ئەودا نییە. دەکـرێ بڵێین ئەگەر کێشەی فەلەستین بەشێوەیەکی دادپەروەرانە یان نیمچە دادپەروەرانە چارەسەر نەکرێت، ئەوا ئایدۆلۆژیای فێندەمێنیتاڵیزم تا ماوەیەکی دیکەی نەزانراو بەسەر فەلسەفەی ڕۆشنگەریدا سەرکەوتودەبێت. ئەمە سەرباری نەخوێندەواریو هــەژاری کوشندەو دواکەوتویی کە توێژێکی بەرفراوانی دانیشتوان بەدەستیەوە دەناڵێنن. ئەمە با جەنگە ناوخۆییو مەزهەبیو تائیفییەکان لەولاوە بوەستێ کە بەرپابووەو هەنووکە زۆربەی وڵاتانمانی گرتووەتەوەو هەڕەشە لە یەکێتییە ناوەکییەکەی دەکات.
هەمو ئەوانە فاکتەری نێگەتیڤنو وادەکەن فیکری ڕۆشنگەری، دەربارەی کەلتورو دین، لە قوڵایی ناخی جەماوەردا بڵاونەبێتەوە. لەبەر ئەم هۆیەیە زۆربەی خەڵک، بە دڵسۆزی بۆ پیاوانی ئاینیو کەناڵە ئاسمانییە فێندەمێنیتاڵیزمەکان دەمێننەوە کە بەردەوام فیکری دەمارگیری تائیفیو فەتوا فەقهییە کۆنەکان پەخشدەکەن. وتم (کۆنەکان) بەڵام تا ئێستا یەک زەڕە لە ڕەوایەتیان وننەکردووە. بگرە بە پێچەوانەوە وەک شتێکی پیرۆزو خودایانەبێت خۆی بەسەر جەماوەردا سەپاندووە. ئەگەر ڕۆشنگەری سەربکەوتایە، ئەوا ئەو دەمارگیرییە تایفییەو ئەو فەتوایانەی سەدەکانی ناوەڕاستی لەناودەبرد، یان لانی کەم زۆر لاواز دەبوون.
پێویست ناکات باسی ئـەوە بکەین کە ستەمی سیاسی/ پۆلیسیو حومکڕانی یەک حیزبو یەک ڕۆژنامە، هاوکارن لەم داخرانە مێژوییە کە چەندین دەیەیە تێیدا دەژین، ئەگەر چەندین سەدە نەبێت کە دواجار بووە هۆی ڕودانی ئەم تەقینەوە گەورەیە.

## پەراوێزەکان

١-تەماشای کتێبەکەی لۆک ڤێری بکە، ڕۆشنبیری نانمونەیی، یاداشتو فیکر، لە بڵاوکراوەکانی دۆنیل پاریس، ٢٠١١ لاپـەڕە ٢٥٤، کتێبەکە بریتییە لە زنجیرەیەک چاوپێکەوتنی بەردەوام لەگەڵ خانمی توێژەر ئەلکسەندرا لینییل- لافاستین.

٢-لە سەدەی هەژدەهەمدا پێیانوابوو چارەنوسی مرۆڤایەتی لەسەر ئەو بنەمایەی کە وردە وردە بەرەوپێشەوە دەڕوات، هەڵچنراوە. فەیلەسوفەکان لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا هاوزەمان لەگەڵ ئایدۆلۆژیای پێشکەوتن کە جۆرێک لەخۆشباوەڕی تێدابوو، پێیانوابوو ڕێڕەوی دووردرێژی مرۆڤایەتی لە قۆناغی بەربەریەتەوە تاکو قۆناغی شارستانیەت، ڕێڕەوێکە هەمیشە بەرەوپێشەوە چووە. ئەوان چیتر وەک بونەوەرێکی کەڕو کوێر کە هیچ تێناگات تەماشای بەربەرە دڕندەکانیان نەدەکرد، بەڵکو وەک مرۆڤێکی دواکەوتوو تەماشایان دەکردن کە لە تواناییاندا هەیە هەندێ پیشەو کار فێرببن. بێگومان مرۆڤی سەرەتا هەمیشە چ لەلایەن «بۆفۆن»ی زاناو چ لەلایەن «ڤۆڵتێر»ی فەیلەسوفەوە ڕیسواکرابوون. بەڵام بە تەواوی هیوابڕاو نەبون لێیانو لەوبڕوایەدابوون دەکرێ باشتربن. لە دەرئەنجامدا گوتاری فەلسەفی سەردەمی ڕۆشنگەری، ڕاڤەی چۆنیەتی باشترکردنی مرۆڤی سەرەتاییو چۆنیەتی ڕایکردنی کاروبارەکانیان بەشێوەیەکی باشتر دەکرد، بگرە ڕاڤەی چۆنیەتی کۆنترۆڵکردنیانی دەکرد. بەڵام لە هەمانکاتدا بانگەشەی کۆلۆنیالیزمێکیان دەکرد لە ڕێگەی ڕێزگرتنی یاساوە زیاتر دادپەروەرانەو مرۆڤدۆستانە بێت.

تەماشای بەشی یەکەمی کتێبی خانمی توێژەری فەرەنسی ستیفانی کۆدیرک-مۆراندۆ بکە: فەلسەفەی کۆماریو کۆلۆنیالیزم، لەبڵاوکراوەکانی لارماتان، ٢٠٠٨.

٣-بۆ زیاتر ئاگاداربوون لەسەر ئەم بابەتە، دەکرێ پەنا ببرێتە بەر ئەم سەرچاوەیەی ئیف بینۆی توێژەر کە تەمەنی خۆی لە لێکهەڵوەشاندنەوەی ئایدۆلۆژیای کۆلۆنیالیزم بەسەربردووە: ڕۆشنگەری، سیستمی کۆیلایەتی، کۆلۆنیالیزم، لە بڵاوکراوەکانی لادیکۆڤێرت ٢٠٠٣.

٤-خوێنەر دەتوانێ هەمو ئەو نمونانە بە ئاسانی لە ئەنتەرنێتەوە بدۆزێتەوە. ئەوەی تایبەتە بە ڤۆڵتێرو مەسەلەی جولەکە لە هەردوو کتێبەکەی: وتارەکان دەربارەی ئەخلاقو ڕۆحی نەتەوەکان، فەرهەنگی فەلسەفی مادەی جولەکە یان جولەکەبوون، وەرگیراون. بەڵام ئەوەی تایبەتە بە سوک تەماشاکردنی ئیسلامو موسڵمانان، ئەوا پێویستە بە ئەمانەتەوە ئەوە بڵێین کە گەورە بیرمەندو ئەدیبەکانی ئەوروپا، وەک شاتوبریانو ئەمیل زۆلاو ئەوانی دیکە، لە قوڵایی ناخیاندا خراپ نەبوون. بەڵام کاتێ ئەوروپییەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا عەرەبو ئیسلامیان دۆزییەوە، ئێمە عەیامێک بوو چوبوینە سەردەمی پاشەکشەکردنەوە. لێرەوە ئەوان ئێمەیان نەدەناسی کاتێ خاوەنی شارستانیەتێکی مەزن بوینو پرشنگی بەسەر جیهاندا بڵاوبووەوە. بەڵکو ئەوان کاتێ ئێمەیان ناسی کە ماڵئاوایمان لە شارستانیەت کردو چەقمانبەستو دامرکاینەوە. ئەمەیە تا ڕادەیەکی زۆر ڕاڤەی ئەو ئەحکامە نێگەتیڤو کلێشە باوانە دەکات کەلەسەر ئێمە هەیانە.

٥-تەماشای گوتارەکەی لە کۆلیج دی فرانس ساڵی ١٨٦٢ بکە کە لە کتێبەکەی: گوتارەکانو لێکچەرەکان دا هەیە، پاریس، ٢٠١٠ چاپی تازە.

٦-تەماشای لێکچەرە بەناوبانگەکەی دەربارەی ئیسلامو زانست لە سۆربۆنو لە ساڵی ١٨٨٣ بکە کە دواتر جەمالەدینی ئەفگانی وەڵامی دایەوە. ئەو لێکچەرە بەم دواییانەو لە چاپێکی تازەدا بڵاوکرایەوەو پێشەکییەکی فرانسوا زبالی توێژەری لەخۆگرتووە.

سەرچاوە: الاوان، ١٢ تشرینی یەکەم، ٢٠١١

# فەلسەفەی هیچگەرایی (nihilisms)

نووسینی: د.مەلیك یەحیا سەلاحی
و. لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

نیهێل (Nihil) لە زاراوەو زمانی یۆنایدا بەمانای (هیچ)و (رەتکردنەوەی کار)ە .بەشێوەیەکی گشتی مەبەست لە هیچگەرایی، قوتابخانە و تێزێکی فکرییە کە نکۆڵی لە هەر جۆرە مەعریفە، بەها یاخود بوونێک دەکات. لایەنگرانی ئەم قوتابخانە هزرییە، هەر جۆرە بیروباوەڕ و بڕوایەک بە پوچ دەزانن و بە سوکییەوە دەڕواننە گشت بڕیار و دابونەریتەکان، هەربۆیەشە بە هیچگەرایی یاخود سستگەرایی ناسراون.

ئەم بیروباوەڕە لە سەدەی نۆزدەهەم لە ڕووسیای تزاریدا بایەخی پەیدا کرد.

**چەمکی هیچگەرایی لە دەیەی شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕووسیا، هاوسات دەربارەی ئانارشیستەکان و تیرۆریستەکانیش بەکاردەهێنرا. بۆ نمونە لە ناسراوترین ئانارشیستەکانی ئەو سەردەمەی ڕووسیا کە بە هیچگەرا ناسرا بوون، دەکرێ ناوی (میخائیل باکۆنین) بهێنرێت. باکۆنین لە ئەنارشیستە پراگماتیستەکان بوو، چەندینجار بە سزای لە سێدارەدان و سەرەنجام بە زیندانی هەمیشەیی سزا درا، بەڵام لە کۆتایدا ئازاد کرا.**



میخائیل باکۆنین

ئامانجە سەرەکییەکەی لەناوبردن و سڕینەوەی گشت ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و حکومییەکان بوو، ئەگەرچی پشتگیرییان لە خودپەرستی و دروستکردنی ترس و تۆقاندنیش دەکرد بەڵام ئەلتەرناتیڤیشیان لە بەرامبەر نکۆڵیکردنی هەموو شتەکان لە جیهاندا نەدەخستەڕوو.

هەروەها چەمکی هیچگەرایی لە دەیەی شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕووسیا، هاوسات دەربارەی ئانارشیستەکان و تیرۆریستەکانیش بەکاردەهێنرا. بۆ نمونە لە ناسراوترین ئانارشیستەکانی ئەو سەردەمەی ڕووسیا کە بە هیچگەرا ناسرا بوون، دەکرێ ناوی (میخائیل باکۆنین) بهێنرێت. باکۆنین لە ئەنارشیستە پراگماتیستەکان بوو، چەندینجار بە سزای لە سێدارەدان و سەرەنجام بە زیندانی هەمیشەیی سزا درا، بەڵام لە کۆتایدا ئازاد کرا. گرنگترین کار لە تێڕوانینی ئەوەوە پڕوپاگەندەی ئەنتی ئایینی، لەناوبردنی دەوڵـەت و شۆڕشو هەڵچوون بوو لەبری هەر کارێکی سیاسی تر.

زاراوەی هیچگەرایی یەکەمینجار بە مانای میتۆدێکی ڕەخنەیی- نکۆڵیکاریی دەربـارەی ڕیککەوتنامە و دابونەرێتە کۆمەڵایەتییەکان لە کتێبی (باوکان و کـوڕان)ی بەرهەمی نووسەری ڕووسـی (ئیڤان تۆرگنیف)دا بەشێوەیەکی هەست پێکراو بەکارهێنرا. تۆرگنیف لـەم کتێبەدا کە بـەشـێـوەی ڕۆمـان نووسیویەتی، دەیەوێ وێنای مرۆڤ و دونیابینیەکانی بکات کە مشتومڕی نێوان دوو نەوە واتا باوکو

کوڕ لەخۆدەگرێت. باوک کە ساڵانێکی لە تەمەنی خۆی ڕابـواردووە و ئەزموونەکانی لە چوارچێوەی دابونەریتەکانی کۆمەڵگادا فێربووە، سەرزەنشتی کوڕەکەی دەکات کە بۆچی لە ڕێگای ڕاست لادەدات و ژیانی باش لە تێڕوانینی خۆی دووردەخاتەوە، لە کاتێکدا کوڕەکەی بیروباوەڕەکانی باوکی بە کۆن و وابەستەی نەوەی ڕابردووی دەزانێت.

بەهەرحاڵ تۆرگنیف دەگاتە ئەم دەرەنجامەی کە تەواوی ڕێساکان، دابو نەریتەکان، دەوڵەت و حکومەت و هەر کام لەو شتانەی هەن بە ئامرازی ناچارکردنو بەدبەختکردنی مرۆڤ کۆتایی دێت. دابونەریتە کۆنەکان مرۆڤی کۆتو بەند کـردووە، لەکاتێکدا ژیانی مرۆڤ کورتە و بەخێرایی بەرەو تەواوبوون دەچێت. یاخود دەتوانین بڵێین: «مرۆڤەکان وەک گیانلەبەرێکی بێئیرادە تەنها پەیڕەوییان لە دابو نەریتەکان کردووە و دەستیان لە چارەنووسی خۆیاندا نییە».

هـەروەک وتـرا، نیهێلیزم بە هیچگەرایی ناسراوە کەواتە سەیر نییە کاتێ هیچ نووسەر یاخود بیرمەند و فەیلەسوفێک ڕاستەوخۆ ئامادە نەبێ خۆی بە هیچگەرا نـاوزەد بکات، لەم ڕووەوە بنیاتنەران و پەیڕەوانی ئەم تێزە خۆیان وەک تیۆریزانانی نیهیلیزم ناناسێنن، بەڵکو بە بڕوای شرۆڤەکاران لە ناواخنی بیروباوەڕەکانیاندا، وەک ئاراستەکەر یاخود بە پشتیوانی نیهێلیزم ناوزەدیان دەکەن.

ئەم بیروباوەڕە واتا ڕەتکردنەوە و نکۆڵی کردنی هەموو شتێک، لە سەدەی پێنجەمی بەرلە زایینی لە بیروباوەڕەکانی (کلبیۆن)یشدا دەبینرێت، کەواتە نهێلیزم تێگەیشتنێکی تائەندازەیەک دێرینە.

وێڕای ئەمانەش، دەبێ سەرنج لەوە بدرێ قوتابخانە و هزرە سیاسییەکان  بە گشتی هەندێ بیروبۆچوون لەمەڕ کێشەکانی تاک و کۆمەڵگا بەرهەم دێنن، تـەنـانـەت لـە کـات و شوێنی خـۆیـان بـە شێوە تایبەتەکەی خۆیان هاتوونەتە ئـاراوە، هەربۆیە زۆربەی ئەم قوتابخانانە کە لە ڕیزبەندییەکی نزیک بە یەکتردان، لە ڕوانگەی ناوەرۆک و ئامانجەوە، خاڵی هاوبەشی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەیە هەروەک چۆن خزمایەتی و نزیکایەتییەکی زۆر لە نێوان ئەنارشیزم، مارکسیزم و نیهێلیزمدا دەبینرێت. لەم ڕووەوە هەندێکجار فەیلەسوفێکی دیاریکراو ڕەنگە بچێتە سنوری قوتابخانەی جۆربەجۆرەوە. بۆ نمونە نیچە هەم لە چوارچێوەی بیرمەندانی چەرخی ڕۆمانتیک و هەم وەک نیهێلیستێک دەخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە.

بەهەرحاڵ یەکێک لە ناسراوترین ئەو فەیلەسوفانەی بیروباوەڕەکانی لە چوارچێوەی نیهێلیزمدا ئەنالیزە دەکرێت، نیچەیە. نیچە لە ساڵی (١٨٤٤) لە گوندێکی بچوک بە ناوی (ڕۆکین) لە ناوچەی (لۆتزن) کە خۆی شارێکی بچوک بوو لە نزیک (لایپزیک)ەوە، لە خێزانێکی ئایینی و لە پەیڕەوانی لۆتەردا لە دایک

بوو. بە منداڵی باوکی لە دەست داوە و نیچە زۆرینەی تەمەنی لە ئازاری مێشک و سەرئێشەی بەردەوامدا بەسەربرد، دوای مردنی باوکی، لەگەڵ دایکیدا کە سەرپەرشتی نیچەی لە ئەستۆدابوو، کۆچی بۆ شاری نۆرنبێرگ لە باشوری ئەڵمانیا کرد.
نیچە خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە هەمان شاردا تەواو کرد، بۆ خوێندنی زانکۆ چووە شاری بۆن و لە کۆلیژی زماننناسی و ئەدەبیاتدا دەستی بەخوێندن کرد. بەر لە بەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا لە زانکۆی (بازل) لە سویسرا، وانەوتنەوەی زمانناسیان پێ سپارد. ماوەیەک دوای بەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا، بوو بە وانەبێژی سەربەخۆ.
لە لایپزیک، لەگەڵ بەرهەمەکانی شۆپنهاوەردا ئاشنابوو و بووە شەیدای بیروباوەڕەکانی. ئاشنابوونی بە شۆپنهاوەر و ڤاگنەری موزیکزانی بەناوبانگ و ناسیۆنالیستی ئەڵمانی، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر نیچە دانا.
کاریگەری شۆپنهاوەر لەسەر نیچە، بووەمایەی ئەوەی کە بیرۆکە و هزر بخاتە پێش ئیرادەوە. نیچە لە ناسراوترین ڕەخنەگرانی ئەخلاقی نەریتییە و خوازیاری ئاشکراکردنی هەرجۆرە هەڵەیەکی خودە لەلایەن تاکەوە، لەم ڕووەشـــەوە لە چوارچێوەی پەیڕەوانی نیهێلیزمدا دادەنرێت.
بیروباوەڕەکانی نیچە زانستین لەهەمانکاتدا پڕە لە جۆش و خرۆش و هەست و ئامانجگەرایی، ئەمەش هەر لە


نیچە

**یەکێك لە ناسراوترین ئەو فەیلەسوفانەی بیروباوەڕەکانی لە چوارچێوەی نیهێلیزمدا ئەنالیزە دەکرێت، نیچەیە. نیچە لە ساڵی (١٨٤٤) لە گوندێکی بچوك بە ناوی (ڕۆکین) لە ناوچەی (لۆتزن) کە خۆی شارێکی بچوك بوو لە نزیك (لایپزیك)ەوە، لە خێزانێکی ئایینی و لە پەیڕەوانی لۆتەردا لە دایك بوو. بە منداڵی باوکی لە دەست داوە و نیچە زۆرینەی تەمەنی لە ئازاری مێشكو سەرئێشەی بەردەوامدا بەسەربرد، دوای مردنی باوکی، لەگەڵا دایکیدا کە سەرپەرشتی نیچەی لە ئەستۆدابوو، کۆچی بۆ شاری نۆرنبێرگ لە باشوری ئەڵمانیا کرد**

فەیلەسوفێکی ڕۆمانتیک چاوەڕێ دەکرێت. ئەگەرچی نیچە ڕەخنە لە ڕۆمانتیکەکان دەگرێت، لەگەڵا ئەوەشدا لە دەرەوەی ئەو سنورە هزرییەدا نییە. لە خودی ئەفلاتون زیاتر ئینتیمای بۆ بیروباوەڕ و فەلسەفەکانی یۆنانی بەرلە ئەفلاتوون نیشان داوە. ستایشی یەکگرتنی ناکۆکییەکانی هیراکلیتۆسو جەنگو دادوەرییەکەی دەکات، ئەگەرچی هیگڵیش دەخاتە ژێر ڕەخنەوە. لەگەڵا ئەوەشدا شەیدای بیروباوەڕەکانی شۆپنهاوەر و سیستەمو ناسیۆنالیسزمی ڤاگنەرە، بەڵام دوای ماوەیەک ڕوو لە ئەوانیش وەردەگێڕێ.


شۆپنهاوەر

لە تەواوی نووسینەکانی نیچەدا دوو بواری پڕ لە بەهای ناکۆک لە هرز و بیرکردنەوەکانی ئەودا شوێنی خۆی کردۆتەوەو پێکەوەگرێدراون، ئەگەرچی لەگەڵ یەکتریشدا ناتەبان. بەمانایەکیتر لەکاتێکدا کە فەلسەفە، هونەرو ئەدەبیاتی خۆش دەوێت، بەڵام ستایشی هێز و جەنگو ئەرستۆکراتییەت دەکاتو پیاوەزلەکان بە مەزن دەژمێرێت. نیچە کەسانی لاواز بە ملکەچو تەسلیمبووی دەسەڵاتدارانیان دادەنێت کە لە مۆدێلی (پارەتوو) و (ڕۆبەرت میشیلز)دا بە چینی عەوام ناودەبرێن.

نیچە لە ڕۆما ئاشنای کچێکی بە ڕەچەڵەک رووسی دەبێت کە خوازیاری هاوسەرێتی بوو لەگەڵیدا، بەڵام کاتێک کە وەڵامی (نا)ی وەرگرتەوە، کاریگەرییەکی

**کاریگەری شۆپنهاوەر لەسەر نیچە، بووەمایەی ئەوەی کە بیرۆکە و هزر بخاتە پێش ئیرادەوە. نیچە لە ناسراوترین ڕەخنەگرانی ئەخلاقی نەریتییە و خوازیاری ئاشکراکردنی هەرجۆرە هەڵەیەکی خودە لەلایەن تاکەوە، لەم ڕووەشەوە لە چوارچێوەی پەیڕەوانی نیهێلیزمدا دادەنرێت**

نیگەتیڤانەی توند لەسەر نێچە دادەنێت. سەرجەم ئەم ڕووداوانە، بیروباوەڕەکانی نیچە دەکاتە ناتەبا و نیگەتیڤ.

نیچە بەپێچەوانەی لێکۆڵیارانیتری نیهێلیستییەوە، فەیلەسوفێکی زماناس و ئەنترۆپۆلۆژیست و لە هەمووی گرنگتر مامۆستایەکی زانکۆی خاوەن توانستی بەرفراوانی توێژینەوە بوو، هەربۆیەشە نووسینەکانی ناوبراو کە سەرتاسەری ژیانە زانستییەکەشی لەخۆدەگرێت، خاوەنی ڕەهەندێکی زۆرە. نیچە، ئازادیی بیرکردنەوە و کارکردنی لە چەقی قورسایی بیرکردنەوە و مۆدیلەکەی خۆیدایە.

نیچە هەردوو چەمکی (چاکە) و (خراپە) وەک دوو هێزی بزوێنەر لە مێژوودا دادەنێت کە سەرەنجام خراپە دەخاتە پێش چاکەوە. لە کتێبی (لەدایکبوونی تراژیدی لە رۆحی موزیک)دا کە لە ساڵی (١٨٧٢) بڵاوی کردەوە، تیۆری روانگەی رەشبینیانەی خۆی بۆ تراژیدیای مەسیحییەتی کلاسیک و ڕەخنەکانی خۆی لەوبارەیەوە خستەڕوو، ئەم تیۆرەش لە ژینگەی ئەکادیمیدا بە ساردی پێشوازی لێکرا.

لە کتێبی (وەهای گوت زەردەشت) بەشێوەی نیمچە (خوازە)و (شیعر)دا، کۆیلایەتی ئاکار (ئەخلاق) ی مەسیح لەهەمبەر ئاکارسەروەری و مەزنێتیدا دادەنێت، ڕەخنە لە مەسیحییەتی کلاسیک دەگرێت و وێنای ئەرکی پیاوە مەزنەکان دەکات لە دەرەوەی سەردەمەکەی ئەودایە.

لە تێڕوانینی نیچەوە، نیهێلیزم ئامرازێکی دابەش دابەشکەرە، ڕووداوێکی مێژووییە کە بێ بەها بوونی سەرجەم بەهاکانی بەدواوەیە.

بەهەرحاڵ فەلسەفە و ئەدەبیاتی نێچە لە سەدەی بیستەمدا، کاریگەرییەکی زۆری لە دوای خۆی جێهێشت. بەجۆرێک کە ناسیۆنال سۆشیالیستەکان سودی نیگەتیڤانەیان لە شیعر و نووسینەکانی وەرگرت، چەمکی پیاوە مەزنەکانی ئەویان لە بەرگی ڕێبەر (پێشەوا)دا بەرجەستەکرد.

ئەمڕۆ نیچە وەک یەکێک لە گرنگترین شایەتحاڵانو لێکۆڵیارانی مرۆڤی مۆدێرن بەشێوە نوێیەکەی خۆی ناودەبرێت. هایدگەریش نیهێلیزمی خۆرئاوا کە بۆتەهۆی بەرفراوانبوونو گەشەی خودفەرامۆشی لە فەلسەفەدا، دەیگێڕێتەوە بۆ سەردەمی سوقرات. ترۆپکی گەشەکردنی نهێلیزمیش لە فەلسەفەی نیچەدا بەرجەستەبووە. هەروەها دەبێ ژان پۆڵ سارتەری بیرمەند و بوونگەرای فەرەنسیش، بە یەکێک لە پەرەپێدەرانی جۆرە نیهێلیزمێکی قارەمانێتی دابنرێت.

سەرچاوە: دکتر ملک یحیی سلاحی: اندیشەهای سیاسی غرب در قرن بیستم. چاپ اول، ١٣٨١، ل (١٦٩-١٧٣)

# ئەدەب و سێکس



* نووسینە شەرم هێنەرەکان..
* نوسینی ئەدەبی لەسەر سێکس..
* سێکس لە شیعرە..
* لا مایا
* فەمەنیزم و..

# نووسینە شەرم هێنەرەکان و گەنجینەی ئەدەبی

کارل ئیدن بۆرگ(Carl – Michael Edenborg)
و.لەفارسییەوە: مستەفا زاهیدی

تەمەنی مێژووی ئەدەب یەکسانە بە تەمەنی مێژووی ئیرۆتیسم. سەردەمی رۆمانتیک پڕە لەو نووسراوە و شیعرە عاشقانانە –بە شتە رووتە رەشۆکی و رۆژانەکان یان بێ ئەو شتانە–. بەرهەمی ئیرۆتیسم تایبەت نیە بە کۆمەڵگایەکی تایبەت. لە شێوەکاری سەر دیوارەکان و شیعرە نووسراوەکان لە سەر دیوارەکانی کاتۆلۆسی رۆمی و شارستانییەتە گەورەکانیترەوە بگرە تا دەگاتە "ئاورەنگ"ی ژاپۆنی دژ بە ئەخلاق، هەموویان بەڵگەن بۆ ئیرۆتیسمی ئەدەبی. پیەتێرۆ ئارتینۆس (Pietro Aretine) یەکەم پۆرنۆگرافی ئەورووپایی سەردەمی


پیەتیرۆ ئارتینۆس

**پیەتیرۆ ئارتینۆس(Pietro Aretine) یەکەم پۆرنۆگرافی ئەورووپایی سەردەمی ڕێنسانس(١٥٠٠)بوو. پیەتیرۆ ئارتینۆس بە "قەمچی وەشێنی گەورە" ناوی دەرکردووە.**

ڕێنسانس (١٥٠٠)بوو. پیەتیرۆ ئارتینۆس بە "قەمچی وەشێنی گەورە" ناوی دەرکردووە. بەڵام ئیرۆتیسمی ئەورووپا لە نیوەی دووهەمی سـەدەی هـەژدە بە نووسەرانێکی وەک (ڕێستێف دێ لابریتۆن)(Restif de la Bretonne)، (مارکێس دێ ساد)(Markis de Sade) و (ئەی.ئاڕ.ئەی.دێ. نێدسیا)(ARA de Nerciat)،و لە وڵاتی سوید (سی.ئەی. ئێرێن)(CA Ehren)ی شێوەکار بە لوتکە گەیشت. سەدەی ڕابردوو هەڵگری شەپۆلی دووەمی ئەدەبی ئیرۆتیسم بوو لە ئەورووپا. بۆ وێنە لە وڵاتی ئەڵمانیا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا ژمارەیەکی زۆر کتێبی ئیرۆتیک کەوتە بازاڕ. ساڵی ١٩٦٠ ساڵێک بوو کە ئەدەبی ئیرۆتیسمی زۆر برەوی هەبوو و ساڵێک بوو بەربەستە شەرعی و یاساییەکان تێکشکان و سەرەنجام ساڵێک بوو ئیرۆتیسمی ئەدەبیات دانی پێدا نرا. ساڵی ١٩٦٥ ناوەندێکی بچووکی چاپ و بڵاوکردنەوە بە بڵاوکردنەوەی وەرگێڕانی ئیرۆتیک پەرژایە سەر ئەدەبی ئیرۆتیک.

ئیرۆتیسمی ئەدەبی تەنها ئەوە نییە بپەرژێتە سەر دەقە سێکسی و چێژبەخشەکان.

"سـەرگـەرمـی" ڕەنـگـە لایەنێک بێت لـە لایەنە جیاوازەکانی ئەم بەرهەمانە. ئەو بەرهەمانە بە باس کردن لە پرسە کۆمەڵایەتییەکان زانیارییان بە خوێنەر دەبەخشی. هەندێکجار دەبن بە هۆی بەهێزبوونی سیستەمی پیاوسالاری و بە تەواوی دژە ژنن. هەندێکجار نۆرم و تابۆکان دەشکێنن و

بەمشێوەیە سیستەمی سەرکوتکەری باو دەشکێنن. هەندێ جار کۆنسێرڤات و هەندێ جار رادیکاڵ و هەندێک جار ئاوێتەیەکن لەم دوانە.

کتێبخانەکان بۆ رێزگرتن لە شوێن و پێگەی خۆیان، دەبوایە ئارشیڤی ئەدەبی ئیرۆتیسمیان هەبا. لە ناو ئەو کتێبخانە کۆنانەدا کە خاوەنی بەشی ئەدەبی ئیرۆتیسمن دەتوانین ئاماژە بە LEnfer بدەین لە کتێبخانەی نەتەوەیی پاریس، بەریتانیا PRIVATE CASE و کۆپنهاک. کتێبخانەی ناوەندی سویدGemme تا ساڵی ١٩٣٧ بەشی ئەدەبی ئیرۆتیسمی نەبوو. مانگی مای ١٩٣٧ ئەم کەمایەسییە شەرمهێنەرە بە کردنەوەی بەشی تایبەت بە ئەدەبی ئیرۆتیسم نەما. ئۆسکار بۆری ستۆرم (١٨٧٧-١٩٤٥) بە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە بەرهەمی ئیرۆتیسم لە هەموو دونیا لە ساڵی ١٥٠٠ بەدواوە، لە ١٣١٢ بەرگدا نزیک بە ٤٢ رەفەی ئەم کتێبخانەیەی تایبەت کرد بە خۆی. بۆرگ سترۆم جگە لەم کۆمەڵە ( شتەکان و بەرهەمی ئیرۆتیک) ی زۆری پێشکەش بە مۆزەی نەتەوەیی سوید کرد. هەڵسووکەوتی ئێمە و جۆری رووبەڕوو بوونەوەمان لە گەڵ ئیرۆتیسم لە ئێستادا هەر وەک پێشتر وایە. ئێمە ئەدەبی ئیرۆتیسم وەک دیاردەیەک دەخەینە بەر باس و مشت و مڕ. شیتەڵ و ئانالایزی دەکەین و لێکی دەدەینەوە. هێرش دەکەینە سەری. نکۆڵی لێدەکەین. بەرگری لێدەکەین. بەڵام ئەو کاتەی باس لە کۆمەڵەکانی بۆرگ سترۆم دەکرێت شتێکی ڕوون و ئاشکرا هەیە کە ئەویش ئەوەیە ئەم کۆمەڵەیە دیاریەکە بۆ ئێمە و لە پێناوی ئێمەدا، دیاریەک بە رەهەندێکی زۆر گرنگەوە -ئەو شتەی کە بە زۆری فەرامۆش دەکرێت، واتە لایەنی مێژووی ئیرۆتیسم- . ئەمرۆکە ئێمە زیاتر لە هەزار ناو لە دەقە ئیرۆتیکەکانی پێنج سەدەی ڕابردوومان لە بەردەستدایە، ئەوان ئەڵقەکانی ساڵەکانن بە دەوری داربەڕوویەکی پیردا چێنراون.

لایەنی تایبەت و دیاری کۆمەڵەی بۆرگ سترۆم فرەچەشنی دەقەکان و وێنەکانە. کتێبەکان هەڵگری وێنەی سووکی پۆرنۆگرافی، وتاردانەکانی سەردەمی کلاسیک (١٥٠٠)، ڤۆڵتێر، سێکسۆلۆژی ١٩٠٠ی ئەڵمانیا، غەزەلە عاشقانەکان، ڕونکردنەوەی لەشفرۆشی، سادیسم، هێمۆسێکسواڵیتی، پێدۆفیلی (منداڵبازی)، دەستپەڕ و وێنای رووتی کچەکان. بەم شێوەیە کۆمەڵەکەی بۆرگ سترۆم وێنایەکی گشتی لە فرەچەشن بوونی خواستەکان و پرسە جنسییەکان ئەدات بە دەستەوە. بە کورتی : ئەوەی نەخۆشی «ڕابردوو باشتر بوو» ئازاری ئەدات، بە خوێندنەوەی ئەم کۆمەڵەیە چاک ئەبێتەوە.

بەڵام لێرەدا ئەم پرسیارە دێت بە مێشکمدا. بەڕاست بۆرگ سترۆم چۆن دەستی بەم هەموو شتە گەیشت؟ لە کوێ ئەو هەموو کتێبەی کڕیبوو؟ کێ خاوەنی یەکەمی ئەو کتێبانە بوو؟ (لێرەدا ناوی چەند کتێب وەک نموونە دەهێنمەوە). کتێبەکانی کلۆکسیۆنێری گەورەی ئادەم هۆرن (١٧١٧-١٧٧٨)و گۆستاو

لەو بەڵگانەی کە لە بەردەستدان دەردەکەوێت ڤیگێرت و بۆرگ ستڕۆم لە ساڵی ١٩١٣ەوە بۆ ١٩١٥ لە خانوویەکدا ژیاون. وادیارە ئەم دوو پیاوە جگە لە ئیرۆتیسم هەردووکیان حەزیان لە ئۆپێرا بووە. دەوترێت ڤیگێرت بەردەوام هاتوچۆی هۆڵەکانی ئۆپێرای دەکرد و لە کاتی گوێگرتن لە ئۆپێرادا بیری لە بیرکاری دەکردەوە. ڤیگێرت ساڵەکانی ١٩١٦و ١٩٢١ لە نەخۆشخانەی دەروونی کۆنراد سێبری لە «ماریە بێری» کە بە «کۆشکی شێتەکان» ناسرابوو لە ژێر چاودێریدا بوو.



هێلنێستیرنا (١٧٤١-١٨١٣) که به هۆی کتێبی بیرەوەرییەکانی «بەسەرهاتی عەشقی من (چاپی ١٩٧٢) (کە هەڵگری چۆنییەتی دەستدرێژیکردنی بوو بۆ سەر کچە خزمەتکارەکانی) ناوبانگی دەرکرد، هێدویک ئۆلریکا دێ گیر (١٧٥٢-١٨١٣)، گۆستاو ئێلنۆرا لیندال (١٧٦٩-١٨٤٠ کچی سی سی یۆرل ڤۆل) چەند بەرگ لە کارل گۆستاوی پازدەیەم شای سـویـد (١٨٢٦-١٨٧٢) کە بەهۆی حەزکردنی لە ئیرۆتیسم بەناوبانگ بووە. لەو کتێبانەن کە لەم کۆمەڵەیەدان.

ئەوەی بەلای منەوە سەرنجڕاکێشە جۆری پۆرنۆگرافی نیشتیمانی (سویدی)یە، کە بە داخەوە لەم کۆمەڵەیەدا زۆر کەمە. بـۆرگ ستڕۆم وێنای زۆر لە ئەدەبی ئیرۆتیسمی فەرانسە ئەدات بە دەستەوە. تەنها لە وێنای شتە ئێرۆتیکە هاوردەکانی «نوێنەرایەتی هونەری فەرانسە« و «ناوەندی بڵاوکردنەوەی لۆند بێری» و ژیانی شەوانە لە «ڕۆسۆندا» دەتوانین دەستمان بە بەشێکی بچووک لە پۆرنۆگرافی سویدی بگات.

لەو بەرهەمانەی ئەدەبی ئیرۆتیسم و ئەو ناوانەی کە کەوتۆتە بازار لە سەدەی نۆزدەیەمدا کە زۆرتر لایەنێکی سەرگەرمیان هەیە، دەتوانین ئاماژە بدەین بە «هەڵبژاردەیەکی شیعری بۆ هەموو دایکەکان» (١٨٣٩)، «میسالینا» (١٨٥١)، «بەم شێوەیە دەکرێت وازی لێ بێنیت» (١٨٦٣)و... .

بە گشتی دەتوانین بڵێین حەزی خەڵک بۆ ئیرۆتیسم لە ساڵەکانی یەکەمی جەنگدا بە ئەوپەڕی خۆی گەیشت. ساڵی ١٩١٠ ساڵی لەناوچوونی شاعیری و ساڵی سەرهەڵدانی هێمۆسێکسوالیتە و شەپۆلی کتێبە سێکسی-سەرگەرمییەکان تا ساڵەکانی ١٩٥٠-١٩٦٠ باس لە شۆڕشی سێکسی دەکات.

هێرالد بۆرن یەکەم کتێبدارە کە لە وتارێکدا بەم شێوەیە ئۆسکار ئادۆڵف بۆرگ ستڕۆم دەناسێنێت: ئادۆلف بۆرگ ستڕۆم لە ٩ی دیسەمبەری ١٨٧٧ شاری نی شۆپینگ لە دایکبوو. زۆر سادە و بێ زریق و بریق دەژیا. کەمی دەخوارد. زۆر وریا دیاربوو. توانای هەبوو لە ئۆپێرادا. زاهید و خەڵوەنشین بوو و زۆر هاتوچۆی دۆستانی نەدەکرد. سەڵت ژیا و سەڵت مرد. تا ساڵی ١٩١٣ خەریکی گارسۆنی بـوو. ساڵی ١٩١٣ وەک خزمەتکاری «خانەی پەککەوتووانی دەوڵەت» لە شەقامی ئێنگلبێرک ٥-٧ دامەزرا و بوو بە خاوەن ژوورێکی بچووک لەو بینایە. ساڵی ١٩٣٧ خانەنشین بوو و تا ئەو ساڵەی کە مرد (سیویەکی جوولای ١٩٤٥) لە سۆدێر مێڵم (لە ستۆکهۆڵم) دەژیا.

لە ناو ئەو بەرهەمانەی لە بۆرگ ستڕۆم بە جێماوە دەکرێت ئاماژە بدەین بۆ ئەو نامانەی بۆ جۆرج ئاک، کتێبفرۆشی ئەڵمانی نووسییوە. ناوەرۆکی یەکێک لەو نامانانە (دیسەمبەری ١٩٢١ نووسراوە) باسکردنە لە دەستبەسەرداگرتنی شتومەکی کڕدراوە لە سەر سنوور و گەڕاندنەوەیانە بۆ خاوەنی یەکەمیان.

من لاموایە شتێکی باوەڕپێنەکراوە بۆرگ ستڕۆم بە شێوەیەکی سادە و بێ زریق و بریق ژیابێت.

کۆکردنەوەی وەها کولۆکیسیۆنێک بە بێ پارەیەکی زۆر و بە تەنهایی مومکین نییە. بە پێی هەندێ بەڵگە ئەگەری ئەوە هەیە سەرمایەی ئەم کولۆکیسیۆنە لە لایەن سۆرید ڤیگێرتی بیرکاری زانەوە (١٨٧١-١٩٤١) کە وەک میراتگر لە میراتگرنامەکانی بۆرگ سترۆم (١٩٢٥)دا ناوی هاتووە، دابین کرابێت. ناوی ڤیگێرت لە خوار یەکێک لە وەسڵەکاندا هاتووە کە ساڵی ١٩٢٧ نووسراوە. ڤیگێرت پازدەی ئۆکتۆبەری ١٨٧١، لە شاری ستۆکهۆڵم، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند لە دایک بوو. دایک و باوکی ڤیگێرت زۆر زوو مردن و بەم شێوەیە ڤیگێرت لە گەڵ براکەی ئاگوستی سەڵت و بێ منداڵ، مێراتێکی گەورەیان پێگەیشت.

لەو بەڵگانەی کە لە بەردەستدان دەردەکەوێت ڤیگێرت و بۆرگ سترۆم لە ساڵی ١٩١٣ەوە بۆ ١٩١٥ لە خانوویەکدا ژیاون. وادیارە ئەم دوو پیاوە جگە لە ئیرۆتیسم هەردووکیان حەزیان لە ئۆپێرا بووە، دەوترێت ڤیگێرت بەردەوام هاتوچۆی هۆڵەکانی ئۆپێرای دەکرد و لە کاتی گوێگرتن لە ئۆپێرادا بیری لە بیرکاری دەکردەوە. ڤیگێرت ساڵەکانی ١٩١٦و ١٩٢١ لە نەخۆشخانەی دەروونی کۆنراد سێبری لە «ماریە بێری» کە بە «کۆشکی شێتەکان» ناسرابوو لە ژێر چاودێریدا بوو. ڤیگێرتی ماتماتیک زان تەمەنی خۆی تەرخان کرد بۆ شیتەڵکردنی تیۆرییەکانی بیرکاری و فۆتۆکسیۆنەکان. هەروەها دەوترێت ڤیگێرت مامۆستای بێ مووچەی زانکۆی ستۆکهۆلم بوو و ژیانی بەو میراتیەی پێی گەیشتبوو دەبرد بە رێوە. ڤیگێرت هیچکات بیری لەوە نەکردەوە پلەی دۆکتۆرا بەدەست بێنێت، بەڵام ساڵی ١٩٢٧ لە لایەن زانکۆی ئۆپسالا و ساڵی ١٩٢٨ لە لایەن زانکۆی ستۆکهۆلمەوە دۆکتۆرای فەخری پێبەخشرا. بەراورد کردنی بەرهەمەکانی بۆرگ سترۆم و ڤیگێرت ئەوە دەخاتە ڕوو کە بۆرگ سترۆم دەیەوێت چارەنووسی پیاوێک بخاتە روو کە وایکردووە بە خۆی بکەوێتە ژێرکاریگەری ژنەوە. لە حاڵێکدا ڤیگێرت لە پیاوی ئازادی نیچەیی ئەچێت کە پشتی لە ژن یان دایک و کۆیلەیەتی مەسیحییەت کردووە. دژایەتی لە گەڵ مەسیحییەت، دژە ژن بوون، ئۆپێرا و پۆڕنۆفیلی و دوو پیاوی سەڵت لە دوو چینی جیاوازی کۆمەڵایەتی کە ماوەیەک هاوماڵ بوون، هەردووکیان یەک حەز و عەشق کۆیکردونەتەوە: عەشق و خۆشەویستی بۆ ئۆپێرا و ئیرۆتیسم.

بەڵام ئەمڕۆکە ئەم مەتەڵە هەفتا ساڵەیە خەریکە دەکرێتەوە و مێژوو لەوەدایە دووبارە بنووسرێتەوە. ئەوەی دەمێنێتەوە رێکخستنی پێشانگایەکە لە کۆمەڵە بەرهەمەکانی بۆرگ سترۆم و کردنەوەی دەرگایەکە بەڕووی خەڵک و لێکۆڵەراندا.

ئەم وتارە ٢٩ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٦ لە رۆژنامەی سۆنکا داگ بلادێت بڵاوبۆوە.

کارڵ- میشێل ئێدینبۆرگ: فەیلسووف و لێکۆڵەری مێژووی بیرکردنەوەو فەلسەفە.

سەرچاوە : http://www.cheraq.net

# نوسینی ئەدەبی لەسەر سێکس، ئایا داهێنانە یان تەنها نوسینێکە بۆ وروژاندن1

نووسینی: کەریم جەزائیری
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ڕەنگە ئەو پرسیارەی سەرەوە کۆنو تاڕادەیەک سواوبێت، چونکە مورەکەبێکی زۆری تێدا بەکارهاتووەو چەندین جەنگی فیکری لەنێوان لایەنگرانو نەیارانی ئەم جۆرە نوسینەدا هاتوەتەئاراوە. پاساوی لایەنگران ئەوەیە کەلتووری عەرەبی بە درێژایی مێژووە دووردرێژەکەی، لە «امرو القیس»ەوە تا دەگاتە ڕۆژی ئەمڕۆمان، ژمارەیەکی زۆر دەقی نەمری لەخۆگرتووە کە تێیدا سێکس بابەتی سەرەکی بووە، یان سێکس بەشێوەیەکی بەهێزو بەرچاوو ئامادەبووە. هەروەها خودی زمانی عەرەبی لە هەمو زمانەکانی دیکەی جیهان زیاتر بە جەستەو بە ئارەزووە سێکییەکاندا هەڵیداوە. بەڵام پاساوی نەیارەکان ئەوەیە ئەم جۆرە نوسینە، لەگەڵ ئەخلاقو بەهاکانی کۆمەڵگادا ناکۆکە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئاینی ئیسلام فەرمانمان پێدەکا خۆمانداپۆشین. لێرەوە ئەوانە پێیانوایە ئەم جۆرە نوسینە ناچێتە چوارچێوەی ئەدەبو داهێنانەوە، بەڵکو ئەوە دەربڕینێکی نەخۆشە سەبارەت بە بێ

**بە گەڕانەوە بۆ کەلتوری سێکسی عەرەبی، ژمارەیەکی زۆر دەق دەبینین کە باس لە پەیوەندییە سێکسییەکان دەکات، ئەمە ئەگەر نەڵێین بەگەورەیی‌و شکۆمەندییەوە لەم پەیوەندیانەی ڕوانیوە. وەك ئەوەی لەشیعرەکانی «ئەبو نەواس»دا هەیە کە هەمیشە وەك نمونەیەکی دەگمەن بۆ (ئیلتیزامکردن لە ئەدەب)دا دەمێنێتەوە**



ئەبو نەواس

ڕەنگە ئەو پرسیارەی سەرەوە کۆن‌و تاڕادەیەک سواوبێت، چونکە مورەکەبێکی زۆری تێدا بەکارهاتووەو چەندین جەنگی فیکری لەنێوان لایەنگران‌و نەیارانی ئەم جۆرە نوسینەدا هاتوەتەئاراوە. پاساوی لایەنگران ئەوەیە کەلتووری عەرەبی بە درێژایی مێژووە دووردرێژەکەی، لە «امرو القیس»ەوە تا دەگاتە ڕۆژی ئەمڕۆمان، ژمارەیەکی زۆر دەقی نەمری لەخۆگرتووە کە تێیدا سێکس بابەتی سەرەکی بووە، یان سێکس بەشێوەیەکی بەهێزو بەرچاوو ئامادەبووە. هەروەها خودی زمانی عەرەبی لە هەمو زمانەکانی دیکەی جیهان زیاتر بە جەستەو بە ئارەزووە سێکییەکاندا هەڵیداوە. بەڵام پاساوی نەیارەکان ئەوەیە ئەم جۆرە نوسینە، لەگەڵ ئەخلاق‌و بەهاکانی کۆمەڵگادا ناکۆکە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئاینی ئیسلام فەرمانمان پێدەکا خۆمانداپۆشین. لێرەوە ئەوانە پێیانوایە ئەم جۆرە نوسینە ناچێتە چوارچێوەی ئەدەبو داهێنانەوە، بەڵکو ئەوە دەربڕینێکی نەخۆشە سەبارەت بە بێ ئەدەبی.

کەواتە تیمی یەکەم لە بەرگریکردنیدا لەم جۆرە نوسینە کە بوونی هەیە، پەنادەباتە بەر خودی مێژووی ئەدەبی عەرەبی‌و لە هەر قۆناغێک کە ئەم ئەدەبە پێیداتێپەڕیوە، سا قۆناغی گەشەکردن بێت یان قۆناغی پاشەکشە، نمونەگەلێکی زۆر دەدۆزێتەوە. ئەمە لە کاتێکدایە تیمی دووەم، بۆ بەرگریکردن پەنا دەباتە بەر وتەزا فقیهییەکان کە خوێندنەوەیەکی تایبەت بۆ تێکستی ئاینی دەکاتو خۆیان، واتە ئەم تیمە، بە پارێزەرو بەرگریکار لە ئەخلاقی گشتی دادەنێن، ئەمەش لە ڕوانگەی تیۆرەیەکی ئەخلاقییەوە کە پێویستی بە کرانەوەیەکی هێجگار زۆرە.

زۆرجار ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەکاندا، لەسەر ئاستی ئەدەبی‌و ڕەخنەیی وروژێنراوە، بەتایبەتی کاتێ مەسەلەکە پەیوەست بووە بە خانمێکی نوسەرەوە. تائێستا عەقڵیەتی پیاوسالاری کۆمەڵگاکەمان، پێیوایە کاتێ ئافرەتێک دەنوسێت، ئەوا پێش ئەوەی بە عەقڵی بنوسێت، بە جەستەو بە ئارەزووەکانی دەنوسێت.

بەڵام لەسەر ئاستی (تۆمارکردن- التدوین)و بەو پێودانگەی ئەم پانتاییەی داهێنان، لە جیهانی عەرەبیدا هێشتا تازەیەو لە دۆخی دروستبوندایە، بۆیە بابەتگەلێکی زۆر هەیە هێشتا لە خانەی قسە لەسەرنەکردندایەو بێدەنگی لێکراوە، ئەگەرچی ئەم پانتاییە ئازادییەکی گەورە دەبەخشێت بە قسەکردن

لەسەر هەمو شتێک. ڕاستە ژمارەیەکی زۆر نوسین هەیە کە تێیدا خاوەنەکانیان بابەتە سێکسییە تابلێی گەرموگوڕەکان دەوروژێـنـن، بـەڵام تا ئێستا ئەم جۆرە نوسینە گفتوگۆی لەبارەوە نەکراوە. ئەوەی هەیە پەرچەکردارێکە، یا ئەوەتا لایەنگریەتی یاخود ڕەتیدەکاتەوە، بەبێ ئەوەی بڕۆنە قوڵاییو جەوهەری بابەتەکەوە.

لەلایەنی سۆسیۆلۆژییەوە ئەدەبی سێکس (لەگەڵ هەندێ سڵکردنەوە لەسەر ئەم ناونانە) پەیوەستە بە فەزای شارەوە، واتە بە ئاوەدانییەوە. ئەمەش لەبەر ئـەو ئازادییەیە کە ئـەم فـەزا جوگرافییە (شـار) دەیبەخشێت، بە بـەراورد بە فـەزای گوند یان دەشتایی کە لە چاو شاردا تابلێی فەزایەکی کۆنەپارێزو خۆداپۆشە. شار لە بەراوردکردنیدا بە گوند، بەوە جیادەکرێتەوە ئەو خەڵکانەی تێیدا نیشتەجێن ناناسرێن، بە پێچەوانەی گوندەوە کە هەموان یەکتردەناسن. ئەم نەناسینە ئەو دەرفەتە دەڕەخسێنێت بە ئازادییەکی گەورە گوزارشت لە ئارەزووە سێکسییەکان بکرێت، سا لە میانەی قسە/ نوسینەوە بێت یان لە میانەی پیادەکردنی. ئەگەرچی زۆربەی گوزارشتە سێکسییەکانی دانیشتوانی شار، بەشێوەی ئاخاوتن ئەنجامدەدرێت، ئەویش یا لە میانەی نوسینەوەیە یان نوکتەی سێکسی یاخود چاوبازی. بەهۆی ئەو تێکەڵاویەی لە شاردا هەیەو بەهۆی ئەوەی لە چەندین شوێندا ئافرەتانو پیاوانی نەناسو نامۆ پێکەوەن، ئەوا چاوبازی دەرفەتێکی فراوانی لەبەردەمدایە. بەڵام لە شاردا گوزارشتکردن لە ئارەزووە سێکسییەکان، زۆرجار لە ئاستی ئاخاوتندا دەمێنێتەوەو ئەو ئاستە تێناپەڕێنێت، ئەمە لەبەر ئەوە نییە دانیشتوانی شار پاکیزەنو ئەو پاکیزەییەیان ڕێگایان لێدەگرێت مومارەسەیەکی ڕاستەقینەی سێکس بکەنو ئـەم ئـارەزووە کڵپەسەندووەیان تێربکەن. بەڵکو لە ئەنجامی کۆمەڵێ هۆکاری بابەتی قورسەوەیە کە ئەم ئـارەزووانـە تێکدەشکێنێتو لێناگەڕێت بەدیبێن. ئەم هۆکارانە لە بنچینەدا دەگەڕێتەوە بۆ بێجێگەیی یان تەسکی شوێنەکان. ئەمەش خاسیەتێکی سۆسۆلۆژییەو تایبەتە بە شار، بە پێچەوانەی گوند یان دەشتەوە کە بەوە ناسراون فەزایەکی گەورەی چۆڵوهۆڵیان هەیەو دەکرێ وەک شوێنی تایبەت بۆ ئەو یەکتربینینە سێکسییانە بقۆزرێتەوە.

دکتۆر «عبدالصمد الدلیمی» لە توێژینەوەیەکیدا دەربارەی: (سێکس: زۆری وروژاندنو نەبوونی شوێن) دەڵێ» لە شارە گەورەکاندا، ناوەندە میللییەکان لەنێوان هەڵچونی ئارەزوی سێکسیو کەمی دەرفەت بۆ تێرکردنیان، دێنو دەچن. یەکێک لە ماناکانی شارنشینی بریتییە لە گواستنەوە بۆ دەرفەتێک لە دەرەوەی عەشیرەت، ئەم دەرفەتە لەسەر کۆمەڵێ بەهای تازە دامـەزراوەو بەهاکان لە دەوری تاکو ئازادییەکان دەسوڕێتەوە. لەم دەرفەتەدا تاک هەم لە تەماشاکردنەکانی ئەوانی دیکە ڕزگاری دەبێت، هەم لە فشاری خزمایەتی، لێرەوە چاوبازی لەگەڵ ئافرەتان دەبێتە مەسەلەیەکی شیاو.

«جۆرج زیمل» لەوە دوورتر دەڕواتو پێیوایە چاوبازی لەگەڵ ئافرەتاندا، لە بنەڕەتدا دیاردەیەکی شارییە، بەو مانایەی چاوباز لە هەمو شوێنە گشتییەکاندا، بە مەبەستی بەکارهێنانی سێکسی چاوبازی لەگەڵ ئافرەتەکان دەکات. چاوباز ئەو پیاوەیە بەختی خۆی لەگەڵ هەمو ئافرەتەکانداو لەگەڵ زۆرترین ژمارەی ئافرەتان تاقیدەکاتەوە. لێرەدا شتێک نییە ناوی شەرمکردنبێت، چونکە لە فەزای شاردا کە یەکێک لە خاسیەتەکانی نەناسینە، کەس نایناسێت.

کەواتە سێکسێکی زۆر هەیە لەبەرامبەردا توانای تێرکردنی نییە، هەر ئەمەشە وادەکات تێرکردن لە شێوە سروشتییە جەستەییەکەیەوە بگۆڕدرێت بۆ شێوەیەکی دیکە کە بریتییە لە هەوڵی تێرکردن لە ڕێگەی زمانەوە. واتە بە سێکسکردنی زمان وەک

ئامرازێک بۆ گوزارشتکردن لەو ئارەزووە گرگرتووە قەدەغەکراوانە لەلایەک، لەگەڵ قەدەغەکردنی ئەوەی ئەو ئارەزووانە بێنەدی لەلایەکی دیکەوە. ئەمەیە ئەوەی لە ئەوروپا بۆمان بەرهەمهاتووەو پێیدەوترێت ئەدەبی (بێ پەردە- الادب المكشوف). هەمان ئەو بارودۆخەی ئەوان، لای ئێمەش هەیەو لە کەلتووری عەرەبیماندا بڕێکی هێجگار زۆر لە ئەدەبی سێکسی بەرهەمهاتووە کە لە شارەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، بەتایبەتی لەسەردەمی خەلافەتی عەباسییەکاندا گەشەی کردووە.

لە نوسینێکی پشوترمدا بە ناونیشانی (خۆشەویستی لە کەلتوری عەرەبیدا) قسەم دەربارەی ئەو جیاوازیانە کردووە کە لەنێوانە شیعری بادییە (بۆ نمونە شیعری پاکیزەیی) لەگەڵ ئەو شیعرانەی شارەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، لەسەر بابەتی خۆشەویستی بەهەرهەمیانهێناوە، هەیە. هەروەها قسەم لە تێڕوانینی مرۆڤی موسڵمانی لادێی بۆ خۆشەویستی کردووە کە بەشێوەیەکی ڕیشەیی جیاوازە لە تێڕوانینی مرۆڤی شاری. لەو شیعرانەی لە گوندو لادێکاندا بەرهەمهاتوون، پاکیزەییەکی زۆر دەبینین، ئەمە لەگەڵ ئەوەی وشەکانو ماناکان زۆر بە کەمی بۆ مەدلولی سێکسی بەکارهاتوون. ئەمە بە پێچەوانەی شیعری شاری کە بە وردیی‌و بێ پەردەو بێ شەرمانە، وەسفی زۆربەی پەیوەندییە سێکسییە ئاساییەکان یان شازەکانی، کردووە. هەروەها ئەم شیعرە (شیعری شار)، بە باشترین شێوە فەرهەنگی سێکسی عەرەبی بەکارهێناوە.

بە گەڕانەوە بۆ کەلتوری سێکسی عەرەبی، ژمارەیەکی زۆر دەق دەبینین کە باس لە پەیوەندییە سێکسییەکان دەکات، ئەمە ئەگەر نەڵێین بەگەورەیی‌و شکۆمەندییەوە لەم پەیوەندیانەی ڕوانیوە. وەک ئەوەی لەشیعرەکانی «ئەبو نەواس»دا هەیە کە هەمیشە وەک نمونەیەکی دەگمەن بۆ (ئیلتیزامکردن لە ئەدەب)دا دەمێنێتەوە. ژیانی ئەم شاعیرە لە شیعرەکانی جیاناکرێتەوە، لێرەوە لەبەر ئەوەی ژیانی پڕ بووە لە گاڵتەوگەپی ناشرین‌و هەمو ئەو گاڵتەوگەپانەشی خستۆتە دوتوێی شیعرەکانییەوە. وەلێ ئەبو نەواس وەک حاڵەتێکی ئاوارتە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت‌و ناکرێت بە حاڵەتێکی گشتی لێیبڕوانرێت. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە «حەسەن بن هانی» سێکساندنی عەرەبی گەیاندە لوتکە، ئەوەی سێکساندنی عەرەبی گەیاندە لووتەکە فوقەهاکان‌و پیاوانی ئاینی بوون. پارادۆکسیەکەش لێرەدایە. ئەمە بەڵگەیەکی گەورەیە بەدەست ئەوانەی لایەنگری ئەم جۆرە نوسینە دەکەن‌و دژ بە نەیارەکانیان بەکاریدەهێنن کە بەناوی ئاین‌و بەناوی دەقی فقهییەوە دژایەتی ئەم جۆرە نوسینە دەکەن.
ڕەنگە ئیمام «جەلالەدینی ئەسیوتی» خاوەنی کتێبی (اسباب النزول و تفسير الجلالين)، لە هەمو ئەوانەی لەسەر سێکسیان نوسیووە، ئەم لە هەموویانی زیاتر نوسیبێت. لەم بوارەدا خستنەڕووی ناونیشانی هەندێ لە کتێبەکانی، وێنەیەکی ڕوونترمان لەسەر عەقڵیەتی کراوەی ئەو فوقەهایانە دەداتێ کە لە ڕابردودا هەیانبووەو خاوەنی تێڕوانینێکی عەقڵانیانەبوون بۆ شیتەکان:

***نواضر الايك في اداب النيك**
***ارشاد اللبيب لمعاشرة الحبيب**
***مقامة النساء**
***رشف الزلال من السحر الحلال**
***الوشاح في فوائد النكاح**
***شقائق الاترنج**

ئەمەو چەندان کتێبی دیکە لە کتێبە زۆرەکانی کە بابەتی سەرەکییان سێکس بووەو بە شێوازێک نوسراونەتەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا حەیابەرەیە. بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە زۆربەی کتێبەکانی کە بڵاوکراونەتەوە، لە چەندین وڵاتانی عەرەبی‌و ئیسلامیدا، بە پاساوی ئەوەی ئەوە ئەدەبی (بۆرنۆ) یە قەدەغەکراون.
لەم بوارەدا ئیمام «جەلالەدینی سیوتی» بە حاڵەتێکی

ئاوارتە دانانرێت، چ بۆ سەردەمەکەی خۆیو چ بۆ پێش خۆیو چ بۆ دوای خۆشی. بەڵام کەلتوری عەرەبی لەگەڵ هاتنی سەردەمی داڕمانو پاشەکشەکرندا کە «ئەسیوتی» لەسەروبەندیدا ژیاوە، زیاتر بەلای جۆرێک لە (سڵکردنەوەی ترسنۆکانەدا) لایداوە، ئەم سڵکردنەوە ترسنۆکانە ترسێک بووە لەسەر شوناسو لەسەر ئاین. ئەمەش خەسڵەتێکە لە خەسڵەتەکانی لاوازی لە هەرکەلتورێکدا بێت. چونکە ئەو کەلتورەی لەبەرامبەر کەلتورەکانی دیکەدا خۆی بە لاواز دەزانێتو ناتوانێک وەک ئەوان چەمکو تێگەشتنەکان بەباشیو بە دروستی بگەیەنێتە کەلتورەکانی دیکە، ئەوا هەمیشە بۆ تێکشکاندنی هەوڵەکانی غەزوی ڕۆشنبیری کە لە کەلتورە بەهێزەکانی دیکەوە ڕوبەڕوی دەبێتەوە، پەنا دەباتە بەر پێکهاتەکانی ئاینو ئەخلاق. ئەمەش ئەو حاڵەتەیە کە تا ئێستا کەلتوری عەرەبیو ئیسلامی تێیدا دەژی. واتە ئێمە تا ئێستا لە حاڵەتی خۆشاردنەوەداین لە مەترسییەکی دەرەکی کە هەڕەشە لە شوناسمان دەکات. ئەم ترسەیە وادەکات نەتوانین نوێنەرایەتی هەندێ لە وێستگە گرنگەکانی مێژومانو کەلتورمان بکەین.

ئەگەر چی «سیوتی» بە تێکەڵکردنی ئەدەبو زانست لەو بابەتانەی قسەی لەسەر دەکرد، هەروەها بەهۆی ئەوەی زۆربەی بەرهەمەکانی بە شێوازێکی پەخشانئامێزی نایابو سەرنجراکێش نوسیبوو، توانی ئەدەبی سێکسی عەرەبی بگەیەنێتە قۆناخێکی پێشکەوتوتر لەو قۆناغەی پێش ئەو لەئارادابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەم بوارەدا ناوبانگی تەواوی دەرنەکرد. لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوەبێت کە کتێبە فقیهیەکانی زاڵ بوون بەسەر کتێبە سێکسییەکانیداو کەلتورە سێکسییەکەی بۆ ماوەیەکی درێژ، وەک کتێبە سێکسییەکانی دیکە، شاردرابونەوەو کەنارخرابوون. زهنیەتی (سڵکردنەوەی ترسنۆکانە) کە سەردەمی داڕمانو پاشەکشەکردنی پێدەناسرێتەوە، کاری لەسەر دژایەتیو ڕەتکردنەوەی ئەو کتێبانە کردووە. دەکرێ لەسەردەمی گەشەکردنی کەلتوری عەرەبی ئیسلامیدا، چەندین نمونە لەسەر کرانەوەی ئەو کەلتورە بەڕوی جۆرە جیاواز جیاوازەکانی داهێنان بهێنینەوە، دەکرێ نوسین لەسەر سێکسو بەکارهێنانی فەرهەنگی سێکسی عەرەبی بە باشترین شێوە، جۆرێک بێت لەو جۆرانەی داهێنان کە هیچ جیاواز نییە لە داهێنانەکانی دیکە. لەوانەیە ئەدەبێکی باش یان خراپ بێت، بەڵام لە ڕوانگەی تێڕوانینێکی ئەخلاقی یان ئاینییەوە هەڵسەنگاندنی بۆ ناکرێت، بەڵکو لە ڕێگەی جێبەجێکردنی یاساکانی ڕەخنەوە هەڵدەسەنگێنرێت کە بەسەر جۆرەکانی دیکەی نوسیندا جێبەجێ دەکرێت.

سەرەتا لە پەیوەندی «امرو القیس»ەوە کە لە شیعرەکانیدا وەسفی پەیوەندی جەستەیی خۆی بە خۆشەویستەکەیەوە کردووە، تا دەگاتە سەر خانمی نوسەر «سوی ئەلنعیمی»و کتێبەکەی کە بەم دواییانە لەژێر ناونیشانی (برهان العسل) بڵاوکرایەوە، ئەدەبی سێکسی پێگەیەکی گرنگی لە ئەدەبی عەرەبیدا داگیرکردووە، بە تایبەتی ئەدەبی کۆن. بەڵام ئەم جۆرە لە ئەدەب، ڕوبەڕوی چەندین جۆری ڕەتکردنەوە دەبێتەوە، بەتایبەت لەلایەن فوقەهاکاو کۆنەپارێزەکان کە پێیانوایە ئەو جۆرە ئەدەبە دەستدرێژکردنێکی کوشندەی تێدایە بۆسەر ئەخلاقو ئادابی گشتیو ئەوەیان لەبیرچۆتەوە کە زمانی عەرەبی بە پلەی نایاب زمانێکی سێکسییەو توانای لە هەمو زمانەکانی دیکە زیاترە بۆ بەرجەستەکردنی شەبەنگو ڕەنگەکانی سێکس.

من ئەم بابەتە بۆ گفتوگۆو مشتومڕ دەخەمە بەردەست کە حەزم نەکرد قسەی زیاتری لەسەر بکەم. ئایا نوسین لەسەر سێکس داهێنانە وەک جۆرەکانی دیکەی داهێنان یاخود نوسینێکە تەنها بۆ وروژاندنە؟

تێبینی: بە باشمان زانی ناوی کتێبەکانی جەلالەدینی سیوتی وەک خۆیان بە عەرەبی بنوسینەوە.

سەرچاوە: www.maktoobblog.com

# سێکس لە شیعرە سەرەتاییەکانی دی. ئیچ. لۆرانس دا

نووسینی: ئەندرۆ هاریسۆن
و: لەعەرەبییەوە سەهەند

وەختێ لە سێکس ڕادەمێنین لە ئەدەبی ئینگلیزیی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، لەوانەیە یەکەم ناو کە دێتەوە بیرمان ناوی «دی. ئیچ. لۆرانس» بێت، لەبەرئەوەی لۆرانس زۆر بەخێرایی ناوی وەکو نووسەرێکی سێکسی بڵاوبۆوە، چ لە ڕۆمانەکانی و چ لە شیعرەکانیدا. تەوەرەی ڕۆمانەکانی وەکو «تاوسی سپی» ۱۹۱۱ و «گوناهبار» ۱۹۱۲، بە دەوری ململانێ لە نێوان هەڵوەدابوون بۆ سێکس و ئەو کۆت و پێوەندانەدا دەسوورێتەوە کە کۆمەڵگا لە واقیعدا بەسەر مرۆڤدا دەیسەپێنێت، لەکاتێکدا هەر سێ کۆمەڵە شیعرییە سەرەتاییەکانیشی سەبارەت بە بابەتی هەستی و سێکسین.

کۆنراد ئایکن خوێندنەوەیەکی بۆ کۆمەڵە شیعری «تەماشاکە، ئێمە دەژین!» ۱۹۱۷ کردووە کە بە سەر دیوانە سەرەتاییەکانی تریشیدا دەچەسپێت، وەکو دیوانی «شیعری خۆشەویستی و شتی تر» ۱۹۱۳ و «کیوپید» ۱۹۱۶. ئەو نووسیویەتی «ئاسۆی لۆرانس دیاریکراوە، ئەو بەردەوام لە سێکسەوە نزیکە،

**دەبینن چۆن قەسیدەی «ئیرۆتیك» بە توندی پشت بە هەندێ جۆری دووپاتبوونەوە دەبەستێت. بەشێوەیەکی ئاسێنەر وێنە و سەرنج کەڵەکە دەکات تا حاڵەتی توندی ئارەزووی سێکسی و بەرەوپێشەوەچوونی ئەو حاڵەتە بخاتە ڕوو**



دی. ئێچ. لۆرانس

گەرموگوڕ و دواجاریش هەڵچووە، بەڵام لە ترۆپکە باڵاکەشیدا، بە شێوەیەکی زەق فەلسەفییە. لەگەڵ ئەمەشدا و لەسەر ئەم ئاستەش، ئەو بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن، هەمەڕەنگە» هەر بە ڕاستیش ئەم هەمەڕەنگییە لە کارەکانی لۆرانسدا وامان لێدەکات ڕابمێنین. وەک کاردانەوەیەک بۆ ئەمە لۆرانس لە پێشەکیی ڕۆمانی «چەند ئافرەتێکی عاشق» دا دەڵێت: «لە ئینگلتەرەدا بەوە تاوانبار کرام کە من پیس و بێ ئابڕووم، بەبێ هیچ گومانێک من ئەم تۆمەتە ڕەتدەکەمەوە، لە ئەمەریکاش ئەو تۆمەتە سەرەکییەی خرایە پاڵم «ورووژاندنی سێکسی» بوو، ئەمەش شتێکی سەیرە و مایەی سەرسوڕمانە. ئیرۆس چییە؟ ئاخۆ ئەو ئیرۆسە شۆخەی «کیوپید» ە یان ئیرۆسی نهێنییە ناڕوونەکانە؟ پاشان تاوانبارکردن لە پای چی؟ ڕێزنەگرتن و بەکەمگرتن لە پای چی؟ هەستی سێکسی دەکرێ لە ڕێی هاوڕێیەتی بەهێز و کاروبارە تایبەتەکانەوە گوزارشتی لێ بکرێ، بەڵام بە دەربڕینە فراوانەکەی، بریتییە لەو خەسڵەتەی کە پێکەوە دەمانبەستێتەوە، نەک هەروەکو تاکەکەس، بەڵکو بەو گەردوونەشەوە کە ئێمە بەشێکین لێی. بەم مانایەش، ئەو کارە ئەدەبییانەی هەستی ئیرۆتیکییان تێدایە، خاڵی بەیەکگەیشتنی هاوبەشی نێوان سۆزی سێکسی و نهێنییەکانی ئایین و ژیانن. هەروەکو مارک کینی کینديش نووسیویەتی: «سێکس لای لۆرانس مەغزایەکی هەیە کە بە سادەیی ورووژاندنی سێکسی ناگرێتەوە، بەڵکو مەرجێکی بوونە، کە تیایدا پەیوەندیی مرۆڤ بە جیهانی دەرەوە، لە پڕێکدا و لە چرکەساتێکی خۆشبەختیدا دەدرەوشێتەوە.»

لە نووسینەکانی نێوان ساڵانی ١٩١٢ و ١٩٩٩ دا، لای لۆرانس هێزی سێکس دەبێتە جەختکردنەوەیەک و ئاهەنگگێڕانێک و تێکۆشان لە پێناوی وەدیهێنانی یەکبوون لەگەڵ هاوەڵدا. مرۆڤ ناچارە ڕواڵی (مراهقە) و نەرجسیەتی لاوێتی تێبپەڕێنێت تا پەی بە زەرورەتی جوداوازیی هاوەڵەکەی بکات. ڕزگاربوونێکی ئازاراوییە بۆ جۆرێکی تازەی بوون، چ لەسەر ئاستی سێکسی و چ لەسەر ئاستی ڕۆحی. ئەوەتانێ لە برگەی شەشەمی قەسیدەی «هاوسەرێتی» دا شاعیر وا باس لە هاوەڵەکەی دەکات، وەک ئەوەی شتێکە لە دەرەوەی تێگەیشتنی ئەو:

«هەمیشە تۆ تۆیت، تۆ من نیت

منیش منم، نابم بەتۆ
چ جیاوازییەکی سامناک و فرە دوورە لە بوونمان پێکەوە!
وێڕای ئەوەش، هەست بە شادمانی دەکەم
من زۆر بەختەوەرم بەوەی کە تۆ هەمیشە لەودیو تێگەیشتنی منەوەیت،
شتێک لەوێدا ڕاوەستاوە
شتێک کە هەرگیز نابێت بە من
چون من بەردەوام لێی دەپرسم، و چاوەڕێی دەکەم
وەکو ئەوەی چەندیش بژیم هەمان ژیان دەبێت بۆ من
چاوەڕێت دەکەم، تەمەنت هەرچەندێ بێت، چەندیش بژیت
هەر لێت دەپرسم، و بە دواتدا دەگەڕێم»
ئەمجۆرە لە نووسین سەبارەت بە هێزی هەستی سێکسی، ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕیشەیی و کودەتایەکی سەنگین و وێناکردنێکی خۆپەرستانەیە بۆ ئەو جیهانەی کە لۆرانسیزمی لە ئەدەبدا پێ دەناسرێتەوە. ئەی دەبێ نووسینە ئیرۆتیکییەکانی لۆرانس بەر لە ساڵی ١٩١٢ چۆن بووبێت؟ پێداگرتنی زووی بووە لەسەر جیاوازی و پرسیارکردن و خۆنەویستی.
لەم باسە دەگمەنەی سێکسدا لە شیعرە سەرەتاییەکانی لۆرانسدا، دەمانەوێت لەم پارچە نووسینەی ڕابمێنین، وەختێ قسەکەر (شاعیر) بە وردییەکی ڕاستگۆیانەوە وەسفی قۆناغە زووەکانی ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت:
«من لەم جیهانە گەلێ وەڕس بووم
هەستم بە بێزاری دەکرد
هەموو شتێک لە دەروونمدا پیس بووبوو
ئاسمان و دارو گوڵ و باڵندە و ئاو
خەڵک و شەقامەکان و ماڵەکان و ماشێنەکان و مەکینەکان
میللەتان و سوپاکان و جەنگ و قسەکەری ئاشتی
کار و خۆشوشتن و فەرمانڕەوایی و ئاشووب
هەموو ئەمانە لە دەروونمدا پیس بووبوون
بە هەمووشیان ئاشنام، چونکە ئێمە خۆمان دەستیان پێدەکەین
چون هەموویان لە دەروونمدان
وەلێ لە کۆتاییدا، من ترسی شێتانەیانم لە بیر ناچێتەوە
وەختێ هەموو شتەکان من بوون
پێشتر ناسیبوومن و لە دەروونمدا چاوەڕێم دەکردن
چونکە من هەم نووسەر و هەم ئەنجامیش بووم
لە یەک کاتدا هەم خالق و هەم مەخلوق بووم
وەک خالقێک سەیری مەخلوقەکانم دەکرد
وەک مەخلوقێکیش سەیری خۆمی خالقم دەکرد
لە کۆتاییدا ترسێکی شێتانە بوو
من عاشق بووم، ئەو ژنەشم ماچ کرد کە خۆشمدەویست
ئای خودای ترس، من لە هەمان کاتدا خۆشم ماچ دەکرد»
لەسەر ئاستی ئەدەبی، ئەمە لاساییکردنەوەیەکی قەسیدەکەی واڵت ویتمان بوو «گۆرانییەک بۆ خۆم» کە تیایدا تەرکیزێکی زۆر لەسەر قۆناغی ئاوێنە و حاڵەتی داخران بە ڕووی خوددا هەیە، و جیهانی دەرەوە وا دەردەکەوێت ڕاوەستاو و قاپۆڕئاسا بێت، بەڵام لەڕووی مەجازییەوە وەسفێکە بۆ بێتوانایی هونەری و سێکسی.
تۆ کە خۆت هەم نووسەر و هەم ئەنجام بیت، واتە بۆ خۆت دەربارەی خۆت بنووسیت، کە لە یەک کاتدا هەم خۆت عاشق و هەم خۆشت مەعشوق بیت، واتە هاوەڵەکەت بەکاربهێنیت تا هەستێکی شەخسیی تایبەت بە خۆت بەدەست بهێنیت.
ئەم شێوە پێچ و پەنادارەی ڕەوتی ڕستەکان، لە هەمان کاتدا بەرجەستەکەری پرۆسەیەکی ئازاراویی




گەڕانەوەن بۆ خود لە سووڕێکی لە خۆباییبوون و شکستدا.

لۆرانس بەشێوەیەکی بەهێز ئەو قەیرانەی ناوەوەی بوون دەخاتە ڕوو کە تیایدا دەروون لەلایەن جیهانی دەرەوە زەفەری پێ نابرێ، لە ڕاستیشدا ئەمە ئەو حاڵەتەیە کە لە بەردەوامبوونیدا لەگەڵ جیهانی چواردەوریدا دەروونی پێ دەناسرێ. بە دابڕاویش لە شتەکانی دەرەوە، دەروون دەکەوێتە داوی گێژەنی تایبەت بەخۆیەوە. ئەم دەروونە لە ژێر گوشاری هێزەکانی ئارەزووی سێکسیدا، زمانی بەرەو ئەبستراکتێکی ڕەمزی دەچێت، با بۆ ئەمەش لە یەکێک لە قەسیدە سەرەتاییەکانی وردببینەوە کە ناوی «ئیرۆتیک»ە:

**لۆرانس بەشێوەیەکی بەهێز ئەو قەیرانەی ناوەوەی بوون دەخاتە ڕوو کە تیایدا دەروون لەلایەن جیهانی دەرەوە زەفەری پێ نابرێ، لە ڕاستیشدا ئەمە ئەو حاڵەتەیە کە لە بەردەوامبوونیدا لەگەڵ جیهانی چواردەوریدا دەروونی پێ دەناسرێ. بە دابڕاویش لە شتەکانی دەرەوە، دەروون دەکەوێتە داوی گێژەنی تایبەت بەخۆیەوە. ئەم دەروونە لە ژێر گوشاری هێزەکانی ئارەزووی سێکسیدا، زمانی بەرەو ئەبستراکتێکی ڕەمزی دەچێت**

ئیرۆتیک

کاتێ چاوم بەو خورییە سوورە قورسە دەکەوێ
کە بەسەر سنگی ماڵەکەی بەرامبەرماندا سەردەکەوێ
لەبەر بایەکەدا هەڵئەدرێتەوە و ئەنوشتێتەوە
هەست ئەکەم پەڕێکە، ئەکەوێ و
لەسەر سنگی کەناسمەیەک
کە لەتاو ئازار باڵەفرەیەتی، ئەلەرزێ
لە کاردانەوەیدا، خێرا سنگم ئەکرێتەوە
بەدەم ئازارێکەوە کە بایەکە پەخشی دەکا
کاتێ چاویشم بە درەختەکان دەکەوێ
بە تەنیشت یەکەوە دەلەنگێنەوە
پێکەوە دەنووشتێنەوە و بە باڵە ڕووتەکانیانەوە
باوەش بە یەکتردا دەکەن
سنگم بەرز دەبێتەوە و بۆ پێشەوە ئەچەمێمەوە
هەردوو باڵی بزێوم دەگرم
کاتێکیش گەڵا ڕەشەکان بەدەم باوە هەڵدەوەرن
ڕووخسارم بەرز دەکەمەوە
چون وەک دارێکی قژ ڕەش

**ئەمجۆرە لە نووسین سەبارەت بە هێزی هەستی سێکسی، ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕیشەیی و کودەتایەکی سەنگین و وێناکردنێکی خۆپەرستانەیە بۆ ئەو جیهانەی کە لۆرانسیزمی لە ئەدەبدا پێ دەناسرێتەوە. ئەی دەبێ نووسینە ئیرۆتیکییەکانی لۆرانس بەر لە ساڵی ١٩١٢ چۆن بوو بێت؟ پێداگرتنی زووی بووە لەسەر جیاوازی و پرسیارکردن و خۆنەویستی**

تاج لە سەرم دەنێن
لێوەکانم دەکەمەوە تا بسکێک لەو قژە بگرم
کاتێکیش جەستەی سپیی چڕی دووکەڵی شەمەندەفەرەکە دەبینم
کە دوور دەفڕێت
لە نائومێدیدا خەریکە بەم ئاخەوە دەخنکێم.

دەبینن چۆن قەسیدەی «ئیرۆتیک» بە توندی پشت بە هەندێ جۆری دووپاتبوونەوە دەبەستێت. بەشێوەیەکی تاسێنەر وێنە و سەرنج کەڵەکە دەکات تا حاڵەتی توندی ئارەزووی سێکسی و بەرەوپێشەوەچوونی ئەو حاڵەتە بخاتە ڕوو. پێدەچێ ئەم برگە کورتانە وەها دارێژرابن تا جەخت لەسەر ئەم سووربوونە بکەنەوە لە گۆڕینییانەوە لە وێنەوە بۆ سیمبوڵ و بۆ هاوکێشەی سۆز وروژێن، ئەمەش «گۆڕانە لە بابەتەوە بۆ تیۆری». لەگەڵ ئەمەشدا دووپاتبوونەوە و ڕیتمی قەسیدەکە جەخت لەسەر ئەو دووپاتبوونەوەیە خۆی و حەتمیەتی ئەزموونە وەسفکراوەکە دەکەنەوە.

شاعیر پێدەچێ لێرەدا هەندێ وەڵام بۆ جیهانی دەرەوەی پێکەوە ببەستێتەوە لەو کاتانەدا کە لە حاڵەتێکی سێکسیی نا ئارامدا دەبێت*.

*ئەم بابەتە لە سایتی «الامبراتور» ەوە وەرگیراوە:
الجنس في اشعار د. ج. لورنس المبكرة
اندرو هاريسون
ترجمة: عمار كازم محمد
بابەتەکەش بەشێکە لە کتێبی (الجنس و الاثارة في الشعر الانكليزي)
تحرير: سی. سی. يارفوت ٢٠٠٦/ لندن.





مایا دیسنۆدەی گۆیا

نۆڤالیسی وێنەکێش تازە مارییای خواستووە. مارییا ئیسپانییە و نۆڤالیسیش بۆیە شەیدای مارییا بووە چونکە لە مایا دیسنۆدەی گۆیا ئەچێت، نۆڤالیس ئەو تابلۆیەی لەهەرچی شتێکی تری دنیا هەیە خۆشتر ئەوێت.

ئەوان پێکەوە چوون بۆ ڕۆم تا لەوێ نیشتەجێ بن. مارییا کاتێک ژووری نووستنەکەی لە ماڵەکەدا بینی لە خۆشیاندا منداڵانە دەستی کرد بە چەپڵەلێدان. مۆبێلەکان لەسەر شێوازی ڤینسیایی بوون لەگەڵ ئەو مۆبێلانەی بە سەدەف ڕازێنرابوونەوە.

یەکەم شەو مارییا لە خۆشی و عەزرەتا ئەلەرزی کاتێک لەسەر ئەو تەختە پەیکەرئاسایە ڕاکشا کە بۆ ژنە دۆقێک دروستکرابوو. پێش خۆگرمۆڵەکردنی لەژێر سەرچەفە تەنکەکەدا بە جۆش و خرۆشەوە لەسەر جێگاکە پاڵکەوت. ئەو پەنجە پەمەییانەی بە قاچە خڕپلانەکانیەوە بوون بە جۆرێک ئەیجولاندەوە وەک بەوەی بیەوێت نۆڤالیس بانگ بکات.

بەڵام تا ئەو ساتەش هەرگیز بە ڕووتی خۆی پیشانی مێردەکەی نەدابوو. یەکەم لەبەرئەوەی ئیسپانی بوو، دووهەم کاسولیک بوو، سێهەمیش زۆر کۆنەپارێزبوو. بۆیە ئەبوو پێش هەر تێکەڵبوونێکیان ڕووناکییەکان بکوژێنەوە.

نۆڤالیس لە تەنیشت تەختەی خەوەکەوە ئەوەستا و بەدوو برۆی پەرێشانەوە سەیری مارییای ئەکرد. بەچەشنێک ئارەزووی ئەوڕۆژا کە دواتر نەی ئەتوانی گوزارشتی لێ بکات و قسەی دڵی خۆیی بۆ بکات. نۆڤالیس ئەیویست جەستەی مارییا ببینێت و باسی جوانییەکانی بکات. چونکە تا ئەو کاتەش

ماریا هێندە جەستەی پیشانی ئەو نەدابوو تا بزانێت چۆنە. جگە لەو چەند شەوەی ئوتێل کە ئاهە سەیرەکانی هەردووکیان لەو سەری دیوارە تەنکەکانەوە ئەبیسترا. ئەو ئاهانەشی کە نۆڤالیس لە کۆتاییدا هەڵی ئەکێشان، ئاهی خۆشەویستێک نەبوو بەقەد ئەوەی ئاخ و ئۆف و تەمەنای وێنەکێش و هونەرمەندێک بوون.

بەڵام ماریا لەپای ئەوەی کە نۆڤالیس وای ئەیکرد نارازی دەرئەبڕی و سوور هەڵئەگەڕا و کەمەکێکیش خۆی زویر ئەکرد. لە قوڵایی دەروونیشیدا هەستی بە گوناهـ و برینداربوون ئەکرد.

"نۆڤالیسی ئازیز، ئێستا ئەوەندە خۆت بێ عەقڵ مەکە و وەرە ناو جێگەکەوە."

بەڵام نۆڤالیس ملی نەئەدا و پێی ئەووت: ئەبێت دەستبەرداری ئەم کۆنەپارێزییە خراپەت بیت. هونەر گاڵتەی بەم زێدەڕۆییکردن و شەرمە دێت کە تۆ ئەیکەیت. جوانی ئینسان زۆر لەوە زیاتر ئەهێنێت کە شانازی پێوەبکرێت و پیشانبدرێت نەک بەوەی بشارێتەوە و بەچاوی سوک سەیربکرێت.

ئەم شەرمەی ماریا وای لە نۆڤالیس ئەکرد ناچاربێت کەمێک هێز بەکاربهێنێت بۆئەوەی دەستە چەپ و ڕاستکراوەکانی لەسەر مەمکەکانی لابەرێت کە پێی ئەشاردنەوە.

ماریا پێ ئەکەنی و ئەیووت: ختوکەم ئەدەیت ناشیرین. تۆ عەزیەتم ئەدەیت.

بەم شێوەیە وردە وردە نۆڤالیس شەیدایانە باسی خانمی و جوانی جەستەی ماریای ئەکرد، ئەویش خۆی شل ئەکرد و ئەیویست وەک منداڵێک بیلاوێنێت. ئەوکاتانەی دوچاری سوکە ئازارێکی خۆشیش ئەبوو، لەڕوی نازەوە جار جارە سوکە نارازییەکی دەرئەبڕی.

کاتێک ماریا ڕووت ئەبووەوە جەستەی وەک مرواریەک ئەبریسکایەوە. چاوەکانی ئەنوقاند بۆ ئەوەی لەشەرمی رووتی خۆی هەڵبێت. شێوەی جوانی جەستەی ماریا چاوی نۆڤالیسی مەست ئەکرد. نۆڤالیس نەی ئەتوانی چاو لەسەر جەستەی ڕاکشاوی ماریا لەسەر سەرچەفەکە لابەرێت.

پێی ئەووت: "تۆ مایا نازدارەکەی گۆیایت".

لە ماوەی ئەو چەند هەفتەیەدا ماریا ڕازی نەئەبوو ببێت بە مۆدێلی بەردەم نۆڤالیس، نەشی ئەهێشت تەنانەت کەسانی تریش ببن بە مۆدێلی. ئەو کاتانەی نۆڤالیس سەرقاڵی کارکردن بوو بێ هیچ ئاگادارکردنێکی پێشوەخت خۆی ئەکرد بە ئەتەلێکەدا و هەندێک قسەی لەگەڵ ئەکرد. دوانیوەڕۆیەک کاتێک خۆی کرد بە ئەتێلیەکەدا ژنێکی ڕووتی لەسەر سەکۆی مۆدێلەکە بینی. ژنەکە بڕبڕەی پێچاوپێچی پشتی کردبووە نۆڤالیس.

لە کۆتایدا ماریا ڕازی بوو بچێتە سەر سەکۆکە. نۆڤالیسش داوای لێکرد ببێت بە مۆدێلی و ئەویش ڕازی بوو. ئەو ڕۆژە گەرمای ناو ئەتەلێکە هێندە کاریگەربوو ماریا خەوی لێکەوت. نۆڤالیسیش بۆ ماوەی سێ سەعات بێ وچان وێنەی کێشا.

ماریا هەروەک چۆن لەبەردەم ئاوێنە گەورەکەی ژووری نووستنەکەدا بێ هیچ شەرمکردنێک جەستەی خۆی ئەبینی ئاوا لەسەر سەکۆکە ڕاکشابوو سەیری خۆی ئەکرد. بەچەشنێک سەیرکردنی جوانی جەستەی داگیری کردبوو، بۆ ساتێک لەبەردەم ڕووت و قووتی خۆیدا هەستی بەشەرم نەکرد. چونکە نۆڤالیس جەستەی ئەوی بە دەموچاوێکی ترەوە وێنە کێشابوو تا هیچ کەسێک نەتوانێت بیناسێتەوە.

بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند و ماریا وەک جاری جارانی لێهاتەوە و نەیهێشت چیتر نۆڤالیس ببینێت و ڕازیش نەبوو وەک مۆدێلێک لەبەردەمیدا ڕابوەستێت. هەموو جارێکیش کە نۆڤالیس ئافرەتێکی لەبەردەمی خۆیدا وەک مۆدێل دائەنا ئەو بەردەوام لە پشتی دەرگاکانەوە ئەوەستا و گوێی شل ئەکرد و سەرەتاتکێی بوو.

ماریا لەتاو ئەو هەموو دڵە خورپە و گومانانەی لە نۆڤالیس هەیبوو نەخۆشکەوت. چیتر شەوان نەی ئەتوانی خەوی لێبکەوێت. دکتۆر حەبی خەوی بۆ نووسی تا ئەو حەبانە بتوانن خەوێکی قوڵی لێ بخەن.

نۆڤالیس هەرچ کات ئەیزانی کە مارییا ئەو حەبە بەهێزانەی خواردووە و خەوێکی قوڵی لێ کەوتووە، بێ ئەوەی مارییا پێ بزانێت بە دزییەوە هەڵئەستا و ئەچووە ناو ئەتەلێکەی، مارییاش بەخەبەر نەئەهاتەوە تا ئەو کاتانەی نۆڤالیس لە هیلاکیدا فلچە و بۆیاخەکانی لەدەست ئەکەوتە خوارەوە. بەیانییەکی زوو نۆڤالیس بەدەم حەزی کارکردنەوە خەبەری بوەوە. بینی کە مارییا بەقوڵی خەوی لێ کەوتووە، ئەمەش بیرۆکەیەکی سەیری لەلا دروستکرد.
سەرچەفەکەی لە سەر مارییا لابرد و دەستی کرد بە داکەندنی جلی شەوەکەی. بێ ئەوەی هەست بە نیشانەیەکی بەخەبەرهاتنەوەی مارییا بکات ژێرکراسەکەی تا سەرو مەمکەکانی بەرزکردەوە. بەو شێوەیە لەویادا هەموو جەستەی بە تەواوەتی کەوتە بەرچاوی نۆڤالیس، ئەویش تا توانی پڕ بە دڵ سەیریکرد. مارییا بەجۆرێک ڕاکشابوو دەستەکانی کەوتبوونە ئەملاولایەوە و مەمکەکانی وەک نێچیرێکی گیراو کەوتوبوونە بەر نیگاکانی. بەو سەیرکردنە ئارەزووی نۆڤالیس وروژا بەڵام نەیوێرا دەستیان بۆ بەرێت. لەبری ئەوە چوو بەدوای وەرەقە و قەڵەمدا گەڕا و دەستیکرد بە وێنەکێشانی. کاتێک نۆڤالیس وێنەی مارییای ئەکێشا واهەستی ئەکرد لەگەڵ کێشانی هەر هێڵێکدا دەست بە جەستەی مارییادا دێنێت.
بەو شێوەیە بۆ ماوەی دوو سەعات نۆڤالیس توانی بەردەوامبێت. کاتێکیش هەستیکرد حەبی خەوەکە خەریکە کاریگەری لەسەر مارییا نامێنێت، ژێرکراسەکەی داکێشایە خوارەوە، پێش ئەوەی ژوورەکەش بەجێبهێڵێت سەرچەفەکەی سەرلەنوێ پیادایەوە.
لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا بەهۆی دەست پێکردن بە عادەتێکی تازە بۆ کارکردن لەلایەن نۆڤالیسەوە، مارییا توشی سەرسوڕمان بوو. بە درێژای ڕۆژ نۆڤالیس خۆی ئەخزاندە ئەتەلێکە و سەرقاڵی وێنەکێشان بوو ـ ئەو وێنانەی کە سەرلەبەیانیان ئەیکێشان.

بەم شێوەیە نۆڤالیس چەندان وێنەی مارییای ئامادەکرد. وێنەکان ساتەکانی خەوتن و پشوودانی مارییایان پیشان ئەدا، تەواو وەک ئەو یەکەم وێنەیەی کە یەکەمجار کێشابووی. مارییا سەری سوڕمابوو لەو هەموو سەرقاڵییەی نۆڤالیس، وای ئەزانی ئەو تەنها خەریکی دووبارەکردنەوە و گۆڕانکاری ئەو یەکەم تابلۆیەیە کە کێشابووی. نۆڤالیس هەمیشە دەموچاوی ناو تابلۆکانی ئەگۆڕی. چونکە دەموچاوە ئاساییەکەی مارییا دیار و ئاشکرابوو، هەرچ کەسێکیش تابلۆکانی ببینیایە باوەڕی نەئەکرد ئەو جەستەیە جەستەی مارییایە وێنەکێشراوە.
چیتر نۆڤالیس لەکاتی بەخەبەربوونی مارییادا ئارەزووی سێکسی نەبوو لەگەڵیدا و بە سیمایەکی سادە و نیگایەکی تیژەوە تێی ئەڕوانی. ئەو تەنها لەکاتێکدا ئارەزووی سێکسی هەبوو بۆی کە بەو جەستە پڕ و نەرمەیەوە ڕائەکشا و خەوی لێ ئەکەوت.
نۆڤالیس یەک لە دوای یەک وێنەی مارییای ئەکێشا. کاتێکیش لە ئەتەلیەکەدا تەنیا ئەبوو لەبەرامبەر دواهەمین تابلۆدا لەسەر قەنەفەکەی بەرامبەری دائەنیشت. کە سەیری مەمکەکانی و قەوسی سکی و توکەبەری نێوان ڕانەکانی مارییای ئەکرد، هەستی بە شەپۆلێکی گەرما ئەکرد بە جەستەیدا دێت و ئەچێت، هەستی ئەکرد کە چۆن ئارەزووی خەریکە گڕئەگرێت و تابلۆکە کاریگەری لەسەر دائەنێت. خۆشی سەری لەوە سوڕئەما کە چۆن ئەو تابلۆیە ئەتوانێت هێندە کاریگەری لەسەر دابنێت.
بەردەوام سەیری تابلۆکەی ئەکرد و بەجۆرێک ئەهاتە بەرچاوی کە ئەوە کچی ناو تابلۆکەیە بەدەستە جوانەکانی دەستی بۆ ئەبات. قۆپچەکانی پانتۆڵەکەی ئەکردەوە و بەهێواشی دەستی بەخۆیدا ئەهێنا... دوای ڕەحەتبوونیش لەسەر پشت بەهیلاکی لەبەردەم تابلۆکەدا پاڵ ئەکەوت.

بۆ ڕۆژی دواتر سەرلەنوێ لەبەردەم مارییای خەوتوودا ئەوەستایەوە. تۆزقاڵێک ڕانەکانی لەیەکتری ئەترازاند تا خەتی نێوان ڕانەکانی ئەبینی. هەر بە پێوە سەرنجی خاویی و شێوە ڕاکشانی مارییای ئەدا و سەرلەنوێ دەستی بۆ خۆی ئەبردەوە، وا بەخەیاڵیدا ئەهات ئەوە دەستی مارییایە نەک خۆی. مارییا کەمجار دەستی بۆ کێری نۆڤالیس ئەبرد و یاری پێ ئەکرد. هەمیشە خۆی ئەکشاندەوە و نەی ئەویست دەستی بۆ پیابهێنێت. ئەوەتا ئێستا خۆی بەدەستە بەهێزەکانی لەبەردەمیدا گرتوێتی.
مارییا زوو تێگەیشت کە عەشقی ئەوی لەدەستداوە. نەی ئەزانی چی بکات تا دڵی نۆڤالیس جارێکی تر بەلای خۆیدا ڕابکێشێتەوە. پێیوابوو نۆڤالیس تەنها لە کاتی وێنەکێشاندا جەستەی ئەوی خۆشئەوێت.
نۆڤالیس بەجۆرێکی هێندە هونەرمەندانە ئەوەی خۆی گرتبوو کە هەرگیز پێشتر بەو جۆرە تاقی نەکردبووەوە. پەیکەرێکی لە ساتی ڕاکشاندا هێندەی قەبارەی ڕاستەقینەی مارییا بە هەموو وردەکارییەکانیەوە دروستکردبوو. پەیکەرە خەوتووەکە هەرچی جێگای جوانی جەستەی هەبوو تیایدا دەرکەوتبوو.
مارییا لەگەڵ هەندێک لە هاوڕێکانیدا سەفەریکرد بۆ لادێ تا بۆ هەفتەیەک لەوێ بمێنێتەوە، بەڵام دوای چەند ڕۆژێک نەخۆشکەوت و ناچار گەڕایەوە بۆ ئەوەی سەردانی دکتۆر بکات. کاتێک گەڕایەوە ماڵەوە، ماڵەکە چۆڵ و هۆڵ دیاربوو وەک ئەوەی کەسی تیادا نەژی. مارییا لەسەر نوکی پەنجە بەرەو ئەتەلییەکەی نۆڤالیس چوو. هیچ دەنگێکی گوێ لێ نەبوو. پێی وابوو ئێستا نۆڤالیس لە ژوورەوەیە و لەگەڵ ژنێکدا ڕائەبوێرێت. بە هێواشی نزیک دەرگاکە بووەوە و بەئەسپایی وەک دزێک دەرگاکەی ترازاند. لەپڕ چاوی چووە سەر شتێکی چاوەڕوان نەکراو: لە ناوەڕاستی ئەتەلێکەدا پەیکەرێکی خۆی بینی، نۆڤالیسیشی بینی بە ڕوتوقوتی و بەقژی بژەوە خۆی لەپەیکەرەکە ئەخشێنێت. نۆڤالیس هێندە بە زەوق بوو کە هیچ کاتێک مارییا پێشتر کێری ئەوی بەو ڕەپییە نەبینی بوو.
نۆڤالیس بە زەوقەوە لەگەڵ پەیکەرەکەدا ئەجولایەوە، ماچی ئەکرد و بەجۆرێک دەمی ئەخستە نێوان ڕانەکانییەوە کە لە ڕاستیدا پێشتر هەرگیز ئاوا بەو شێوەیە لەگەڵ مارییادا نەیکردبوو. نۆڤالیس هیچی لە خۆیەوە نەئالاندبوو ئەو کۆمەڵە سەرچەفە گەورانەشی کە بڵاویکردبوونەوە بەدەوری خۆیدا هێندەی تر ڕووتی و گەرمی و ئارەزووی ئەویان بەرجەستە تر ئەکرد. لەو کاتانەشدا نیگای هەوەسدارانەی ئەگرتە تابلۆکان و لەهەمانکاتیشدا بەردەوام باوەشی بە پەیکەرەکەدا کردبوو. ئارەزوویەکی شێتانە و ڕاستەقینەی وای لەگەڵ پەیکەرەکەدا هەبوو، کە هاوسەرەکەی شتی وای لە ڕاستیدا لێ نەبینیبوو لەگەڵ خۆیدا. کاتێک مارییا سەرنجی لەو دیمەنە سەیرە ئەدا هەستی ئەکرد یەکەمجارە بەو شێوەیە هەوەسی خەفەبووی بڵێسە بسەنێت. چووە ژوورەوە و جلەکانی لەبەری خۆی داکەند و وەک مارییایەکی نوێ و زیندوو خۆی پیشانی نۆڤالیس دا. بەڕادەیەک هەوەسێکی وای تیابزوابوو کە لەهەوەسی ناو تابلۆ کێشراوەکان ئەچوو. بێ هیچ دوودڵی و هەستکردن بە عەیبەیەک جەستەی خۆی خستە بەردەمی نۆڤالیس، ئەیویست جەستەی ڕاستەقینەی خۆی زۆر زیاتر لە جوانی جەستەی ناو تابلۆ کێشراوەکان و پەیکەرەکە پیشانبدات، واش لە نۆڤالیس بکات بەیەکجاری هەموویان لەبیربکات.

سەرچاوە
Anais Nin
Venusbarn
ö; Mikael Mörling
Axlings Tryckeri AB

# فەمەنیزم و کەلتوری گشتی

نووسنی: دومینیك ئەستریناتی
و.لەفارسییەوە: ڕێبین هەردی

زیادبونی تێبینیکردنی ئامادەبونی ژنان لە کلتوری گشتیدا لەناو بواری لێکۆڵینەوەی کلتوری و کۆمەڵناسی کلتوریدا بەشێکە لە ژیانەوەی فراوانتری فەمەنیزم و تیورەی فەمەنیستی. فەمەنیزم وەک بزوتنەوەیەکی ڕۆشنبیری و ئاراستەیەکی سیاسی، مێژویەکی دێرینی هەیە. بەڵام دەرکەوتنی بزوتنەوەی تازەی ژنان لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٥٠ بە دواوە کە بە شیکردنەوە و ڕەخنەی چۆنێتی و هۆی هەڵسوکەوتی کلتوری گشتی و دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەگەڵ ژناندا و ئامادەبونیان بەشێوەیەکی بێویژدانانە، نادادپەروەرانە و وەبەرهێنەرانە هەڵساوە لە چوارچێوەی هەمەکی تری نایەکسانی دوو ڕەگەز و سەرکوتی ژناندا، خاڵی سەرەکی ئەم فەسڵە ئەبێت.

**زۆرێك لەبەرهەمە سەرەتاییەکان لەبارەی ژنان و کلتوری گشتیەوە چەقیان لەسەر ئەوە گرتووە کە تاکمان (Tuchman) ناوی ئەنێت "لەناوچونی سیمبۆلیکی ژنان. ئەم خاڵە ئاماژە بۆ فەرامۆشکردنی بەرهەمهێنانی کلتور و دوبارە بەرهەمهێنانەوەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بۆ ژنان و لە ئەنجامدا پەراوێزخستن و بە هیچ ئەژمارکردنی ژنان ئەکات. ژنان یان لە بواری کۆمەڵایەتیدا ئامادەییان نیە و یان بەشێوەی چینێك پیشان ئەدرێن کە لەسەر بنەمای جەزابیەتی جنسی و ئەنجامدانی ئەرکی ناو ماڵ فۆرمیان وەرگرتووە**


باربارا تاکمان

وەک لە بەشەکانی دیدا ئەیبینین ئەکرێت ئەوە بڵێین کە سێ لقی فەمەنیزم گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە: فەمەنیزمی لیبراڵی کە سودوەرگرتن و بەرهەمهێنانەوەی نایەکسان و وەبەرهێنانەوەی ژنان لە دەزگاکانی راگەیاندن و کلتوری گشتیدا رەخنە ئەکات و بڕوای وایە بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە ئەبێت کۆمەڵێک یاسا دابنرێت کە هەلی یەکسان بۆ ژنان دابین ئەکات. فەمەنیزمی رادیکاڵ کە بڕوای وایە بەرژەوەندی ژنان و پیاوان لەبنەڕەتدا و بەشێوەیەکی ناچاری لەیەک جیاوازن و بڕوای وایە باوکسالاری و سەرکوتی ژنـان گرنگترین شـێوەی مێژووی دابەشبونی کار و سەرکوتکردنە و بۆ چارەسەری ئەم کێشەیەش پێشنیاری جیابونەوەی تەواوی ژنان و پیاوان ئەکات. دواجار فەمەنیزمی سۆسیالیستی کە جەختکردنی فەمەنیزمی رادیکاڵ لەسەر باوکسالاری قـەبوڵ ئـەکـات، بـەڵام هـەوڵ ئـەدات سـودی بۆ شیکردنەوەی سەرمایەداری وەربگرێت و رێگەچارەی ئەم کێشەیە لە چاکسازی ریشەیی لە پەیوەندی نێوان ژنان و پیاوان وەک بەشێکی جیانەبوەوە لە دەرکەوتنی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی ئەدۆزێتەوە. لەساڵەکانی دواییدا لە لێکۆڵینەی کلتوری گشتیدا ئەم جیاوازیانە هەست پێ نەکراوترە و فەمەنیزمی رادیکاڵ کەم کەم فەرامۆش کراوە. ئەمرۆ فەمەنیزم هەوڵئەدا دیدێکی «لیبرالانەتر» بۆ بونیادەکانی دەسەڵاتی جنسی کە تیاییدا نایەکسانی نێوان ژنان و پیاوان بە دیاردەیەکی کلتوری و کۆمەڵایەتی لە قەڵەم ئەدرێت بە یەکەوە تێکەڵبکرێت و لە شیکردنەوەی فەمەنیستی خۆیاندا سودیان لە دیدێک وەرگرتووە کە بۆ ژنان کە گرنگیەکی زیاتر بۆ ژنان دائەنێت و لە چوارچێوەیەکی تیوریدا کە چینەکان، ڕەگەزەکان و ئەتنیەت و دابەشکردنە کۆمەڵایەتیەکانی تر لەبەرچاو ئەگرێت. ئەجوڵێت.

تیورەکان و دیدەکان کە تا ئێستا لەم کتێبەدا باسمکردوە یان تایبەتن بە لێکۆڵینەوەی کلتور —

وەک سیمۆلۆجیا و یان تیورەی کلتوری جەماوەری- یان پەنایان بۆ شێوازێکی هەمەکیتر و بەربڵاوتری لێکۆڵینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان بردووە- وەک بونیادگەری یان مارکسیزم-. فەمەنیزم لەڕوی فراوانی و ڕادەی ناوەڕۆک و ئەو کێشانەی باسیان ئەکات، لەگەڵ دیدی دوهەمدا خاڵی هاوبەشی زۆرتری هەیە. لەڕاستیدا فەمەنیزم بەهەمان ڕادەی گرنگی بە مێژووی روشنبیری لێکۆڵینەوەی کلتوری گشتی ئەدات، گرنگی بە مێژووی بوارەکانی تری لێکۆڵینەوەی زانستی و کۆمەڵایەتی ئەدات. دیدی فەمەنیستی هەموو ئەو دیدانەی تر کە لەم کتێبەدا باسکراون بە وردی تاوتوێ ئەکات و لێرەوە هەڵسەنگاندنی مێژوی لێکۆڵینەوە کلتوریەکانیش لەخۆ ئەگرێت. لێرەوە فەمەنیزم و کلتوری گشتی وەک دوو شێوازی پێکەوە گرێدراو تاوتوێ ئەکرێت. سەرەتا رەخنەی فەمەنیستی لە کلتوری گشتی لە لێکۆڵینەوە کلتوریەکاندا رەچاو ئەکرێت. فەمەنیستەکان رەخنەیان لە چەند بابەتێکی جیاوازی لەم بوارەدا هەیە، بەڵام هەندێک لەم رەخنانە گرنگیەکی زیاتریان هەیە. بۆ نمونە پیشاندانی کلتوری گشتی بۆ ژنان کە لە پەراوێزدان یان لە قاڵبی لە پێشەوە دیاریکراو دایاندەنێن، یان ئامادەنەبونی ژنان لە بەرهەمهێنانی کلتوریدا و نادیدەگرتنی ژنان وەک بەشێک لە جەماوەری پەیامگێڕ لە کلتوری گشتیدا. فەمەنیستەکانیش بەهەمان ڕادە ناڕازی بون لە شێوەی بەرخوردی لێکۆڵینەوە ئەکادیمیەکان لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتی و کلتوریەکاندا و بڕوایان وایە ئەوانیش بە پێی خۆیان ئەم پرۆسەیە توندتر ئەکەن. چونکە پێگەی ژنان و سەرکوتکردنیان بە جدی وەرناگرن. لێکوڵینەوەی ئەکادیمیش وەک کلتوری گشتی ژنان وەک چینێکی کۆمەڵایەتی نادیدە ئەگرێت یان بە هیچی دائەنێت. لە ئەنجامدا فەمەنیستەکان بە پێی ئەرگۆمێنتی سیاسی و فکری ئەم لێکۆڵینەوانە بە فەرمی ناناسن.

رەخنەی فەمنیستی کۆی ئەو روانگە و دیدانە کە ئەمجۆرە چەوسانەوە جنسیە قەبوڵ ئەکەن، ئەکەنە ئامانجی خۆیان. لە روانگەی فەمەینستەکانەوە هەندێک لەم شێوازانە زۆر گرنگ و کاریگەر بوون. گامان و مارشمنت ئەم خاڵە بەمجۆرە ئەخەنە ڕوو: «فەمەنیستەکان لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠دا بروایان وابوو ئەزمونی ژنان ملکەچی پۆلبەندی و ئەو رەمزانەیە کە بە هۆیانەوە خۆی دەرئەبڕێ. لێرەدا دیدی تایبەتی فەمەنیستەکان بۆ مارکسیزمی ئەوروپی شایەنی راوەستانە. فەمنیستەکان سودیان لە بەرهەمەکانی گرامشی و ئاڵتۆسیر لەبارەی «عەقڵی تەندروست» و «ئایدۆلۆژیەوە« و ئەو بەرهەمانەی کە لە دەرونناسیەوە باسی جنسیەتیان کردووە بۆ «سیاسیکردنی» ژیانی رۆژانە - کلتور بە مانای تایبەتی ئەتنۆلۆگیەکەی لەبارەی ئادابی زیندوی کۆمەڵگاوە، وەرگرتووە. و ئالەنگاری (تەحەدا) پێناسی کلتور بون بۆ ژنایەتی و پیاوەتی.

بەڵام گەرچی زۆرێک لە لێکۆڵینەوە و باسە فەمەنیستەکان سودیان لە دید و میتۆد و تیورەکانی ئەم بەرهەمانە وەرگرتووە (وەک سودوەرگرتن لە سیمۆلۆجیا بۆ شکاندنی هێماکانی چەوساندنەوەی جنسی)، ئەم لیکۆڵینەوانە بە هۆی سەرنەکەوتنیان لەتاوتوێ کردنی مەسەلەی ژنان و جنسیەت رەخنە کراون. ئەم رەخنەیەش بە نۆبەتی خۆیان بۆنەتە هۆی وتوێژی بەربڵاو لەنێوان فەمەنیستەکان و دەرکەوتنی شیکردنەوە فەنیستیەکان بۆ کلتوری گشتی. ئەم هەوڵانە دووەم خاڵی گرنگی ئەم فەسڵە پێک ئەهێنێت. خاڵێکی سەرنجڕاکێشەر کە لەبارەی

ئەم شیکردنەوانەوە هەیە ئەوەیە هەندێک لەو تیورانەی کە لە فەسڵەکانی دواییدا باسی ئەکەین، بە شێوەیەکی کاریگەر رەخنە کراون و پێئەچێت ئەو رەخنانەی تر بسەلمێنن کە پێشتر لەم تیورانە گیراون. بەشێوەیەکی هەمەکی ئەم شیکردنەوانە ئەتوانن ماهیەتی لیکۆڵینەوە فەمەنیستیەکانی کلتوری گشتی دیارتر بکەن و ئالەنگاری (تەحەدا) جدی فەمەنیسم بۆ تیورە و دیدەکانی پێشوتر لەبارەی کلتوری گشتیەوە ئاشکراتر بکەن.

### رەخنەی فەمەنیستی

زۆرێک لەبەرهەمە سەرەتاییەکان لەبارەی ژنان و کلتوری گشتیەوە چەقیان لەسەر ئەوە گرتووە کە تاکمان (Tuchman) ناوی ئەنێت "لەناوچونی سیمبۆلیکی ژنان. ئەم خاڵە ئاماژە بۆ فەرامۆشکردنی بەرهەمهێنانی کلتور و دوبارە بەرهەمهێنانەوەی دەزگاکانی راگەیاندن بۆ ژنان و لە ئەنجامدا پەراوێزخستن و بە هیچ ئەژمارکردنی ژنان ئەکات. ژنان یان لە بواری کۆمەڵایەتیدا ئامادەییان نیە و یان بەشێوەی چینێک پیشان ئەدرێن کە لەسەر بنەمای جەزابیەتی جنسی و ئەنجامدانی ئەرکی ناو ماڵ فۆرمیان وەرگرتووە (ئەبێ ئەوەمان لە بیر بێت کە سەرنجی کلتوری گشتی بۆ ژنان بەشیوەیەکی سەرەکی خۆی بۆ دوبارە بەرهەمهێنانەوە و روکەشی ژنان تەرخان کردووە).

وێنای کلتوریی ژنان لە میدیادا لە روانگەی فەمەنیستەکانەوە بە ئاراستەی پاراستن و دابەشکردنی کاری جنسی و بەهێزکردنی چەمکە قەبوڵکراوەکان لەبارەی ژنایەتی و پیاوەتیەوە بەکار ئەهێنرێت. دەزگاکانی راگەیاندن بە "لەناوچونی سیمبولیکی ژنان" پێمان ئەڵێن ژنان ئەبێت لە دەوری هاوسەر، دایک، کەیبانودا دەرکەون و لە کۆمەڵگایەکی باوکسالاردا چارەنوسی ژنان لەمە زیاتر نیە. دوبارە بەرهەمهێنانەوەی کلتوری شێوەی ئەم دەورانە فێری ژنان ئەکات و هەوڵئەدات ئەم دەورانە لەبەرچاوی ژناندا بە سروشتی لە قەڵەم بدات"٤". ڤان زۆنین (Van Zoonen) ئەم خاڵانە بەمشێوەی خوارەوە کورت ئەکاتەوە:

زۆرێک لە شیکردنەوەی ناوەڕۆکی چەندایەتی ئەوەیان دەرخستووە کە ژنان بەدەگمەن لە میدیادا دەرئەکەون، چ لە وێنەی هاوسەر، دایک، کچ، دەزگیران یان لە قاڵبی ئەو کارانەدا کە بەشیوەیەکی تەقلیدی ژنانەن (سکرتێر، پەرستار، کارمەندی بەشی پیشوازی) یان تەنانەت وەک شتێکی سێکسی. سەرەرای ئەمە ژنان بە گشتی گەنج و جوانن، بەڵام زۆر خوێندەواریان نیە. لێکۆڵینەوە ئەزمونیەکان لەبارەی دەروناسی ناسینەوە ئەم تیورەیە ئەسەلمێنێت کە میدیا بەشێوەی دەزگا کار ئەکەن —وەک خێزان— و بەتایبەتی مناڵان فێری دەوری جنسی گونجاو ئەکەن و رەفتاری گونجاو تەقدیت ئەکەن...خەڵکی بەگشتی بروایان وایە میدیا چوارچێوەکانی دەورە جنسیەکان بەهێز ئەکەن، چونکە رەنگدانەوەی بەها کۆمەڵایەتیە باڵادەستەکانن و هەروەها لەبەر ئەوەی بەرهەمهێنی بەرنامەکان لە میدیادا کە پیاون لەژێر کاریگەری ئەم قاڵبانەدان.

ئەم کورتەیە بە باشی خاڵی هاوبەشی ئەم دیدانە و دیدەکانی تر لە ئایدۆلۆژیای باڵادەستە دەرئەخات کە لەم کتێبەدا ئاماژەیان بۆ کراوە.

تاکمان لەبارەی سەرکەوتویی میدیا لە لەناوچونی "سیمبولیکی ژنان"دا بە دورودرێژی قسەی کردووە. لە روانگەی تاکمانەوە ئەم روانگەیە پەیوەندی بە "تیورەی رەنگدانەوە" هەیە کە بڕوای وایە میدیا

**زۆرێك لە شیکردنەوەی ناوەڕۆکی چەندایەتی ئەوەیان دەرخستووە کە ژنان بەدەگمەن لە میدیادا دەرئەکەون، چ لە وێنەی هاوسەر، دایك، کچ، دەزگیران یان لە قاڵبی ئەو کارانەدا کە بەشیوەیەکی تەقلیدی ژنانەن (سکرتێر، پەرستار، کارمەندی بەشی پیشوازی) یان تەنانەت وەك شتێکی سێکسی. سەرەرای ئەمە ژنان بە گشتی گەنج و جوانن، بەڵام زۆر خۆێندەواریان نیە. لێکۆڵینەوە ئەزمونیەکان لەبارەی دەروناسی ناسینەوە ئەم تیورەیە ئەسەلمێنێت کە میدیا بەشێوەی دەزگا کار ئەکەن —وەك خێزان- و بەتایبەتی مناڵان فێری دەوری جنسی گونجاو ئەکەن و رەفتاری گونجاو تەقدیت ئەکەن...**

رەنگدانەوەی بەها کۆمەڵایەتیە باڵادەستەکانە. ئەم بەهایانە پەیوەندیان بە کۆمەڵگای واقعیەوە نیە، بەڵکو پەیوەندیان بە "دوبارە بەرهەمهێنانەوەی سیمبولیک"ی کۆمەڵگاوە هەیە، واتە بەوجۆرەی کۆمەڵگا حەز ئەکات خۆی ببینێت. تاکمان بروای وایە کە ئەگەر بابەتێک بەمشێوەیە دەرنەکەوێت، "لەناوچونی سیمبولیک" رووئەدات: "مەحکوم بون بە هیچ ئەژمارکردن یان نائامادە بوون کە با مانای لەناوچونی سیموبولیکە. تاکمان لەبارەی پیشاندانەوەی سیمبولیکی ژنان لە میدیاکانی ئەمەریکادا، ئەڵێت"گەرچی ژنان ٥١٪ سەرژمێر و زیاد لە ٤٠٪ ی هێزی کاری ئەم وڵاتە پێک ئەهێنن، ژمارەیەکی کەمیان بەمشێوەیە پیشان ئەدرێن: "ئەو ژنە کرێکارانەی وێنەیان ئەگیرێت، مەحکوم ئەبن، ئەوانی دی بە هیچ ئەژمێرێن: وەک کۆمەڵێک بوکەشوشە دەرئەکەون کە ئەبێت چاودێری بکرێن، یان لە چوار دیواری ماڵەوەدا سنوردار ئەکرێن. بە کورتی ئەوان مەحکومن بە "لەناوچونی سیمبولیک". گریمانەی رەنگدانەوە بروای وایە کە میدیا بۆ راکێشانی سەرنجی وەرگرەکان ئەبێت بەها کۆمەڵایەتیەکان رەنگ بداتەوە. بۆ زیادکردنی ژمارەی وەرگران بەو مانایەیە کە ئەبێت دەست بە "لەناوچونی سیمبولیکی" ژنان بکەن و ژنان لە شوێنی کاریان فەرامۆش بکەن یان بە وێنەکێشانیان لە چوارچێوەی خانوەکانیاندا، بە هیچ پیشانیان بدەن".

بە تاوتوێکردنی ئەو بەڵگانەی لەنێوان دەیەکانی ١٩٥٠ و ناوەڕاست و کۆتاییەکانی دەیەکانی ١٩٧٠ لە ئەمەریکادا هەبووە، تاکمان بەو دەرئەنجامە گەیشت کە ئەم مەسەلەیە لەبارەی تەلەفیزیۆن بە گشتی و رۆژنامەکانی ئەمەریکاوە راستە. تاکمان

لەبارە تەلەفیزێۆنەوە بەم راستیە سەرسوڕهێنەرانە گەیشت: "ژنان بەشێوەیەکی بەرچاو ونن و پیاوان هەموو بەرنامەکانیان داگیر کردووە: ئەو پیاوانەی وێنەیان کێشراوە هەمیشە پیشەیەکیان هەیە، لەکاتێکدا ژمارەی ئەو ژنانەی پیشەیەکیان هەیە بە پەنجەی دەست ئەژمێردرێن و زوربەشیان سەرکەوتوو نین بەشێوەیەکی بڕاوە لەروی لێهاتویەوە لەهاوکارە پیاوەکانیان کەمترن و ئەوەی کە بەشیوەیەکی گشتی ژنان لەو پیشانەدا دەرناکەون کە تایبەتن بە پیاو. پیاوان دکتۆرن، ژنان پەرستار. پیاوان پارێزەرن، ژنان سکرتێر، پیاوان لە کارخانەی گەورەدا کار ئەکەن، ژنان لە دۆکانی جل فرۆشتندا". تاکمان لە درێژەی ئەو بابەتەدا ئەنوسێت"بە وێنەکیشانی نەتوانینی یان ڕاستر کەم توانای ژنـان لە ڕێی بەدناوکردن، قوربانی کردن و بەهیچ ئەژمارکردنەوە رووئـەدات. کاتێک ژنان لە تەلەفیزێۆندا دەرگیری توندوتیژی ئەبن، بە پێچەوانەی پیاوانەوە بەگشتی لە دەوری قوربانیدا دەرئەکەون نەک لە دەوری هێرشبەردا. خاڵێکی دی کە لەمە گرنگترە ئەوەیە کە نمونەکانی چالاکیەکانی ژنان لە توندوتیژیەکانی تەلەفیزێۆندا پیشاندانی سەلماندنی ژنانی شوکردوو و مەحکومیەتی ژنانی رەبەن و بەتاڵە" (ه.س.پ) لەناوچونی سیمبولیکی ژنان لە پەیامە بازرگانیەکانی تەلەفیزێۆنیشدا دەرئەکەوێت: "تاوتوێکردنی پەیامە بازرگانیەکانی تەلەفیزێۆن تیورەی رەنگدانەوە ئەسەلمێنن. لـەو پەیامانەدا کە دەنگی بێژەر ئەبیسترێن و تیایدا یەک رەگەز (ژنان یان پیاوان) بونیان هەیە. پەیامەکان ژنان فەرامۆش ئەکەن یان لە قاڵبی لە پێشەوە دیاریکراو دایان ئەنێن. ئەم پەیامانە لەو وێنانەدا کە لە ژنان پیشانی ئەدەن ژنان لە دەوری کەیبانوو، هاوسەر، دایک، ژنیماڵەوە و شتێکی سێکسی پیشان ئەدەن و ئەو دەورەی لە کۆمەڵگادا ئەیبینن، سنورداری ئەکەن".

بـڵاوکـراو و گۆڤارەکانیش بەڵگەیەکی زیاتر بۆ لەناوبردنی سیمبولیکی ژنان بەدەستەوە ئەدەن. بەڵام بەرپرسیاری گۆڤاری ژنان بە بەراورد لەگەڵ میدیاکانی تردا لەمڕووە ناڕاستەخۆ ترە. چونکە پەیام وەرگرانی ئەوانە پسپۆرتر و ژمارەیان کەمترە و ئەمەش بەمانای ئەوەیە گریمانەی ڕەنگدانەوە بە ئاسانی لەبارەی ئەمانەوە راسـت نیە. ئەوە راستە لێکۆلینەوە لەبارەی گۆڤاری ژنانیشەوە "بەو دەرئەنجامە گەیشتووە کە لەم میدیایەشدا جەختکردن لە دەورە تەقلیدی و بەدناوی ژنانی کرێکار هەیە" بەڵام لە هەمانکاتدا جیاوازی نێوان گۆڤارەکانی چینی کرێکار و چینی ناوەڕاست زۆر سەرنج راکێشەرە...ئەم جیاوازیە رەنگدانەوەی ئەو راستیەیە کە گۆڤارەکانی ژنان ئەتوانن بە بەراورد بە تەلەفزێۆن، وەڵامدەرەوەی پێداویستیەکانی ژنان بن، چونکە تەلەفیزێۆن ناچارە سەرنجی ژمارەیەکی زۆرتـــری وەرگـرانـی پـەیـام کـە کەمتر پسپۆرن رابکێشێت. کاتێک ژمارەی وەرگرانی پەیام کەمتر بێت، گۆڤارەکانی ژنان ئەتوانن لەبەرامبەر ئەو گۆڕانانەی لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ژناندا دروست ئەبێت، لە تەلەفیزێۆنی گشتی هەستیارتر بن. بەپێی دەربڕینەکانی تاکمان لێکۆلینەوەکان پیشانیان داوە کە ئەو گۆڤارانەی کە زۆرتر ئاراستەی چینی کرێکار کـراون. ژنانیش وەک کرێکارانی سەرکەوتوو و سەربەخۆ پیشان ئەدەن، لە کاتێکدا ئەو گۆڤارانەی زوربەی خوێنەرەکانیان لە چینی ناوەڕاستن، ژنان لەم چوارچێوەیەدا دەرنـاکـەون. لەگەڵ ئەمەشدا تاکمان جەخت لەوە ئەکات ناکرێت ئەم باسە بۆ هەموو حاڵەتەکان گشتگیر بکرێت، تەنانەت گەر

گۆڤارەکانی ژنان (چ لە بارەی چینی ناوەڕاست یان چینی کرێکارەوە) بە بەراورد لەگەڵ بوارەکانی تری میدیاکاندا بەشێوەیەکی ئاسانتر گۆڕانە کۆمەڵایەتیەکانی پێگەی ژنان وەک دەرکەوتنی بزوتنەوەی ژنان بە فەرمی بناسن. تاکمان لە کۆتایدا بەو دەرئەنجامە ئەگات "وێنەی ژنان لە گۆڤارەکانی ژناندا سەبارەت بە گۆڕانکاریەکان، هەستیارترە لە لەناوچونی سیمبولیک و چوارچێوە سەرسەختەکان لە تەلەفیزێۆندا. ئەو دەورە جنسیانەی کە لە ژنان وێنا ئەکرێن کەمتر قاڵبین، بەڵام دەوریان هێشتا سنوردارە. کچێکی منداڵ هەمیشە لە کۆتاییدا دایکێکە نەک ژنێک کە لە ئایندەدا دەورێکی دروستکەری لە هێزی کاردا هەیە".

لێرەوە لە کرداردا ئەم پرۆسە گشتیە بەو مانایە بووە کە ژنان و پیاوان لە میدیای گشتیدا بەجۆرێک پیشان ئەدرێن کە لەگەڵ دەورە کلێشەیە کلتوریەکاندا بگونجێن کە بە ئاراستەی بیناکردنەوەی دەورە جنسیە تەقلیدیەکان بەکار ئەبرێن. بەگشتی پیاوان لەوێنەی مرۆڤی باڵادەست، چالاک، هێرشبەر و بەدەسەڵاتدا وێنە ئەکرێن و دەوری هەمەڕەنگ و گرنگ دەرئەکەون کە سەرکەوتن تیایاندا بەگشتی پێویستی بە لیهاتوی پیشەیی، توانست و لۆژیک و دەسەڵات هەیە. لە بەرامبەردا ژنان بەگشتی وەک پەیڕەو، بەرکار، تەسلیم و کەم بایەخن و لە کاری لاوەکی و پڕوکێنەرەرێکدا کە رەگەزیان، هەستیان و نا ئاڵۆزیان بەسەریدا سەپاندون، دەر ئەکەون. میدیاکان بە پیشاندانی پیاوان و ژنان بەمشیوەیە، ماهیەتی سروشتی دەورە جنسیەکان و نایەکسانی جنسی ئەسەلمێنن. خاڵێک کە لێرەدا جێگەی نیگەرانیە ئەوەیە کە "لەناوچونی سیمبولیک" بەو مانایەیە کە ژنان ژیانیان و بەرژەوەندیەکانیان بەشێوەیەکی شایستە لە میدیاکاندا ڕەنگ ناداتەوە. کلتوری میدیای گشتی ژیانی واقعی ژنان بە ئێمە پیشان نادات، دەرئەنجام نا ئامادەیی، مەحکومیەت و بە هیچ ئەژمارکردنی ژنان، سڕینەوە، دەمارگیری و بریندارکردنی ژنانە لە میدیای گشتیدا. وەک ئەو دیدانەی تر کە روبەڕویان بوینەتەوە دەریان خستووە، ئەو بانگەشەیەی کە کراوە ئەوەیە کە کلتوری گشتی پێگەیەکی خەیاڵی و دنیایەکی جیا لە دنیای واقعی پێشکەش بە مەسرەفکەران ئەکات، نەک دنیایەکی واقعی. ئەگەر میدیای گشتی بیانەوێت لە ئاشناکردنی خەلکیدا بە ڕاستی دەورە جنسیەکانیان سەرکەوتو بن، نابێت دەورە واقعیەکان بە خەڵکی پیشان بدەن. ئەم خاڵە چەند پرسیارێک ئەهێنێتە ئاراوە: ئەگەر واقعیەتی جنسی خەڵکی پیشانیان نەدرێت، کەوابوو ئەم دەورانە چۆن بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە لە کۆمەڵگادا دەرئەکەون؟ بۆچی خەڵکی خۆیان لەگەڵ کلێشەکاندا ناگونجێنن؟ ئەگەر ئەم کارەش ناکەن، کەوابوو ئەم قاڵبانە بە کەڵکی چی دێن؟

## ژنان و پڕوپاگەندا

یەکێک لە لقە سەرەکیەکانی کلتوری گشتی کە سەرنجی فەمەنیستەکانی بۆ خۆی ڕاکێشا، پڕوپاگەندە و پێشاندانی ژنانە تیایاندا. بائر ئەڵێت: "بزوتنەوەی ژنان لەهەمان سەرەتاوە بە دیدێکی رەخنەگرانەوە و زۆرجار بە توڕەییەوە کاردانەوە بەرامبەر ئەو شتە پیشان ئەدات کە ناوی ناوە "جیاوازی رەگەزی میدیاکان". پێدەچێت پڕوپاگەندە یەکەم ئامانجیان بووبێت و بتی فریدان بەشیکی گەورە لە بەرهەمەکەی خۆی بە ناوی "رەمزەکانی ژنانەوە" بۆ شیکردنەوەی ناوەڕۆکی گۆڤارەکانی ژنان و رەخنەی پڕوپاگەندە و تەکنیکەکانی لێکۆڵینەوە

لەبارەی بازاڕەوە تەرخان کردووە". شیکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەردەوام پەردەی لەسەر تێڕوانینێک لابرد کە لەبارەی کلێشەی جنسیەوە لەسەرەوە باسکرا. دایر (Dyer) ئەنوسێت: "تاوتوێ کردنی پڕوپاگەندە بازرگانیەکان پیشانی ئەدات کە جنسیەت هەمیشە لەسەر بناغەی چوارچێوە تەقلیدیە کلتوریەکان وێنا ئەکرێت: ژنان بونێکی لەرادەبەدەر ژنانەیان هەیە (وەک شتێکی سێکسی، ژنیماڵەوە، دایک، کەیبانوو) و پیاوان لە پێگەی دەسەڵات و باڵادەست بەسەر ژناندا".

ئەگەر سەرنج لە هەندێک لێکۆڵینەوە بدەین کە لە بارەی دەرخستنەوەی ژنان لە پڕوپاگەندەدا ئەنجامدراوە، لە گرنگی ئەو خاڵانە ئەگەین کە لەسەرەوە باسکرا. ئەم لێکۆڵینەوەیە پیشانی ئەدات کە پیشاندانەوەی ژنان لە پڕوپاگەندەدا زۆر گۆرانی بەسەردا نەهاتووە. دایر ئاماژە بۆ لێکۆڵینەوەیەک ئەکات کە لەساڵی ١٩٨١دا ئەنجامدراوە و ١٧٠ پەیامی بازرگانی تەلەفیزێۆنی لە خۆ گرتووە و ئەڵێت:

"ئەم لێکۆڵینەوەیە بەو ئەنجامە گەیشتووە کە لە ٦٦٪ ی کەسایەتیە سەرەکیکانی پەیامە بازرگانیەکان پیاوان بوون، یان دەنگی بێژەرەکە پیاو بووە. لەهەموو پەیامەکاندا پیاوان سەربەخۆن و ژنانیش وابەستە. وێنەی پیاوان بەشێوەیەکی سەرەکی وەک بونەوەرانێکی بەتوانا و کارزان پیشانیان ئەدات، پیاوانێک کە هەڵویستێکی لۆژیکی و هوشیارانەیان سەبارەت بە بەرهەمی جێی مەبەست هەبووە. ژنان بە گشتی بەکارهێنی ئەم بەرهەمە بوون. لەناو ئەو کەسایەتیە سەرەکیانەی لەناو ماڵدا پیشان ئەدرێن، ٧٣٪یان ژن بوون و لە ناو ئەو کەسانەشدا کە بێ هیچ پاساوێک پڕوپاگەندەیان بۆ بەرهەمێک کردووە لە ٦٣٪یان ژن بوون....لەبارەی ئەو پەیامانەی کە دەنگی بێژەر لەسەر وێنەکان هەبووە، بەرهەمەکانی تەندروستی لە ٨٣٪ی حاڵەتەکان دەنگی پیاوان و بەرهەمی خۆراکی بە دەنگی ژنان پڕوپاگەندەیان بۆ کراوە. ئەم ئامارە لەگەڵ ئەو ئامارانەی لە لێکۆڵینەوەی ناوەڕۆکی تەلەفیزێۆنی ئەمەریکا بەدەستهاتون ئەگونجێت. پەیامە بازرگانیەکانی تەلەفیزێۆن بەڕونی قاڵبی دەورە جنسیەکان پیشان ئەدەن و بە پێی بڕوای هەندێک لە توێژەرەوان کاتێک ئەم چوارچێوانە چەندان جار دوبارە ببنەوە، فێربونی چوارچێوە جنسیەکان بە ئاسانی ئەنجام ئەدرێت. لێکۆڵینەوە ئینگلیزیەکان پیشانی ئەدەن کە پڕوپاگەندەکان تەنانەت بەشێوەی سنوردرایش لە رەنگدانەوەی ماهیەتی دەورە جنسیەکاندا ورد نین. بۆ نمونە لە ساڵی ١٩٧٨دا ٤٧٪ ی کۆی هێزی کار لە ژنان پێکهاتون، لە نمونەگیری پڕوپاگەندەی ئینگلیزیدا، ژنان تەنها لە١٣٪ ی کەسایەتیە سەرەکیەکانیان پێک ئەهێنا کە بەکاری پیشەییەوە خەریکن.

لەبەرەوە دایر ئەنجامگیری ئەکات: "بارودۆخی ژنان لە پڕوپاگەندەدا رێک هەمان بارودۆخە کە لێکۆڵەرەوەیەکی ئەمەریکی بە لەناوبردنی رەمزی ژنان ناوی ئەبات. بەدەربڕینێکی تر پەیامە بازرگانیەکان بەها کۆمەڵایەتیە باڵادەستەکان پیشان ئەدەنەوە. ژنان گرنگ نین، مەگەر لە ماڵ تەنانەت لە ماڵیشدا پیاوان داناترن، و ئەم خاڵەیە کە لە دەنگی بێژەری پیاو لە پڕوپاگەندەی بەرهەمەکانی ژناندا ئەنجامگیری ئەکرێت".

ئەتوانین ئەم دۆزینەوانە لەگەڵ ئەو دۆزینەوە تازەترانەدا بخوێنینەوە کە بە ئەنجامی هاوشێوە گەیشتون. لێکۆڵینەوەی دوایی تاوتۆێ کردنی

ناوەڕۆکی قاڵبە جنسیەکانی پەیامە بازرگانیەکانی تەلەفیزیۆنی ئینگلتەرایە کە لەسەر بناغەی ٥٠٠ پەیامی بازرگانی گرنگ ئەنجاندراوە و کامبرباخ لە ساڵی ١٩٩٠دا بۆ ئەنجومەنی ستانداردی بڵاوکردنەوە ئەنجامیداوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە پیشانی ئەدات ئەو قاڵبسازیەی پێشتر ئاماژەمان پێکرد، هێشتا بەردەوامە. ژمارەی پیاوان دوو هێندەی ژمارەی ژنانە. لە ٨٩٪ ی پەیامەکان سودیان لە دەنگی پیاوان بۆ بێژەری وەرگرتووە، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسایەتیەی نمایش لە پەیامەکەدا ئەکات ژن بێت. ئەو ژنانەی لەم پەیامەدا وێناکراون بە گشتی لە پیاوان گەنجترو سەرنج ڕاکێشەرتر بوون (٤٤٪ لەبەرامبەر ١١٪). لە هەر ٣ ژن ژنێک (ڕوخسارێکی مۆدێل ئاسای هەبووە)، لە کاتێکدا لەبارەی پیاوانەوە لەهەر ١٠ کەس یەک کەسیان ڕوخساری وایان هەبووە. تەمەنی لە ٥٠٪ی ژنان لە نێوان ٢١ و ٥٠دا بووە، لە کاتێکدا تەنها ٣٠٪ی پیاوان لەم تەمەنەدا بوون، و لە ٢٥٪ی ژنان زیاد لە ٣٠ ساڵیان هەبووە، لەکاتێکدا ئەم ژمارەیە بۆ پیاوان لە ٧٥٪ بووە. پیاوان زۆربەی جار لە کاری پسپۆریدا دەرئەکەون و کارەکەشیان زۆربەی جار لە ژیانیاندا دەورێکی گرنگی هەیە. لە کاتێکدا بۆ ژنان "پەیوەندیەکان" دەوری گرنگی هەیە. تەنها لە ٧٪ی ئەو ژنانەی لەم نمونەیەدا بەشدار بون کاری ماڵەوەیان ئەکرد، بەڵام هەر لەم ژمارەیە بە بەراورد بە پیاوان دوو ئەوەندەی ئەم حاڵەتانە ژنان مەشغوڵی شتن و پاککردنەوە بون. لە زوربەی حاڵەتەکاندا پیاوان سەرقاڵی چێشت لێنان بوون -٣٢٪ی پیاوان و ٢٤٪ی ژنان- بەڵام لەم پەیامانەدا کاری چێشت لێنان بەهۆی ئەو ڕێوشوێنە تایبەتیەی کە پێویستی بە لێزانی تایبەت هەیە ئەنجامدراوە و وەک کارێکی ڕۆژانەی ئاسایی پیشان نەدراوە. لە ٣١٪ ی ئەو حاڵەتانەی کە پیاوان لە حاڵەتی ئەنجامدانی کارەکانی ماڵەوەدا پیشان ئەدەن، ئەم کارە بۆ هاوڕێیەک ئەنجام ئەدرێت، لەکاتێکدا ژنان کاری ماڵەوە بۆ خێزانەکەیان، هاوبەشی ژیانیان و یان بۆ خۆیان ئەنجام ئەدەن. و دواجار ژمارەی ژنانی خێزاندار لەچاو پیاوانی خێزاندار دوو ئەوەندە زیاتربووە.

ئەم دیدە تایبەتە و سودوەرگرتن لە شیکردنەوەی ناوەڕۆک وەک شێوازێکی لێکۆڵینەوە، لە دیدی هەندێک لە نوسەرانی فەمەنیستەوە هەمان ئەو شتەیە ناوی فەمەنیزمی ڕادیکاڵی وەرگرتووە. پێئەچێت ئەمجۆرە فەمنیسمە پەیوەندی بە شێوازی بەهێزبونی دەوری لەقاڵبدراوی جنسیەوە لە میدیاکاندا هەیە. ئەم تیورەیە بڕوای وایە کە دەزگاکانی وەک میدیاکان و خێزان ئەم دەورە جنسیانە فێری خەڵکی ئەکەن. فەمنیزمی لیبراڵ بە شیکردنەوەی ناوەڕۆک ئەو خاڵەی پیشانداوەو خوازیاری پێشاندانێکی واقعبینانەتری ژنان لە کلتوری گشتیدان و خوازیاری ئەوەن هەلی کاری باشتر بۆ ژنان لە پیشەسازی میدیادا دەستەبەر بکرێت. ڤن زنون ئەم خاڵە بەمشێوەیەی خوارەوە وەسف ئەکات: "لە گوتاری فەمەنیزمی لیبراڵدا دەمارگیری نالۆژیکی و کلێشەکانی دەورەکانی بەناو سروشتی ژنان وەک دایک و هاوسەر، پاساو بۆ پێگەی نایەکسانی ژنان لە کۆمەڵگادا ئەهێنێتەوە. بنەما لیبراڵە گشتیەکان لەبارەی ئازادی و یەکسانیەوە ئەبێت ژنانیش بگرێتەوە". خودی فەمەنیستەکان بە دیدێکی ڕەخنەگرانەوە تەماشای ئەم شێوازەیان ئەکرد، بەڵام نکوڵی لەو پێشکەوتنە ناکەن کە بە هۆیەوە بەدەست هاتووە. هەندێک لە قوتابخانە فەمەنیستیەکان بە سێ هۆ لەم دیدە دورکەوتنەوە:

بەس نەبونی لێکۆڵینەوەکانی ناوەڕۆک، سەرنجەدان لە بونیادە فراوانەکانی دەسەڵاتی ئابوری، سیاسی و کلتوری، و نەبونی ئەو تیورانەی رونکردنەوەیان بۆ دەورە جنسیە کلێشەیەکان هەیە. لە ئەنجامدا فەمەنیستەکان ڕویان کردە چەند تیورەیەکی وەک ئاماژەناسی، بونیادگەری، مارکسیزم، دەرونشیکاری و تیورەکانی باوکسالاری.

ئەکرێت ئەم پێشکەوتنانە بە سودوەرگرتن لە نمونەی پڕوپاگەندەشدا پیشان بدرێت. پێدەچێت یەکێک لە گرنگترین ئەو گۆڕانانەی لەم بوارەدا بینراوە، سەرنجدان بووە لە داواکاری "فەمەنیستەکان" و "سیاسەتەکانی ئازادی ژنان" لە خودی پڕوپاگەندەدا.

دایر سەرنجی لەم رەوتە داوە. بە بڕوای دایر ئەم رەوتە رەهەندێکی شێوازی پارێزگارانەی پڕوپاگاندەیە لەبەرامبەر رەخنەگرتندا. دایر ئەنوسێت:

"هەندێک لە ئامادەکارانی پەیامە بازرگانیەکان کە ئاگاداری بێزاری فەمەنیستەکانن لە وێنە تەقلیدیەکانی ژنان لە پڕوپاگەندەدا، لە پڕوپاگەندەکانی خۆیاندا ئەم رەخنەنایەن لەبەرچاو گرتووە و لە زۆربەیاندا چوارچێوەیەکی ئەڵتەرناتیڤیان پێشکەش کردووە کە ژنێکی مۆدێرن، پیشەیی و ئازادبوو پیشان ئەدات. هەندێک لە دەزگاکان هەوڵیانداوە لە ململانێی پڕوپاگاندەدا دیدی تازە پێشکەش بکەن، بەڵام لە کرداردا خاڵی سەرەکی لەبەرچاو ناگرن و "ئازادی" بە هەڵە بەجۆرێک رەفتاری هێرش بەرانە لە جنس یان رەفتاری وروژێنەری جنسی لە قەڵەم ئەدەن".

بەهان شێوە جیل پیشانیداوە کە چۆن پەیامێکی بازرگانی پڕوپاگەندە کە یەکێک لە خواستەکانی بزوتنەوەی فەمەنیستی —بەتایبەت لەو پڕوپاگەندانەدا کە پەیوەندی بە مناڵ لەباربردنەوە هەیە (مافی هەڵبژاردنی ژن)— بۆ سەفەرێکی

**یەکێك لە لقە سەرەکیەکانی کلتوری گشتی کە سەرنجی فەمەنیستەکانی بۆ خۆی راکێشا، پڕوپاگەندە و پێشاندانی ژنانە تیایاندا. بائر ئەڵێت: "بزوتنەوەی ژنان لەهەمان سەرەتاوە بە دیدێکی رەخنەگرانەوە و زۆرجار بە توڕەییەوە کاردانەوە بەرامبەر ئەو شتە پیشان ئەدات کە ناوی ناوە "جیاوازی رەگەزی میدیاکان". پێدەچێت پڕوپاگەندە یەکەم ئامانجیان بوویێت و بێ فریدان بەشیکی گەورە لە بەرهەمەکەی خۆی بە ناوی "رەمزەکانی ژنانەوە" بۆ شیکردنەوەی ناوەڕۆکی گۆڤارەکانی ژنان و رەخنەی پڕوپاگەندە و تەکنیکەکانی لێکۆڵینەوە لەبارەی بازاڕەوە تەرخان کردووە". شیکردنەوەی رەخنەگرانە بەردەوام پەردەی لەسەر تێڕوانینێك لابرد کە لەبارەی کلێشەی جنسیەوە لەسەرەوە باسکرا.**

خۆشگوزەرانی بە دروشمی خۆی دائەنێت، ئەبێ وەک پەیامێکی فەمەنیستی لەقەڵەم بدرێت چونکە هەڵوێستێکی ناتیوری هەڵبژاردووە کە لەسەر شیکردنەوەی ناوەڕۆک راوەستاوە. جیل بڕوای وایە ئەو شێوازەی کە لە روی تیوریەوە وردتر و چۆنایەتی ترە و روانینی مارکسیزم، بونیادگەری و ئاماژەناسی بەکارئەهێنێت، بە باشی پیشانی ئەدات کە ئەم پەیامە بازرگانیە لەراستیدا هێشتا ڕەگی لە چەوساندنەوەی جنسیدا هەیە. جیل لەبارەی نمونەیەکەوە کە خۆی هەڵبژاردووە ئەنوسێت:

"زمان لەم پەیامەدا زمانی ئەلەنگار و دەسەڵاتخوازە، رێک وەک ئەو دروشمەی بەکاری هێناوە. لێکۆڵینەوەی ناوەڕۆک بە میتۆدی تەقلیدی ئەتوانێت ئەو خاڵە بسەلمێنێت چونکە لەم پەیامەدا وشەکانی وەک "مافەکان"، "هەڵبژاردن" "ئازادی" "دەربڕینی خود (ژن)" و "بێ سنورداریێتی" بەکار هێنراوە. لێرەوە ڕەنگە لێکۆڵەرەوەیەکی فەمەنیست کە سود لە شیکردنەوەی ناوەڕۆک وەرئەگرێت بەو دەرئەنجامە بگات ئەمە پڕوپاگەندەیەکە کە بیروڕای فەمەنیستەکان ئەسەلمێنێ و "وێنەیەکی پۆزەتیڤ" بۆ ژنان پێشکەش ئەکات. بەڵام کەسێک کە سود لە میتۆدێکی چۆنایتر و تەفسیری وەربگرێت، رەنگە ئەم پڕوپاگەندەیە بەشێوەیەکی تەواو جیاواز تەفسیر بکات. بەسەرنجدان لە دەقی ئەم پڕوپاگەندەیە سەرنج ئەدەین کە مافی ژن لە هەڵبژاردندا کورت ئەبێتەوە بۆ بۆ کۆمەڵێک ماف کە پەیوەندی بە شیوازی تایبەتی خۆیەوە هەیە و دواجار کورت ئەبێتەوە بۆ هەڵبژاردنی ئەو شتەی مەسرەفی ئەکات (واتە کام سەفەری خۆشگوزەرانی هەڵ ئەبژێرێ). مانای ئەم دروشمە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەوەی سەرەتا خواستێکی سیاسی کۆیی بوو، کورتبۆتەوە بۆ خواستێکی تاکەکەسی کە بە هەڵبژاردنی یەکێک لە شوێنە خۆشگوزەرانەکان کۆتایی پێ دێت. ئەم گۆڕانی مانایە تێڕوانینێکی فەمەنیستی کە ئەڵێت "تایبەتی (شەخسی) هەمان سیاسیە"ی هەڵگەڕانۆتەوە و هەڵبژاردنە سیاسیەکانی دابەزاندووە بۆ هەڵبژاردنی تایبەتی (شەخسی) ...تاوتۆێکردنی وردتری زمانی بەکار هاتوو لەم پڕوپاگەندەیەدا و بونیادی پەیامەکەی رەنگە ئێمە بەو دەرئەنجامە بگەیەنێت کە ئەم پەیامە نمونەیەکی باشە بۆ قەبوڵکردن و سودوەرگرتن لە وێنەگرتنی فەمەنیستی کە بەشێوەیەک بەکارهێنراوە کە لە مانا پێشڕەوەکانی بەتاڵی ئەکەنەوە".

ئامانجی ئەم باسە کورتە لەبارەی ژنان و پڕوپاگەندەوە رونکردنەوەی رەخنەی فەمەنیستیە لە کلتوری گشتی و هەندێک خاڵە کە لە ئاراستە فەمەنیستیەکاندا بۆ خوێندنەوەی مەسەلە فەمەنیستیەکان لەئارادان و هەنوکە ناچارین ئەم خاڵانە و هەندێک مەسەلەی تر بەشێوەیەکی هەمەکی تر تاوتۆێ بکەین.

## شیکردنەوەی فەمەنیستی کلتوری گشتی

رەنگە یەکێک لە باشترین شێوازەکان بۆ تێگەیشتن لە جیاوازی نێوان فەمەنیزم بەو شێوەیەی کە تا ئێستا ئاماژەی بۆ کرا و ئەو فەمەنیزمەی لە خوارەوە باسی ئەکەین و هەروەها قۆناغی گواستنەوە لەنێوان رەخنە فەمەنیستیەکان و شیکردنەوەی کلتوری گشتی، تەفسیری مۆدلسکی بێت بۆ پەیوەندی نێوان جنسیەت و کلتوری جەماوەری. پاساوی مۆدلسکی پاساوێکی رادیکالە، چونکە لە قۆناغی دەربڕینی هەقیقەت کە کلتوری گشتی و لێکۆڵینەوە کلتوریەکانی ژنانی لەناوبردووە، سەروتر رۆیشتوە و ئەو زمان و گریمانانە کە لەبارەی جۆری کلتوری

گشتیەوە هەڵیسەنگاندووە ئەهێنێتە ئاراوە.
ئەو خاڵەی مۆدلسکی بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەی بۆ ئەکات ئەوەیە کە جنسیەت لەبنەڕەتدا بۆ لێکۆڵینەوەی کلتوری گشتی گرنگی تایبەتی خۆی هەیە و لەهەمانکاتدا بۆ کلتوری جەماوەریش گرنگە. رەنگە ئەم بانگەشەیە بەرێژە بەدیهی دەرکەوێت، بەڵام باسی مۆدلسکی ئێمە بۆ وتەزاگەلێک ئەگەڕێنێتەوە کە بە هۆیانەوە ئەتوانین لەبارەی کلتوری گشتی و جەماوەریەوە بیربکەینەوە. باسی ئەو لەبارەی جنسیەتەوە بەپێی بانگەشەی خۆی باسێکە کە پێشتر قەبوڵنەکراوە و جیاوازە لەو ڕوانینەی کە جنسیەت رەهەند یان لایەنێکی زیادەیە کە بۆ کامڵکردنی وێنەکردنی کلتوری جەماوەری پێویستە یان هەڵوێستێکە لەنێوان چەند هەڵوێستێکدا یان رەخنەیەکە لە کلتوری جەماوەری کە پێشتر سەرنجی لێ نەدراوە. لەڕوانگەی مۆدلسکیەوە مەسەلەکە زۆر قوڵترە لەمانە. مۆدلسکی بڕوای وایە کە "شێوەی بیرکردنەوە و هەستی ئێمە لەبارەی کلتوری جەماوەریەوە بەڕادەیەک پەیوەستە بە روانینی ئێمەوە بۆ ژنێتی کە پێویستی رەخنەی فەمەنیستی لە هەموو ئاستەکانی ئەم باسەدا دەرئەکەوێت". خاڵی سەرەکی مۆدلسکی ئەو راستیەیە کە ژنان لەبەرامبەر ماهیەتی کلتوری جەماوەری و دەرئەنجامە زیانبەخشەکەیدا بە بەرپرسیار دانراون، لە کاتێکدا پیاوان لەبەرامبەر کلتوری باڵا یان هونەردا بەرپرسیارن. بەمشێوەیە کلوتوری جەماوەری رەنگدانەوەی ژنێتی و کلتوری باڵا رەنگدانەوەی پیاوەتیە.
ئەو خاڵەی زیهنی مۆدلسکی بەخۆیەوە خەریک کردووە هەمان ئەو خاڵەیە کە داگڵاس دەری بڕیوە. ئەم خاڵە نەک بەرهەمەکانی ژنانی نوسەر لەسەدەی نۆزدەدا بە بەراورد لەگەڵ پیاوانی هاوڕێیاندا نزمترە، بەڵکو لەهەمان کاتدا ژنان بە بەرپرسیار دائەنێت لە دەرکەوتنی کلتوری جەماوەریدا. مۆدلسکی قسەیەکی داگلاس ئەهێنێتەوە کە پەیوەندی بە رۆمانی "خانوی مامە تۆم" ی بەرهەمی هاریت بیچەر ستو و کەسایەتی ئەم رۆمانە ئاوای بچکۆلەوە هەیە:
"منداڵەکە پاڵاوانە و لە ئارەزوی بەدەستهێنانی شکۆیەکی بێ بایەخدایە کە خەسڵەتی کلتوری جەماوەریە...ئەو جێگری منداڵانەی "کچی شایستەی ئەمەریکا" یان "فریشتەی لاو" یان کچی چالاک و بێ ئەندازە شایستەیە کە هەزاران گۆرانی و فیلم لەبارەیەوە دروستکراوە...لەروویەکەوە ئاشنای من لەگەڵ "ئاوای بچکۆلەدا" و دیمەنەکان، شتەکان و لۆژیکی ڤیکتوریای کە بۆ ئەو سەرنجراکێشەرە، سەرەتای ئاشنابونی منە بە مەسرەفگەری. ئەو لەزەتەی لە لە خوێندنەوەی ئاوا بچکۆلەوە وەرمگرت، ئامادەی کردم بۆ ئیمتیازە بێ هاوتا و وروژێنەرەکانی کلتوری جەماوەری".
بە بڕوای مۆدلسکی ئەو خاڵەی لیرەدا جێگەی گرنگی پێدانە، دۆزینەوەی وەڵامە بۆ ئەو پرسیارە کە بۆچی ژنان لە کۆمەڵگای باوکسالاردا سنوردار بوون بە سەرنجدان لە مەسرەفگەری و ئەم کۆمەڵگایانە لەبەر دەرکەوتنی مەسرەفگەری رەخنە ناکەن.
بۆ مۆدلسکی ئەو باسەی داگلاس و ئەوانی تر هێناویانەتە پێشێ "ئامادەبونی مێژوویی پێویستە بۆ چالاکی رەخنەگرانی زیاتر کە پێداگری لەسەر بە یەکسان دانانی ژنێتی، مەسرەفگەری و خوێندنەوە لەلایەک و پیاوەتی، بەرهەمهێنان و نوسین لەلایەکی ترەوە دەکەن". ئەم باسە هەروەها دەمارگیری پیاوانە لەزوربەی رەخنە سیاسیەکاندا کە سود لە خوازەی بەرهەمهێنان و مەسرەفگەری بۆ دروستکردنی جیاکاری لە نێوان چالاکیە پێشڕەوەکان و کۆنەپەرستانەی خوێندن

(یان بینین)دا وەرئەگرن، ئاشکرا ئەکات" لێرەوە مۆدلسکی ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە رێک هەمان ئەو زاراوانەی بۆ هەڵسەنگاندنی کلتوری جەماوەری بەکار ئەهێنرێن و بە بەراورد بە کلتوری باڵا لە شوێنێکی نزمتردا دائەنرێن، لە بونیادی رەگەزپەرستانەی ژنێتی و پیاوەتی لە کومەڵگا گەورەترەکانەوە وەرگیراون. کەوابوو ئەم پرسیارە تەنها مەسەلەی زیادکردنی جنسیەت نیە وەک خەسڵەتێکی تری کلتوری گشتی، بەڵکو مەسەلەی تێگەیشتن وئالانگار بونی (تەحەداکردنی) زنجیرە پلەی پۆلبەندیەکە کە لە لێکۆڵینەوەی کلتوری گشتیدا رەگەزی پیاو بە باڵا و رەگەزی مێ بە ملکەچ و پەیرەوی ئەژمار ئەکەن. بە دەربڕینێکی تر ئەو دیدەی مۆدلسکی رەخنەی ئەکات سەروکاری لەگەڵ کۆمەڵێک ناکۆکیدایە کە رەگەزی نێر و هونەر ستایش ئەکەن و رەگەزی مێ و کلتوری جەماوەری بە نزم ئەژمار ئەکەن:

| کلتوری باڵا (هونەر) | کلتوری جەماوەری (کلتوری گشتی) |
|---|---|
| پیاوەتی | ژنێتی |
| بەرهەمهێنان | مەسرەف |
| کار | خۆشگوزەرانی و بەتاڵی |
| بیرکردنەوە | سۆز |
| چالاکی | ئینفعال |
| روانین | خوێندنەوە |

لێرەوە ئەکرێت بگوترێت ئەو ترسەی رەخنەگرانی کلتوری باڵا لە دەوری کلتوری جەماوەری هەیانە لە هەژان و زیانگەیاندن بە پەیامگران و دواجار ئارەزویان بۆ مەسرەفگەری، بەهەمان رێژەی ئەو ترسەیە لە ژنانەبونی پەیامگران کە لە روانگەی مۆدلسکیەوە پیشاندەری ئەو واقعیەتەیە کە جنسیەت بۆ تێگەیشتن لە کلتوری گشتی زۆر کلیلیە.

### تیورەی فەمەنیستی و رەخنەی شیکاری ناوەرۆک

کێشەی سەرەکی ئەو دیدە فەمەنیستیەی لە سەرەتای ئەم باسەدا پێشکەش کرا، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو روانگەیەی کە ماس میدیا ئەبێت رەنگدانەوەی واقع بن، واقعیەتی ژیانی ژنان لە کۆمەڵگایەکدا کە ئیمتیازی یەکسان بە ژنان و پیاوان نادات. بەڵام وەک ڤن زوننیش ئەڵێت چ کەسێک ئەتوانێت ئەم واقعیەتە بناسێنێت، تەنانەت خودی فەمەنیستەکانیش لەبارەی ماهیەتی واقعەوە هاوبۆچون نین. ئەو فەمەنیستەی کە ڤن زونن بە فەمەنیستی لیبراڵی ناوی ئەبات، یاسا رێژی و یەکسانی زیاتر لە هەلەکاندا بە ئامێرێک بۆ بریندارکردنی وێنەی "ناواقعیانەی" ژنان لە کلتوری گشتیدا ئەژمێرێت. لێکۆڵینەوە فەمەنیستەکانی تر کە دواتر باسی ئەکەین تێڕوانینێکی تر ئەخەنەوە روو. ڤن زونن تێڕوانینە فەمەنیستە رادیکاڵ و سۆشیالیستەکان و هەروەها ئەوەی بە لێکۆڵینەوە کلتوری بە شێوازی فەمەنیستی ناو ئەبات، پێشکەش ئەکات. ئەم دیدانە بڕوایان وایە کە کۆمەڵگای وەک کۆمەڵگای خۆمان بە رادەیەکی ترسناک جیاخوازن چونکە رەگیان لە باوکسالاریدا هەیە و دواجار چالاکی قەرەبوکردنەوەی وەک یاسادانان بۆ پارێزگاریکردن لە هەلی یەکسان، تەنها ئەتوانێت لە ئاستێکی پەراوێزیدا کاریگەری هەبێت. نایەکسانی و وەبەرهێنانی جنسی زۆر رێکخراوتر و فراوانترە لەوەی فەمەنیزمی لیبراڵی دانی پیا ئەنێت. ئەبێت ماس میدیا بەپێی ئەم هەلومەرجە دەرک بکرێت و پاساوی بۆ بهێنرێتەوە. دەوری میدیاکان تەنها پیشاندانی ژنان نیە لە دەورە لە قاڵبدراوەکاندا، بەڵکو ئەوان دەورێکی چەندان جار بنەڕەتیتریان هەیە لە یارمەتیدانی ناساندن و شێوەی مانا سەرەکیەکانی ژنایەتی و پیاوەتی. لەم روانگەیەوە ئەمانە ماهیەتێک نین کە لە شوێنێکی تردا بەشێوەیەکی روون بونیان هەبێت و پاشان

کلتوری گشتی لە ڕێگەوە بێت و بیان ڕوشێنێت. بەشێک لەوانە دەزگاکانی ماس میدیا بەسودوەرگرتن لە کلتوری گشتی بەرهەمی دێنن و دوبارە بەرهەمی دێننەوە. فەمەنیزمی لیبراڵ دەرکی ئەم خاڵانە ناکات، چونکە ئەمانە بناغەیەکی تیوریان نیە و بونیادە بەرفراوانەکانی باوکسالاری لەبەرچاوناگرن و بە دۆزراوەکانی لێکۆڵینەوەکانی ناوەڕۆک واز ئەهێنن.

لێرەوە یەکێک لە پێشنیارەکانی گەشەکردنی تیورە ئەڵتەرناتیڤەکانی فەمەنیستی، رەخنەی ناوەرک بووە. ئەگەرچی ئەم میتۆدە لە لێکۆڵینەوەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا جیگەیەکی هەمەکی خۆی هەیە، بەڵام لە رابردوودا دەورێکی گرنگ و بێ هاوتای لە لێکۆڵینەوەکانی میدیا و کلتوردا بینیووە. دایر ئەم شێوازەی بەمشێوەیەی خوارەوە پێناسکردووە: "گریمانەی سەرەکی شیکردنەوەی ناوەڕۆک ئەوەیە کە ژمارەی ئەو جارانەی بابەتێک لە دەقێک یان پرۆپاگەندەیەکدا دوبارە ئەبێتەوە، لەگەڵ بەرژەوەندی یان مەبەستەکانی ئامادەکاران لە لایەک و کاردانەوەی پەیام وەرگرانی لە لایەکی دیەوە لە پەیوەندیدایە. مانای سەرەکی دەق و ئامانجی ئامادەکار لە نوسینی ئەم دەقە لە دەرونیدا شاراوەن و تەنها لەرێگەی دیاریکردن و ئەژمارکردنی خەسڵەتە گرنگەکانی دەقێکەوە ئەکرێت ئاشکرا بکرێن. شیکردنەوەی ناوەڕۆک بەشیوەیەکی ئاسایی سنوردارە بە لیکۆڵینەوەی فراوان، بابەتی و رێکخراو بۆ ناوەڕۆکێکی ئاشکرا و تەفسیرکردنی پەیوەستە بە ئەژمارکردنی دوبارەکان لە ناوەڕۆکدا". ئێمە ئەو دەرئەنجامانە ئەزانین کە شیکردنەوەی ناوەڕۆک لە شیکردنەوەی دوبارە بەرهەمهێنانەوەی ژنان لە پروپاگەندادا بەدەستیەوە داوە. ژمارەیەک لە نوسەرانی فەمەنیست بەتوندی رەخنەیان لە میتۆدی شیکردنەوەی ناوەڕۆک گرتووە. ئەم نوسەرانە نکوڵی بایەخ و گرنگی دۆزراوەکانی ئەمجۆرە شیکردنەوەیە ناکەن، بەڵکو ئەیانەوێت کەموکورِی و سنورداریەکانی بیر بخەنەوە. لێرەدا تەماشای هەندێک لەو رەخنانە ئەکەین. دەگوترێت شیکردنەوەی ناوەڕۆک ناتیوریە چونکە لە پەیوەندیدا نیە بە هیچ چوارچێوەیەکی تیوری و تەفسیریەوە و وەک میتۆدێکی لێکۆڵینەوە وەسفی و بی رەخنە قەبوڵ ئەکرێت. ئەم میتۆدە بەراورد ئەکرێت بە شیکردنەدەی دەرونی کە تیایدا میتۆدێک (دەرمان) لە پەیوەندیدایە بە تیورەی رۆحی مرۆڤەوە (تێڕوانینی فرۆید بۆ ئاستی ناهوشیاری). هەروەها ئەم شیکردنەوەیە بە ناتیوری ئەژمێرێت چونکە لەسەر بناغەی رونکردنەوەیەکی تەفسیری رانەوەستاوە بۆ پەیوەندی نێوان دەقەکانی کلتوری گشتی و ئەو زەمینە کۆمەڵایەتیە بونیادیەی تیاییدا ئامادەیە لەوانە پەیوەندیاکانی دەسەڵات. بە پێی لێدوانەکانی بائر "ئەو لێکۆڵینەوانەی ناوەڕۆکی نەژادپەرستی جنسی وەسف ئەکەن، یارمەتیمان نادەن بۆ ئەوەی لە پەیوەندی نێوان ناوەڕۆکی رونکراوە و بونیادە کۆمەڵایەتیەکانی کە بەرهەمیان هێناوە و لە ناویدا کار ئەکەن. تێبگەین". .

---

- بەشێکە لە فەسڵی پێنجەمی ئەم کتێبەی خوارەوە
- دومینیک استریناتی: مقدمەای بر نظریەهای فرهنگ عامە. ت: ثریا پاک نظر. تهران، گام نو چاپ دوم ١٣٨٤

# بەشی حەوتەم لە کتێبی گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

# بەردی قامیش

## Rock the Casbah

سازدانی: نینار ئەسیەر

و. لە سویدییەوە: هیوا قادر

***نینار:*** تۆ پێتوایە بۆچی خەڵکی لە وڵاتە عەرەبییەکاندا هێندە پابەندی داب و نەریتن؟ من پێموانییە هەموو داب و نەریتێک شایستەی ئەوە بێت پارێزگاری لێبکرێت، ئەو کەسانەشی خۆیان بە دابونەریتەوە نووساندووە هێندە کامڵ نین کار بۆ دوارۆژ بکەن. لە ئەوروپادا دابونەریتەکان بەهۆی کاریگەری شۆڕشەکانەوە کەوتونەتە پشتەوە و دیارنەماون. ئایە شۆڕشگەلێکی وا لە مێژووی عەرەبیدا هەڵگیرساوە کە خاوەنی بیرۆکەی دیموکراتی و ئەنارشییەت بووبێت؟ ئایە خەڵکی هەوڵی لەم جۆرە شۆڕشانەیان داوە؟ دیارە من دەزانم کە ڕاپەڕین ڕوویداوە، وەک یاخیبوونی خەڵکی دژ بە هێزی داگیرکەران یاخود

**کۆمەڵگەیەك كاتێك دەتوانێت بگۆڕێت و پێشكەوێت كە بەشێك لە ڕۆشنبیران هۆشیار و پێشكەوتوو سیكولار و شۆڕشگێڕبن. بۆ نموونە لە لوبناندا شۆڕشگێڕی زۆر هەن، بەڵام كۆمەڵگە تەنها بەمە ناگۆڕێت. كۆمەڵگەیەك ناتوانێت بگۆڕێت ئەگەر دەزگاكانی نەگۆڕێن، هەروەها گەر بنەمای دەسەلات و بنەمای خێزان تێیدا نەگۆڕێت. كاتێك كە دەزگاكان دەگۆڕێن هەموو كۆمەڵگەش لەگەڵیدا دەگۆڕێت. بەڵام تەنها بیرۆكەی گۆڕان بەس نییە بۆ گۆڕینی دەزگاكان. دەبێت لە ڕاستیدا شۆڕشێك بەرپابكرێت، دەبێت خەڵكی قبوڵی گۆڕان بكات، بەتایبەتی گۆڕانی دەزگاكان**



ئەدۆنیس

دژ بە سەربازان و کۆلۆنیالیستەکان. بەڵام ئایا مانای شۆڕش هاتۆتە ناو کەسایەتی عـەرەب و بونیادی مێژووییانەوە؟

***ئەدۆنیس:*** دیارە لە ناو مێژووی عەرەبیدا زۆر شۆڕش ڕوویانداوە، تاکو ئێستاش لەو جۆرە شۆڕشانە ڕووئەدەن. بێگومان بەشێک لەو یاخیبوونە بچووکانە یاخود ئەو ڕاپەڕینانە ئامانجێکیان هەبووە، بەڵام دواتر ئیسلام ئەو تەفسیرە جیاوازانەی بۆ کردوون کە خۆی ویستوێتی. بەڵام هەموو بیریارە گەورەکان هەر لە "ابو نواس" تا "معری"، هەروەها هەر هەموو شاعیرە گەورەکان و فەیلەسوفەکان دژ بە دین بوون. وە هیچ بیرۆکەیەکی گرنگ لە دینەوە وەک بڵاوبوونەوەی بۆنێک لە گوڵێکەوە ڕاستەوخۆ سەریهەڵنەداوە. بەڵام بیریاران و شاعیران چەندان گوڵیان خەلقکردووە کە بۆن و بەرامەی جیاوازی بڵاوکردۆتەوە. هەر هۆی ئەمەشە هیچ مانایەکی بنبڕی ئەدەبیاتی دینی لە ئیسلامدا نابینیت وەک دین. تەنانەت یەک فەلسەفەی ئیسلامیش نییە، بەڵکو تەنها تیۆلۆگی "خوداناسی" و شەریعەت هەیە کە ئەوانیش یاسان. ئەوە تیۆلۆگی و شەریعەتە کە قورعان ڕوونەکاتەوە، لەدەرەوەی ئەو سیستەمی خوێندنەوانەشەوە یاسا و ڕێساکان جێگیربوون. بەڵام ئەدەب و شیعر هەمیشە دژ بە دین بوون. هەر شاعیرە و خۆی بەپێغەمبەرێک زانیوە، پێیانوابووە شیعرەکانیان باشترینە و دژ بە دین بەکاریانهێناوە. بەڵام هەموو ئەم ئەدەبیاتەی کە دژ بە دین بووە بێگومان دواتر بەپەراوێزخراوە، لەبەرئەوەی دژی دین و ئەو ئەخلاقیاتە دینی و نەریتگەرایانە بوون کە لەئارادابوون.

***نینار:*** بەهەرحاڵێک، ئەی باشە بۆچی ئەم ڕەوشەی کە ئێستا هەیە ئاوهایە؟

***ئەدۆنیس:*** ئەمڕۆ شۆڕشەکان جـیـاوازن. ئەوە زاڵبوونی ئەو بیرکردنەوانەیە وا پیشان ئەدات کە گوایە ئەو شۆڕشانەی کە ڕوویانداوە لەژێر ناوی ئیسلامدا کـراون، بەڵام بەو شێوەیەی کە من تێیگەیشتووم شۆڕشەکان سیاسی بوون نەک بەهەمان ئەو هێزی کاریگەرییەی کە بەشێوەیەکی گشتی شۆڕشەکان

ئەکات بە شۆڕشێکی ئایدۆلۆژی و فەلسەفی و هونەری. ئەم شۆڕشانە بەناوی ترەوە کراون نەک بەو شێوە سەرنجڕاکێشەی کە من و تۆ باسیان لێوە ئەکەین. "شۆڕش"ـەکانی ئەمڕۆ سنوردارە لـەبـەردەم خستنەڕووی مەرجی سیاسییەکان و هێزە دەرەکییەکاندا: لەبەرئەمەیە کە ئەم شۆڕشانە شۆڕشی ڕاستەقینە نین.

***بیبار:*** ئەی بۆچی هیچ شۆڕشگەلێکی ڕاستەقینە ڕوویان نەداوە؟

***ئەدۆنیس:*** زۆر بزوتنەوەی پێشکەوتووخواز هەبوون داوای سێکولاریزەکردنیان کردووە.

***نینار:*** کەی؟

***ئەدۆنیس:*** لە مێژووی تازەماندا. زۆر لە پارت و خەڵکانی ڕۆشنبیر لە وڵاتانی عەرەبیدا ئەم جۆرە داوایانەیان کردووە، بەڵام هەموویان ئەو شەڕانەیان دۆڕانــدووە. ئـەوان زۆر بەئاسانی لـەبـەردەم ئەو تـۆڕە گشتییەی کۆمەڵگادا شکستیان هێناوە و بەرپەرچ دراونەتەوە و سەرکەوتوو نەبوون، چونکە بیروبۆچوونیان جێی قبوڵکردن نەبووە.

***نینار:*** باشە بۆچی؟

***ئەدۆنیس:*** لەبەرئەوەی کە دەسەڵاتی دین زۆر بەهێزبووە.

***نینار:*** هەروەها داب و نەریتیش.

***ئەدۆنیس:*** داب و نەریت و دامەزراوە ئاینییەکانیش.

***نینار:*** ئـەی بۆچی شۆڕشەکانی نـاو کۆمەڵگا ئەوروپییەکان سەرکەوتووبوون؟

***ئەدۆنیس:*** لەبەرئەوەی یەکێک لەو هۆیانەی کە لە هەموویان گرنگترە و لەپشت شکستهێنانی هەموو شۆڕشەکانەوەیە ئەوەیە کە دینی ئیسلام تەنها دینی ئیمان و باوەڕهێنان نییە بە خودا، بەڵکو دینی ئیسلام جۆرێکیشە لە شێوازی ژیان، دین بناغەیەکە بۆ پێکەوەنانی هاوسەرێتی و کولتوور و خێزان و چەندان شتی تر.

***نینار:*** وەک ئـەوەی لەلای دینی مەسیحییەت و جولەکەش هەیە. لە چوارچێوەی هەموو دینە تاکخواییەکاندا ئەو قەدەغەکردنانە بائاشکرا دیارن، بۆ نمونە: بۆت نییە وا بکەیت، بەڵام باشە وابکەیت. بۆت نییە بەو شێوەیە عەشق لەگەڵ ئافرەتێکدا بکەیت، بەڵکو بۆت هەیە بەم شێوەیە بیکەیت!

***ئەدۆنیس:*** ئا، بـەڵام کاتێک شـۆڕش بەباشی دەستیکرد بە گۆڕانکاری و پیادەکردن ئەوکات هەندێک شت پێبەپێی ئەو دەگۆڕێن. بەتایبەتی لە ئەوروپادا شۆڕشی گەورە ڕوویاندا کە لەو چەشنە لە وڵاتانی عەرەبیدا ڕوویان نەداوە. بەڵام شۆڕش هەر لەخۆوە ڕوونادات، بەڵکو پێویستی بەکەشوهەوایەکی وەها هەیە کە هەڵگری هەڵگیرسانی ئەو شۆڕشە و کۆمەککردنی بێت.

***نینار:*** مەبەستت ئـەوەیـە کە ئـەو کەشوهەوا کولتووری و کۆمەڵایەتییەی کە لە ناو دنیای عەرەبی ئیسلامیدا هەیە ناتوانێت ببێت بە پاڵپشت بۆ ئەم جۆرە شۆڕشانە، وایە؟

***ئەدۆنیس:*** وایـە ڕاستە. کۆمەڵگەیەک کاتێک دەتوانێت بگۆڕێت و پێشبکەوێت کە بەشێک لە ڕۆشنبیران هۆشیار و پێشکەوتوو سیکولار و شۆڕشگێڕبن. بۆ نموونە لە لوبناندا شۆڕشگێڕی زۆر هەن، بەڵام کۆمەڵگە تەنها بەمە ناگۆڕێت. کۆمەڵگەیەک ناتوانێت بگۆڕێت ئەگەر دەزگاکانی نەگۆڕێن، هەروەها گەر بنەمای دەسەڵات و بنەمای خێزان تێیدا نەگۆڕێت. کاتێک کە دەزگاکان دەگۆڕێن هەموو کۆمەڵگەش لەگەڵیدا دەگۆڕێت. بەڵام تەنها

بیرۆکەی گۆڕان بەس نییە بۆ گۆڕینی دەزگاکان. دەبێت لە ڕاستیدا شۆڕشێک بەرپابکرێت، دەبێت خەڵکی قبوڵی گۆڕان بکات، بەتایبەتی گۆڕانی دەزگاکان.

**نینار:** چۆن وا لە خەڵکی بکرێت قبوڵی ئەو گۆڕانکاریانە بکەن؟

**ئەدۆنیس:** دەکرێت خەڵکی هەندێک لەو گۆڕانانە قبوڵبکەن. بەڵام کاری وا کاتی دەوێت. ئاسان نییە تۆ شۆڕشەکان بەیەکتری بەراوردبکەیت.

**نینار:** ناکرێت خەڵکی لە شەو و ڕۆژێکدا ئەو گۆڕانانە قبوڵبکەن. مەبەستت ئەوەیە بڵێیت کە خەڵکی پێویستی بەکاتە بۆ ئەوەی خۆی ئامادەبکات.

**ئەدۆنیس:** پێویستی بە پرۆژەیەکی بەردەوام و درێژ هەیە. تا ئێستا ئێمە لەم پرۆژەیەدا سەرکەوتوو نەبووین، پێویستە دان بەم ڕاستییەدا بنێنین.

**نینار:** ئینسان دەتوانێت ڕۆژانـە لە نزیکەوە چاودێری ئەم پرۆسەیە بکات؟

**ئەدۆنیس:** دەبێت هەمیشە جەغت لە بیرۆکەکان بکەین. دەبێت بـەردەوامـیـش قسە لەسەر ئەو بیرۆکانە بکەین تەنها بەکەمێک پێشکەوتن وازیان لێ نەهێنیت. هەندێک پێشکەوتنی بچووک هەن ڕەنگە بەهۆی هەندێک هۆکارەوە نەبینرێن و دواتر بگەڕێنەوە سەر هەمان دۆخی سەرەتا.

**نینار:** باشە ئەی لێکدانەوەی تۆ چییە بۆ زۆر لە ڕۆشبیرە چەپەکان و هەندێک جاریش بۆ ئەو ڕۆشنبیرە ڕاستڕەوە توندانەی کە دوای جەنگ دەبن بە ئیسلامیی؟ لەڕاستیدا ئەمە شتێکی هەر زۆر سەیرە!

**ئەدۆنیس:** ئەمە پەیوەندی بـەوەوە هەیە کە قەناعەتەکانیان لەسەرەتاوە لەڕێی بیرکردنەوەیەکەوە نەبووە کە خاوەنی ڕەگ و ڕیشەبێت. ئەوانە سیاسی بوون، ئەوەی کە لای ئەوان گرنگبووە ئەوەبووە کە چۆن دەسەڵات بگرنە دەست. ئەوان پێیان وابووە کە دەتوانن هەموو شتێک بگۆڕن گەر بێتوو دەسەڵات بگرنە دەست. بەڵام ئەزموونەکان پیشانیان دا کە ئەوان هەموویان هەڵەبوون. دەسەڵاتگرتنە دەست بە تەنها بێماناییەکی گەورەیە. ئەگەر هات و تەنانەت ئەو دەستەڵاتە لەڕێگەی شۆڕشیشەوە بەدەستبهێنرێت ئەوا دواتـر دەبێتە هۆی گەندەڵییەکی زۆر زیاتر لـەوانـەی کە پیشووتر دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە. ئەو پارتە کۆنانەی کە وەک پارتی نەتەوەیی ناودەبرێن و دوای پرۆسەی ئـازادی دەسەڵاتیان گرتۆتەدەست، زۆر ناکۆکترن بەراورد بەو پارتانەی ئەمڕۆ بەخۆیان ئەڵێن پارتی شۆڕشگێڕ.

**نینار:** لە سەری کەسێکی چەپڕەوی توندڕەودا چی ڕوودادەت کەوای لێدەکات ببێتە ئیسلامی؟

**ئەدۆنیس:** زۆر شـت. چونکە پێش هەرشت بنەمای ئایدۆلۆژییەتی چەپ لە دنیای عەرەبیدا خاوەنی تایبەتمەندییەکی وەهابوو کە وای پیشان دەدات توانای وەڵامـدانـەوەی هەموو پرسیارێکی هەیە. دەقـاودەق وەک دین! لە دنیای عەرەبیدا حیزبی سیاسی بوو بە دینێکی تازە. ئینسانیش ناتوانێت دژایەتی دینێک بە دینێکی تر بکات، چونکە بۆ ئەوەی دژایەتی دینێک بە دینێکی تر بکەیت دەبێت بیرۆکەکانت لەسەر دنیا بخەیتەڕوو، هەروەها خاوەنی فەلسەفەیەکیش بیت جێگای دین بگرێتەوە. ئەو حیزبانە هەرگیز خوێندنەوەیەکی مێژووییان لەسەر ئەو مەرجانە نەکردووە کە ئەو هەموو دەستەڵات و بوونەی داوە بە دین. زیاتر ئەوان چاویان لە دەستەڵات بووە. ئەوان لەو ڕووەوە

سەرکەوتووبوون لەدەستکەوتنی دەستەڵاتدا و لەبیریشیان چۆتەوە بۆچی. لەبەرئەوەیە کە ئەوان نەیانتوانی سەرکەوتووبن.

**نینار:** تۆ ئێستا وتت یەکێک لەو مەرجانەی بۆ ئەوەی بتوانیت شۆڕشێک بەراوردبکەیت بەشۆڕشێکی تر ئەوەیە کە گۆڕان لە دامودەزگاکاندا بکەیت، بەڵام تۆ خۆت پێتوانییە کە کۆمەڵگا عەرەبییەکان ئەوەندەی تر بچنەوە ناو خۆیان بۆ ئەوەی هەر لەناو خۆیاندا تەواوبن، دواتریش قبوڵی هیچ گۆڕانکارییەکی تر نەکەن کە لــەدەرەوەی خۆیانەوە بێت؟ ئایا گەشەکردنی ئەو فەناتیکە دینییە دوا ڕاچڵەکینی ئەو کۆنەخوازانە نییە لەبەردەم ئەو کرانەوەیەدا کە ناتوانن خۆیانی لێبشاریتەوە؟ کۆمەڵگا عەرەبییەکان بەبێ هیچ خۆ تازەکردنەوەیەک هەنگاودەنێن و هەموو ئەو شتانەشی کە پێویستیان پێیەتی باسی ناکەن و هێندەی تر دەیشارنەوە. بۆیە دەکرێت فەناتیزم دوا شێوازی ڕاچڵەکێنەری مەرگی ئەوان بێت.

**ئەدۆنیس:** وایە. پاشەکشێکردن و خۆشاردنەوە هەمیشە خەتەرناکە. ڕاسیزم تا ئەمڕۆش خەڵکانی ڕەشپێست بە کۆیلە نــاودەبــات. دیــن هەمیشە دەستەڵاتێکی گــەورەبــووە بەسەر هەستەکانی ئینسانەوە و تا هاتووشە جێگایەکی گــەورەی داگیرکردووە. ئەمەش تەنها لەناو گۆڕەپانی فیکردا ڕووینەداوە بەڵکو بەسەر هەستەکانی مرۆڤ و داب و نەریت و ژیانی ڕۆژانەشدا هاتووە.

هەندێک لە حیزبەکان دەڵێن گەر دەسەڵات بگرنە دەست ئەوا بەدڵنیاییەوە بن و بنەوانی هەموو شتێک دەگۆڕن. بەڵام حیزبە تازەکان بەم هەڵوێستەیانەوە توانیویانە جار جارێک لە نێوان ئەم پەنجا ساڵەی ڕابــردوودا بگەنە دەســەڵات، بەڵام تا ئێستا هیچ شتێک نەگۆڕاوە. لەبەرئەوەی هەمووان شکستیان هێناوە پێویستدەکات کە بۆچونەکانی خۆیان بگۆڕن و دەستبکەن بە دۆزینەوەی ڕێگەچارەی تر. بەڵام ئەوە بزانە بریسکەی سەرهەڵدان و هێزی گۆڕان هەرگیز خامۆش نابێت. لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا دوو ئاڕاستەی بیرکردنەوە هەیە: ئەوەی پارێزگاری ڕابردوودەکات و کۆنەپارێزە، ئەوەشی کە حەزی بە گۆڕان و تازەکردنەوەیە. ئەم دوو ئاڕاستەیە هەمیشە لە کێبەرکێدان بەرامبەر بەیەک. بۆ ئەوەشی گۆڕانێکی ڕادیکاڵانە یاخود شۆڕش بەرپابێت پێویستی بە ڕێکەوتێکی مێژوویی بەکەڵک هەیە، بۆیە پێویستە ئینسان لە بۆسەدابێت بۆ ساتەوەختێکی ئاوا.

**نینار:** تۆ پێتوانییە بۆ کۆمەڵگەیەکی ئاوا ئەمە جۆرە ڕیسکێک بێت کە سەری بە خۆیدا کردووە و لەناو خۆیدا تەواوبووە و قبوڵی گۆڕان ناکات تائەوکاتەی بەسەرخۆیدا ئەڕوخێت؟

**ئەدۆنیس:** ڕاستە لە ئێستادا ئەمە یەکێکە لە هەرە هەڕەشە خەتەرناکەکانی بۆ سەر کۆمەڵگا عەرەبییەکانمان. تەنانەت بیرۆکەی "خۆرهەڵاتی" بوونیشمان بــەرەو فــەوتــان دەڕوات. چــی لە خۆرهەڵاتیبوونی عــەرەب ماوەتەوە؟ ئەو مێژووە خۆرهەڵاتناسییەی عەرەبی چیتر بوونی ماوە؟ کۆمەڵگای عەرەبی ئێستا بەشێکە لە کۆمەڵگای خــۆرئــاوایــی. چونکە شتێک تایبەت بــە خۆی بەرهەمناهێنێت، بەڵکو لەسەر بەرهەمهێنانی خۆرئاواو وڵاتان تر دەژی.

**نینار:** هەڵبەت وایە. خۆرهەڵاتیبوونی عەرەب وەک شتێکی پشتگوێخراو دوورەشــار لەلایەن ڕۆژئاواوە سەیردەکرێت. عەرەب خۆشی نایەوێت لەمە تێبگات.

تائێستاش باس لە عەرەب بوون و "ئومە" و شتی وا دەکات.

**ئەدۆنیس:** ئەوەی ئەم وەهمەی تا ئێستا لای عەرەب هێشتۆتەوە دینە. کۆمەڵگا عەرەبییەکان هەرچی داهێنانە خۆرئاواییەکانە بەکاریدەهێنن و کەچی پیشیان وایە ئەوە خوایە کە ئەو نیعمەتەی پێ بەخشیون. سەرباری ئەوەی بیروڕاکانیان توانای خۆڕاگری نەماوە کەچی هێشتا ڕێ بەخۆیان دەدەن لەسەر هەمان بیروباوەڕی کۆنینەی خۆیان بمێننەوە، ئاخر ناشکرێت تا هەتاهەتایە هەر ئاوا لەسەر ئەو بیروڕایانە بژین. من جارێکی تریش دەیڵێمەوە، ئەمە پێویستی بە کاتە، چونکە سیستەمی کۆمەڵگایەکی لەم چەشنە کە هەزار و پێنج سەد ساڵە بەردەوامە ناکرێت لە ماوەی ساڵێک و دواندا بگۆڕێت. ڕەنگە پێنج سەد ساڵی بوێت!

**نینار:** کەواتە مەبەستی تۆ ئەوەیە کە بڵێیت بنەمای کۆمەڵگا عەرەبییەکان لەسەر ئیسلام بنیاتنراوە. بە زۆریش ئەوە دینە کە بناغەی ئەو پێکهاتەیەی داڕشتووە. بەڵام ئایا هیچ لایەنێکی تر کاریگەری لەسەر ئەو پێکهاتەیە دانەناوە؟

**ئەدۆنیس:** ئیسلام بناغەکانی بووە، ئیسلام وەک بنەمایەکی سیاسی و دینی.

**نینار:** ئەی ئەو کۆمەڵگا عەرەبییەی پێش ئیسلام چی لێهات؟ ئیسلام نزیکەی هەزار و پێنج سەد ساڵە هەیە. پێش ئیسلام شارستانییەتی عەرەبی جیاوازبووە. ئایە هیچ میراتێکی ئەو سەروەختەمان بۆ نەماوەتەوە؟ یان هیچ شتێک نەماوە؟

**ئەدۆنیس:** هەموو شتێک تەفروتونا کراوە.

**نینار:** هەموو شتێک؟! بەڕاستی هیچ شتێکی ئەو سەروەختە نەماوە؟

**ئەدۆنیس:** هیچ شتێک.

**نینار:** من دیقەتم لەوەدابوو کە زۆر ئافرەتی عەرەب "پێش جەنگ" دژ بە درێژکردنەوەی توکی خۆیان بوون. بەموکێش یان بە ڤاکس لایان ئەبرد. ئەوان ئەو توکانەیان ئەتاشی، یاخود کەسێکی تر توکی قاچ و مەچەکی بۆ لائەبردن، هەروەها توکی قۆڵ و توکەبەریان. پرسیارەکەی من ئەوەیە کە ئایا هیچ شتێک سەبارەت بەمە لە قورئاندا نەهاتووە. بەهەرحاڵێک من بیستوومە کە شیعەکان دابونەریتێکیان هەیە، هەم ژن و هەم پیاو چی توکی لەشیانە ئەیتاشن. ئایە تۆ پێتوایە، ئەم خۆسەرقاڵکردنە زۆرەملییەیان بە توکی جەستەوە پەیوەندی بە چییەوە هەبێت؟ ئەوان بۆ ئەوە وائەکەن تا زۆرترین جیاوازی لە نێوان خۆیان و ئاژەڵدا دروستبکەن؟ یاخود ئەمە بۆ پاکوتەمیزییە؟ ڕەنگیشە واتێگەیشتبن کە توک شتێکی پیسە؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر وای بۆ ئەچم بەهۆی هۆکاری ترەوەبێت: ئەوان ئەیانەوێت ئافرەت تابکرێت لە پیاو جیاوازتربێت.

**نینار:** ئاوها! ئێ، ڕەنگە واشبێت.

**ئەدۆنیس:** ئەوە پیاوانن کە توکیان هەیە. ڕەنگە ئەوان پێیان وابێت بێ توکی پیاوان بەلای خۆیاندا ڕابکێشێت. لە ڕاستیدا ئەمە پەیوەندی بە بیرۆکە سێکسییە کۆنەکانەوە هەیە. سێکسوالیتێتیکی سروشتی. پیاوان نایانەوێت ژنان لە زۆر شتدا لەوان بچن.

**نینار:** شتێکی سەرنج ڕاکیشە. من هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەچووە.

**ئەدۆنیس:** پێموایە هۆی ئەوەبێت.

**نینار:** بەڵێ، بەڵام ئەم کارە تا ڕادەیەک

لەزۆرەملێکردن ئەچێت. من پیاو ئەناسم توکی قۆڵی و هەموو گیانی لائەبات. ئەی ڕاستە کە شیعەکان هەموو توکی گیانیان ئەتاشن؟

***ئەدۆنیس:*** نەخێر، شیعەکان ڕیشیان ئەهێڵنەوە.

***نینار:*** بەڵام من مەبەستم ڕیش نییە.

ئەدۆنیس: من هیچ دژی ئەو جۆرە توکە نیم.

نینار: ئەمە هۆی ئەوەیە کە هەندێک کەس نایانەوێت توکی خۆیان پیشان بدەن؟ هەندێک ئافرەت توکی خۆیان بە سەرپۆشەکانیان ئەشارنەوە، یاخود هۆی ئەوەیە کە توک ئەبێتە هۆی دەستنیشانکردنی جۆری ڕەگەز؟

ئەدۆنیس: نەخێر، ئافرەتان بەهۆی کۆمەڵێک هۆکاری ترەوەیە سەرپۆش ئەدەن بەسەریاندا. یەکێکیان ئەوەیە کە نایانەوێت تێکەڵ بە پیاوبن بۆ ئەوەی شتێکی ناجۆر ڕوونـەدات. وەک ئەوترێت هەموو جارێک کە ژنێک و پیاوێک ڕووبەڕوو یەکتری ئەبینن ئەوا شەیتان لە نێوانیاندایە. لێرەدا نزیکبوونەوەیەک هەیە کە هەردووکیان ئەیانەوێت سەرنجی ئەوی تر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. بەڵام ئەمە بەئاشکرا بە خەتەر نابینرێت کاتێک ئافرەتێک بیر لە سێکس یان فەنتازیای سێکسی بکاتەوە، چونکە ئەوە ڕوونە ئەبێت یەکەمجار جەستەکان بەیەکتری بگەن ئەوسا تێکەڵ بەیەکتری ببن. هەندێک جار پیاوێک - یان ژنێک - تەنها بە خەیاڵ لەڕێی خەونەکانی و هەستەکانییەوە خیانەت ئەکات. بەڵام ئەوان زۆر گوێ بەمە نادەن.

***نینار:*** پێت وانییە ئـەو ئافرەتەی قـژی خۆی دائەپۆشێت و لەچک ئەکات جۆرێکی تر بێت لە پیشاندانی "ڕەگەزیکی گەڕۆک"؟ ئایە لەچکەکەی سەری نابێتە پیشاندانی ئەندامی زاوزێی ئەو، وەک ئەندامێکی لەچککراو؟ ئایا سەرپۆش نابێتە هۆی پیشاندانی ڕەگەزەکەی لەبری ئەوەی ببێتە هۆی شاردنەوەی؟ تۆ گوێ بگرە با ئێستا من شتێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە. لە پڕۆگرامی "کەمپوس" حەرەمی زانکۆی کەناڵی دووی فەڕەنسی کە گولاومی دوراندا پێشکەشی ئەکات، دوو خوشکی داوەتکردبوو، لیڤایان کە سەرپۆشی بەسەرەوەبوو یەکێک بوو لەوانەی سەرقاڵی گفتوگۆکردن بوو لەسەر مەسەلەی سەرپۆشکردن لە قوتابخانەکاندا. یەکێک لە کچەکان وتی: "ئێمە بۆیە سەرپۆش ئەدەین بەسەرماندا تا خۆمان بەدوربگرین لە سێکس. لەبەر ئەمە کەس ناتوانێت زۆرمان لێبکات سەرپۆشەکانمان فڕێ بدەین و خۆمان پیشان بدەین، چونکە گەر وابێت وەک ئەوە وایە زۆرمان لێبکەن دەرپێکانمان دابکەنین".

***ئەدۆنیس:*** من جارێک بە ئافرەتێکم وت: "ئایە تۆ بـەوەت زانیوە سەرپۆشەکەت وایکردووە ئەو شتانەی زیاتر سەرنجی پیاو ڕائەکێشێت باشتر دەرکەون؟ چونکە لە ڕاستیدا لەچکەکەت قژ و چاو و دەمتی زیاتر بەرجەستەکردووە. ئەگەرچی من باوەڕم بەوەیە زۆرینەی ئەو ئافرەتانەی سەرپۆش ئەدەن بەسەریاندا بۆ ئەوە وائەکەن تا بڵێن: "ئێمە وەک ئافرەتانی ئەورووپی نین".

نینار: نەخێر، من بە پێچەوانەی تۆوە پێموایە کە ئەوە ئافرەتان کورت ئەکاتەوە بۆ تەنها یەک شت: ئەویش پیشاندانی ڕەگەزەکەیەتی. بەتایبەت بۆ ئەو ڕەگەزی مێینەیی، کە لەچکی بەسەرەوەیە.

***ئەدۆنیس:*** وایە، ئەمەش خوێندنەوەیەکی وردی ترە بۆ سەر ئەوانی تر.

پەراوێز: ئومە، میللەت. لە دەقە سویدییەکەشدا هەر بە عەرەبییەکەی نووسراوە.

***سەرچاوە:***

Samtal med min far Adonis ninar Esber

# تزفتیان تۆدۆرۆف:

## پێویستە ئێمە هەمیشە سەرکۆنەی هەڵە بکەین و لە کەسی هەڵەکاریش ببورین

ئامادەکردنی: سەعید فەرحان
و. لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی

***تزفتیان تۆدۆرۆف لە کتێبەکەتاندا گلەییەکت هەیە لە (مافی دەستێوەردان)**

تۆدۆرۆف/ گلەیی سەرەکی لەو تێکەڵکردنەدایە کە لەنیوان کردەی سەربازی و مرۆییدا ڕوو دەدات، ئەوەش مەسەلەیەکە قبوڵناکرێت، سەرباز هەمیشە سەربازە و بۆمبا لە هەمووکات و لە هەموو زەمەنێکدا مرۆڤ دەکوژێ. یارمەتی مرۆیی نەک وەکو مافێک، بەڵکو دەبێ وەکو ئەرک و بەشێوەیەک پێشکەش بکرێت کە باری ویژدانمان گران دەکات، بەڵام ئەو کاتەی بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکە هێز بەکاربێت، ئەوا ئیتر دەبێتە مایەی پرسیار....

**بە گەڕانەوە بۆ کەلتوری سێکسی عەرەبی، ژمارەیەکی زۆر دەق دەبینین کە باس لە پەیوەندییە سێکسییەکان دەکات، ئەمە ئەگەر نەڵێین بەگەورەیی‌و شکۆمەندییەوە لەم پەیوەندیانەی ڕوانیوە. وەك ئەوەی لەشیعرەکانی «ئەبو نەواس»دا هەیە کە هەمیشە وەك نمونەیەکی**



تۆدۆرۆڤ

## *لەنێوان ئەو مەترسیانەی کە جێگا بە دیموکراسی لەق دەکات، تۆ باس لە (لادانی ئامێر) دەکەیت... ئەوە مانای چییە؟

تۆدۆرۆڤ/ ئەوە مانای ئەوەیە گرنگی و بایەخ بە (ئامرازەکان — الوسائل) دەدرێت، بەبێ بایەخدان بە ئامانجەکان. بۆ نموونە بەکارهێنانی چەکە زۆر پێشکەوتووەکان ئەوانەی کە هەمانە، لەبەر هیچ هۆیەک نا، بەڵکو تەنها لەبەرئەوەی کە ئێمە ئەو چەکانەمان هەیە. بۆ ئەوەی توانای ئەو چەکانە تاقیبکەینەوە. ئەم ئاراستەیەش لە سەروبەندی جەنگی کەنداودا و لە ڕستەیەکی (مادلین ئۆلبرایت) دا (ئەو دەمەی کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو) بۆ (کۆڵن پاوڵ) کە (ئەو دەمەی وەزیری بەرگری ئەمریکا بوو) ڕوون دەبێتەوە کە دەڵێ: سوودی ئەو هەموو چەکە زەبەلاحە چییە کە بەردەوام قسەیان لە بارەوە دەکەین، ئەگەر بەکاریان نەهێنین.

## *لە گۆشەنیگای (مافی دەستێوەردان) ەوە بارودۆخی یۆگۆسلاڤیا جیاوازە لە بارودۆخی عێراق؟

تۆدۆرۆڤ/ بەڵێ، ئەوەی پەیوەندی بە عێراقەوە هەبێ جەنگێکی هاوپەیمانی سیاسیی باو بوو، عێراق وڵاتێکی دراوسێی داگیر کرد کە دەوڵەتی کوێت بوو، ئەویش داوای یارمەتی لە هاوپەیمانەکانی کرد... هتد. تا ئەم خاڵە ئێمە لە بەرامبەر ڕووداوێکی نیمچە کلاسیکیداین، بەڵام ئەوەی کە ناسروشتییە ئەو تۆڵەیەیە کە عێراق دووچاری بۆتەوە، دە ساڵە ئابڵووقەیەکی ئاشکرا بەسەر عێراقدا سەپاوە. ئەم

ئابلۆقەیە وڵاتێکی وەکو عێراق کە دەوڵەتێکە بە ڕێگاوەیە بۆ پێشکەوتنێکی مەزن گەڕاندۆتەوە بۆ وڵاتێکی چاخە کۆنەکان، لە بەدبەختیدا ڕۆچووە. تـۆڕی ژینگەی کۆمەڵایەتی تێک و پێکدراوە، بەڵام لەبارەی چینە دەستەڵاتدارەکەیەوە ئەوە لە تەندروستیەکی باشدان و سەدامیش (کە لە ڕۆژانی شەڕەکەدا بە شەیتانی ڕەها، یان بە هیتلەر ناویان دەهێنا) هێشتا زیندووە... دەخوات و دەخواتەوە...

### *بۆچـی هـەژموونـی تـەنـیـا هـێـزێك ئـەگـەر پارێزگـاری لـە خـێریش بـكـات تـۆ ئـەو هـێـزە بـە مـەترسـییـەك بـۆ سـەر ئـاشـتـی دادەنـێـی؟

تۆدۆرۆڤ/ دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە هەموو هەژموونەکان بە ناوی خێرەوە مومارەسە دەکرا، هیچ کەسێ لەوانەی کە شەڕیان بەرپاکرد نەیانوت ئێمە لایەنگری شەڕ دەکەین، ئەوە وانەیەکە دەبێ لێی وردببینەوە، ئەوەی کە خۆت بانگەوازی ئەوە بکەیت کە لەگەڵ خێردایت هیچ بەهایەکی نییە. هەژموونی تەنیا هێزێک کارێکی مەترسیدارە، چونکە ڕەنگە ئەو هێزە هەمیشە تێکەڵێک لە نێوان بەرژەوەندیەکانی خۆی و دادپەروەریدا بکات.

### *لـە ئـاسـتـی کـەسـییـەوە (مـرۆڤـی دەسـتـپـاك) لـە سـەدەی بیسـت و یـەكـدا، چـی دەگـەیـەنـێ؟

تۆدۆرۆڤ/ یەکێک لە وانە گرنگەکانی سەدەی بیست و یەک ئەوەیە نابێ کەسێک لە گروپێکدا کورت بکەینەوە. کەسایەتی وەک (گرۆمان ئەرومان جاری) و (بریمۆلیڤی) ئەوان ئەم دونیایەیان فێرکردین، لە کتێبەکەمدا وەکو پاسەوانگەلێکی دەستپاکی سەدەی بیست و یەک هەڵمبژاردون، ئەوان قەدیس نەبوون، بەڵام کەسانێک بوون ئەوەیان ڕەتکردەوە کە مرۆڤ ببێچنە مێگەلی (ڕەگەز، ئاین، ناژاد و ئایدیۆلۆژیا) وە. ئەوەی ئەوان فێریان کردین بۆ نموونە ئەوەیە نابێ تاک جگە لە تاکێتی خۆی بۆ هیچ سەرچاوەیەکی تر، تەنانەت بۆ کردارەکانیشی بگێڕینەوە، گرومان هەمیشە ئەم ڕستەیەی بیر دەکەوتەوە (ئێمە دەبێ سەرکۆنەی هەڵە بکەین و لە کەسی هەڵەکاریش ببوورین)، ئەوەش دەخوازێ هەمیشە بوارێک بۆ تاک بهێڵرێتەوە کە ڕەنگە بگۆڕێت. بەڵام ئەگەر ڕێگەمان لێگرت، ئەوا ئەوە دەگەیەنێ کە لە ڕەگەزی مرۆیی وەدەرمـان ناوە... لێرەوە وانەی گەورەی سەدەی ڕابردوو، قوربانی نەدانە بە مرۆڤ لە پێناوی بەهادا، جا ئەو بەهایە هەر جۆرێک بێت. ئامانجی سەرەکی کردەوەکانمان بۆ مرۆڤایەتی نوێ، بوونەوەری مرۆییە نەک فکرەی ئەبستراکتی مرۆیی.

ژێدەر: گۆڤاری (المدی) (٢/٣٦ ی ٢٠٠٢) لاپەڕە (١٤٧)

تێبینی وەرگێڕ: ئەگەر چی زەمەن و ڕووداوگەلێکی زۆر لە نێوان ئێستا و کاتی ئەنجامدانی ئەم دیمانەیەدایە، بەڵام بەلای ئێمەوە فکری تۆدۆرۆڤ و خاڵە وروژاوەکانی، جگە لەو تێبینیانەی کە بۆ چوارچێوە و کاتێکی دیاریکراو وتراون، ئەو دیمانانە هێندە ڕووناکیان تێدایە کە بۆ مەودایەکی دوورتریش بخوێندرێنەوە.

# لەبارەی توندوتیژیەوە گفتوگۆیەك لەگەڵ رۆشنبیر و فەیلەسوف د.عبدالكریم سروش

و. لە فارسییەوە: موسعەب ئەدهەم

**پ: بۆچوونی خۆتان لەبارەی "توندوتیژی"یەوە بفەرموون!**

قسەکردنو باسکردن لەبارەی ئەم بابەتەوە جێگەی خۆیەتیو ئومێدەوارم بۆ وەچەی ئێستا و وەچەکانی داهاتووی ئەم کۆمەڵگەیەی ئێمەش سودی هەبێت و نەفیکردنو دوورکەوتنەوە لە توندوتیژی بەشێوەی یەکێک لە شتە بەڵگەنەویستە کۆمەڵایەتیەکانی لێبێت. هەروەها لاوان و وەچەکانی داهاتوو بزانن و باوەڕ بکەن کە گیانی مرۆڤ لەراستیدا ڕێزلێگیراوەو ناموسی ئەوە و بە بیانووی سستبوونی تاکەکەسی ناتوانرێت ئەم ڕێزەی لێ بسەنرێتەوە. ڕێزداربوونی گیانی مرۆڤەکان بۆ تیۆرەکان و ئەو پێشگریمانانەی لەبارەی مرۆڤەوە، واتە مرۆڤناسین دەگەڕێتەوە.



عەبدولکەریم سروش

**تیۆریای شارستانیەت تیۆریایەکی مرۆڤناسیە کەهاورا لەگەڵ ئەوەدا مرۆڤەکان بەهۆی هۆکارو بەڵگەی جیاوازو جۆراوجۆر لەقۆناغی ڕووتی و دڕندەیی دەرەوەدا چوونەتە نێو قۆناغی داپۆشراوی وشارستانیەتەوە. ئەخلاق، ئایین، فەرهەنگ، وزانست هەموو یارمەتی زیاتر شارستانیەتبوونی مرۆڤ واتە، یارمەتی غەریزەی ماف شکێن ودژە شێوازو دژە ڕێگەیان داوە**

لەبەرئەوە تەرحکردنی بابەتی توندوتیژی لە زەمینەی مرۆڤناسیدا مانا و مەدلوول پەیدا دەکات. هەوڵدەدەم سەرەتا ئەو دەرکەی لەبارەی توندوتیژیەوە هەمە بیخەمەڕوو و بەدوای ئەویشدا لەبارەی ئەو پرسیارانەی تەرح دەکرێن و کراون وەڵامێکی کورت بخەمەڕوو.

ئەگەر بۆ مانای لاتینی ووشەی توندوتیژی بگەڕێینەوە لە تێگەیشتنی ماناکەیدا سەرکەوتووتر دەبین کە هاوتای "violence" ی لاتینی "توندوتیژی"یە، لەبنەڕەتدا چەمکێکی فەلسەفیە. ئەم ووشە لەفەلسەفەدا "دژە سروشتی" مانای دەکەن و لەبەرامبەردا "nature" یان "natural" سروشتی بەکاریان دەهێنا. لەسروشتگەرایی "ئەرستۆ"ییدا دووجۆر جووڵە دەناسرێت ئەوانیش: جووڵەی سروشتی و جووڵەی دژە سروشتی. جووڵەی سروشتی ناوی جووڵەی (natural) وجووڵەی دژە سروشتی، ناوی جووڵەی توندوتیژ (violent) یان پێوتووە. لەبۆچوونی کەسانی رابردوو جووڵەی خۆر بەدەوری زەویدا جووڵەی سروشتی بوو، کەوتنی بەرد بەسەر زەویدا جووڵەی سروشتی (**طبیعی**) بوو، بەڵام بەرزبوونەوەو چوونەسەرەوەی دووکەڵ لەزەویەوە بۆسەرەوە بەجووڵەی دژە سروشتیان ناودەبرد. لەبەرئەوە "توندی" یان "توندوتیژی" ئەوەیە کەدژی ڕووداو ڕێڕەوی سروشتی بێت. باشتروایە توندوتیژی بەم جۆرە مانابکەین وبەمجۆرە لێی تێبگەین، چونکە لەتوندوتیژیدا بەمانای ناسراوی توخمێکە لەتوڕەیی و توندی. بەڵام ئەگەر بمانەوێت تەنها راڤە و تەفسیری دەروونناسی ئەم چەمکە بکەین، ئای کە چەندین پارچەی حەقیقەت و چیەتی توندوتیژی لە بۆچوونی ئێمەدا دوور دەکەوێتەوە. لەبەرئەوە باشتر وایە لەدەرگای فەلسەفە و بابەتی فەلسەفیەوە بچینە نێو ئەم بابەتەوە. "توندوتیژی" واتە بە شێوەی پێچەوانەی نۆرم (norm) و پێچەوانەی سروشتی

دەستبردن (ئیدی پێچەوانەی سروشتی تاکەکەسی، یان پێچەوانەی سروشتی کۆمەڵگەی مرۆیی) یان کۆمەڵێک بەپێچەوانەی سروشت ونۆرمی ئەو کۆمەڵە رێنمونیکردن، هەموو ئەمانە دەبێت بەتوندوتیژی هەژمار بکرێن. لەبەرئەوە بەمجۆرە نیە کە تەنها کوشت و کوشتار و ئەشکەنجە ونموونەی ئەمانە توندوتیژی بێت، ئەوشتانە وێنەی توندو تورە ئامێزی دەرکەوتنی توندوتیژیە. بەڵام توندوتیژی لەو وێنە و نموونانە تەواو نابێت و چەندین شێوە و پۆل و بەشی دیکەی هەیە. نمونەیەک دەخەمەڕوو، ئێمە حکومەتی ستەمکاری تەنانەت ئەگەر کەسی دیکتاتۆر، دادپەروەربێت، ئەوا جارێکی دی بەجۆرێک لەحکومەتی توندوتیژی دەزانین، چونکە ئەم حکومەتە بەپێچەوانەی نۆرمی بەرێوەبردنی کۆی گشت و کۆمەڵە و ڕێگەی گەشەی سروشتی مرۆڤەکان دەبەستێت بەشێوەیەکی گشتی لە جێگەیەکدا بەربەستێک لەبەرامبەر رێگەی سروشتی دروست بکەین، ئەوا توندوتیژیمان ئەنجامنداوە ئەمە ئەودەرکەیە کەمن لەبارەی توندوتیژیەوە هەمە.

**پ: ئێوە فەرمووتان "توندوتیژی" واتە دروستکردنی بەربەستێك لەبەرامبەر "طبع"، بەڵام سەبارەت بەکۆمەڵگە چۆن دەتوانرێت باس لە "طبع" بکرێت، ئایا "طبع"ی هەیە؟ ئایا دەتوانرێت نۆرمی کۆمەڵگە کەکارێکی بڕیار لەسەر دراوە "طبع" بەومانایەی کەجێگەی سەرنجەو باسی حەکیمانی ئەرستۆیی بووە، بزانین؟**

د.سروش: پرسیارێکی بەجێیە. بەڵگەنەویستە هەموو ئەوەی ئەرستۆییەکان لەبارەی تاکەوە دەیانگوت، شایەنی جێبەجێکردن نیە بەسەر کۆمەڵگەدا، واتە: بەسەر کۆمەڵگەدا جێبەجێ نابێت، من لەکۆمەڵگەدا زیاتر لەوەی قایل بم بە"**طبع**"، بە "نۆرم" قایلم و لەبەرئەوە "violence" یان توندوتیژی بەوە دەزانم کە بریتیە لە شتێک دژی نۆرم بێت. سوریشم لەسەر ئەو خاڵەی کە کۆمەڵناسی لەدڵی دەروونناسیەوە نایەتە دەرەوە و باوەڕبوون "**طبع**" لەتاکی مرۆڤەکاندا، نابێتەهۆی باوەڕبوون بە "**طبع**" لەکۆمەڵگەدا، بەڵام مەدلولی قسە ئەوەنیە کە سروشت تاکەکان لەوبارودۆخەی کەکۆمەڵگە پەیدای دەکات، بێ کاریگەرە. مرۆڤەکان بەپێی ئەو سروشت و غەریزانەی کەهەیانە شێوەیەکی کۆیی تایبەت بەکۆمەڵگە دەبەخشن؟ گەرچی شێوەی کۆیی بەتەواوی لەسروشتی تاکەکانەوە بەرهەم نایەت. لەبەرئەوە ئەگەر قایل بین بە"سروشت" لەتاکەکاندا ئەوە "توندوتیژی" بەوە دەزانین کەرێگر بێت لەگەشەی سروشتی مرۆیی وجووڵەی سروشتی وئازادی تاکەکان. لەمەڕ کۆمەڵ و کۆمەڵگەش ئەوەی کە رێگر بێت لە جووڵەو رەفتاری ئاسایی ونۆرماڵی کۆمەڵگە، واتە ئەو رەفتار و هەڵچوونانەی کۆمەڵگە بشکێنێت ئەوە توندوتیژیە. ئەم رێگە و شێواز و وجۆرە کردارانە گەرچی ئیعتیبارین، هەم لەمافی تاکەکەسی مرۆڤەکان نموونەیان وەرگرتووە وهەم لەسروشتی تاکی کەسەکان کاریگەرییان لەسەر هەیە.

**پ: بەپێی ئەم پێناسەیە ئەگەر بەپێی چەند مەرجێك رەفتارە فیزیکیە ترس ئامێزەکان وەکو ئاگادارکردنەوەی توندی منداڵان، بەنۆرمی کۆمەڵایەتی بگۆڕین، ئیدی بەمیسداقی رەفتاری توندوتیژ ئامێز دەرنابڕین؟**

د.سـروش: دەتوانم دوو وەڵامـی پرسیارەکەتان بدەمەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە ڕێگە و شێوازە توندوتیژ ئامێزەکان واتە ئەوانەی کەدژی سروشتی مرۆڤەکانن، بەشێوەیەکی گشتی ناتوانن گشتگیر ببن، نەک بەبەڵگەی ئەوەی کە لەرووی ئەخلاقیەوە خراپ و ناشرینن، بەڵکو بەو بەڵگەیەی کە لە بنەڕەتدا ڕێکخستن و ڕێکخراوی کۆمەڵگە لە نێودەبەن. مێژووی مرۆڤایەتش ئەوەپیشان دەدات کەشێوە ترسناک ئامێزەکان لەکۆمەڵگەکاندا ئاوارتە (استثناء)بوون، نەک یاسا وڕێسا (قاعدە) شەڕ و جەنگ هیچ کات ڕێسا نەبووە وهەمیشە بەشێوەی ئاوارتە (استثناء) روویداوە، بەڵام خاڵی دووەم ئەوەیە کە مومکینە بۆ نموونە، هەندێک لەتیۆریاکانی فێرکردنو پەروەردە، ترس وئاگادارکردنەوەو توندوتیژی وەکو ڕێساو یاسای قبوڵکراو دەناسێنن نەک کارێکی ئاراوتەیی و لەناکاو. لەم کاتەدا ئاگادارکردنەوەو توندوتیژی بەنۆرم دەگۆڕێن وپێچەوانەی ئەمانەش بەتوندوتیژی دەژمـێـرێـت. دواجـار سـەرنـج لـەم خاڵەبدەین کەلەبنەڕەتدا مانای تیۆریای شارستانیەت ئەمەبوو کەمرۆڤی دڕندە دەبێت بەرگێک لەدژبوون لەگەڵ ترساندن و(قهر) لەبەربکات. "مرۆڤی شارستانی" واتە "مرۆڤی داپۆشراو" و"مرۆڤی ناشارستانی" واتە "مرۆڤی بێ بەرگ" واتە هەمان ئەو گیانەوەرە "فرۆید"یە. واتە هەمان ئەو ئاژەڵە دڕندەیەی کەلەدڵی هەر مرۆڤێکدا دانیشتووەو فەرمانی پێدەکات کە نۆرمەکان بشکێنێت مانای تیۆریای شارستانیەت لەسەردەمی نوێدا ئەوەیە کە شێوە ترس ئامێزەکان پەیوەست بووە بەمرۆڤە بێبەرگ و رووتەکانەوە ومرۆڤە شارستانیەکان یان داپۆشراوەکان نابێت لەوشێوانەی کەنۆرمەکان دەسڕنەوە سوود وەربگرن ودژی سروشت و رەفتار بجوڵێنەوە. بەڵام ئەگەر ئەم تیۆریای شارستانیەتە یان داپۆشراوە شکست بخوات یان پوچ وناکارایی بسەلمێت، لەم کاتەدا ڕەنگە بۆ ڕێگەیەکی دیکە بەبۆچوونی ئەرستۆییەکان (دژە سروشتی) کارێکی ناپایەیدار و لەنێوچووە. یەکێک لەیاساو ڕێسا سروشتیەکانی مەشائیەکان ئەوەبوو کە"القسر لایدوم" واتە کرداری دژە رەفتاری ناسروشتی کورت خایەنن، واتە تەنانەت ئەگەر بۆماوەیەکی دریژیش بمێننەوە، ناتوانن نەمرین و سروشت بەشێوەی خۆبەخۆ ئەم کارە واتە (دژە سروشتی ودژە رەفـتـارە) دەخـاتـە لاوە و خوو رەوشتی سروشتی زاڵ دەکات و زیاد لەمە ناچمە نێو ئەم گوتەزایەوە. بەوجۆرەی کەدەزانن لەگەڵ شتە سروشتیە میتافیزیکیەکان ناتوانین میسداقیان دابمەزرێنین ولەبەرئەوە لەجیهانی سروشتدا یان لەجیهانی کۆمەڵدا یان لەتاک مرۆییدا (قسر)ەکان وشتە دژە سروشتیەکان کامانەن وسروشتیەکان کامانەن ئەو پرسیارانەن کە لە ریگەی ڕێسای گشتی فەلسەفی ناتوانین وەڵامیان بدەینەوە.

ئەم پێشەکیە بەو ڕادەیە یارمەتیمان دەدات کەتاکو رادەیەک بازنەی "توندوتیژناسی"مان فراوان بکەین ولەشێوازی دەروونناسی ڕووت بچینە دەرەوەو سەرنج لەشێوازی دیکەی توندوتیژی بدەین، واتە ئەگەر سروشتو نۆرمی وڕێگەو شێواز لەجێگایەکدا ناسرا، هەرشتێک ڕێگەی ئەو سروشتە بگرێت یان ئەو ڕێگەو شێوازە بگرێت، دەبێت بە"توندوتیژی" بیناسینو بزانین ئەم ڕێگەگرتنەو شێواز شکاندنە بەپێویست لەروخسارە قەهرو ترس ئامێزەکان وتوڕە ئامێزەکاندا دەرناکەوێت.

**پ: کەواتە بەبۆچوونی بەڕێزتان "توندوتیژی" مانای بەرامبەری "سازش" نیە؟**

د.سـروش: نەخێر "سـازش" بەشێک لەوشتەیە کەبەرامبەر توندوتیژی دادەنیشێت. "سـازش" لەرەگەزی لەسەرخۆییە "حلم"ەو لەسەرخۆییش بـەوجـۆرەی کـەزانـایـانـی زانـسـتـی ئـەخـلاق روونیانکردۆتەوە، ئامادەیی و توانایەکە لەمرۆڤدا بـۆ خـواردنـەوەی تـوڕەیـی سـاتـی و لەناکاوی لەبەرامبەر کرداری نەگونجاو وناسازگارو ناشایستە.

واتـە، بۆنموونە: کەسێک سوکایەتی بەئێوەکرد یاخود تەنانەت لـەڕووی جەستەییەوە ئازاریدان، ئەگەر بتوانن لەبەرامبەر ئەم ئـازارە جەستەییو سوکایەتیکردنەدا تورەیی خۆتان بخۆنەوە بەجۆرێک رق و کینەتان بەرامبەر ئەم کەسە لەدڵ نەگرن ئەوە پێی دەڵێن لەسەرخۆیی "حلم". خاڵێکی زۆرگرنگ ئەوەیەکە سازش لەئامۆژگاری ژێردەستان دەکرێت نەک زبردەستان. ئەمەیەکێک لەهەڵەکانی مێژووی تەسەوف و مێژووی ئەخلاقی ئێمەبووە کە لەسەرخۆیی و سازشکردنیان هەندێجار لە شوێنی خۆیدا بەکار نەهێناوە، بەجۆرێک کە سـازشـکـردن هەندێجار بەستەم قبوڵکردن لە لایەن مرۆڤەکانەوە کۆتایی هاتووە. لەبەرامبەر ستەمکاردا نە لەسەرخۆییمان هەیە، نەسازشکردن. لەوێدا ئامۆژگاری رووبەرووبوونەوە دەکرێت. لەوێدا کەدەوترێت (التکبر مع المتکبر حسنه)، واتە لەگەڵ کەسی خۆبەگەورەزاندا دەبێت خۆبەگەورەزانی بکرێت. دەبـێـت ڕووبـــەڕووی کەسی ستەمکار ببینەوە و ئەم ڕووبەڕووبوونەوە باشترین شێوەیە بۆکەمکردنەوەو بەسفر گەیاندنی سنوربەزاندن و سنوربەزێنی ستەمکارانە. هەربەوجۆرەی کەصـائـب دەیگوت:

اچهار عجز پیش ستم پیشگان خطاست

اشک کباب باعث طغیان اتش سات

واتە: (دەرخستن وپیشاندانی بێ توانایی لەبەردەم ستەم پیشەکاران هەڵەیە، فرمێسکی کەباب هۆکاری سەرکەشی ئاگرە).

کاتێک دەوترێت "لەگەڵ دوژمنان سازشکردن"، دوژمـن جـیـاوازە لەستەمکار، رەنـگـە دوژمـنـان ودژەکانمان دادپەروەرو چاک بن. بەڵام نەهێشتنی توندوتیژی بەمانا گشتیەکەی، جگە یاساگەرایی و یاسادانان واتە جگەلە گەرانەوە بۆ نۆرم هیچ رێگەیەکی دیکە بوونی نیە بابەتە کۆمەڵایەتیەکان هەم شیکاری کۆمەڵایەتیان هەیەو هەم رێگاچارەی کۆمەڵایەتی. واتە هەم لەپلەی تێگەیشتنیان دەبێت بۆ گوتەزای کۆمەڵایەتی وگشتی بگەڕێینەوە وهەم لەبەرامبەر چارەسەر و دەرمانیان، لەوجێگەیەش کەتوندوتیژی بەپێی نۆرمو رێگەو شێواز پێناسەمان کردو نۆرمیش لەبنەڕەتدا کارێکی گشتی وکۆییە، لەبەرئەوە بۆ تێگەیشتن لەتوندوتیژی وکەشفکردنی هـۆکـاری دەرکـەوتـنـی و بۆشیکارو رێگاچارە و دەرمانیشی دەبێت پەنا بۆ گوتەزای گشتی بەرین. من دەربڕینی خۆم لەمەڕ توندوتیژی بەشێوەیەکی گشتی دا بەدەستەوە وئومێدەوارم ئەم باسە لەسەر بنەمای ئەم دەربڕینە بەرەو پێش بەرین.

**پ: بفەرموون دەبێت چ بۆچوونو روانینێکمان لەبارەی مرۆڤەوە هەبێت و تاکو چەمکی رێزداربوونی گیانی مرۆڤ روون ببێتەوە و بەشێوەیەکی گشتی چ بنەمایەکی مرۆڤناسی ومەعریفی بۆ رێزداربوونی گیانی مرۆڤ و رەچاوکردنی ئەم نۆرمانە و پارێزگاریکردن لەتوندوتیژی، بەتایبەت لەکۆمەڵگەی ئایینی ئێمەدا بوونی هەیە؟**

د.ســـروش: لــەڕوونــکــردنــەوەی هــۆکــارو بەڵگەی مرۆڤناسی دەرکەوتنی توندوتیژی دەتوانین بۆ هەمان ئەو تیۆریای شارستانیەتە کە پێشتر عەرزمکرد بگەڕێینەوە. لەتیۆریای شارستانیەتدا دەوترێت کە مرۆڤەکان پێش ئەوەی ببنە کەسی شارستانی یاخود بە دەربڕینی لاکو ڕۆسۆ پێش ئەوەی پێ بخاتە کۆمەڵگەی شارستانیەوە، رووت بوون، واتە یاساو ڕێساو نۆرمی گشتیان نەبوو وخۆیان داوەر و جێبەجێکار بوون، دەبێت ئایینەکان بەو قوتابخانانە بزانین کە هاوکاری ویارمەتی بەشارستانبوونی مرۆڤیان کــردووە، واتە مرۆڤەکانیان لە ڕووتی و بێبەرگی ڕزگار کردو چەمکی ڕێکخستن و پێوەرو ڕێساو یاسایان لەخەڵکی تێگەیاند و هاوکاری ئەوەیان کرد کەئەو تاگگەرایی و وێرانکاریە ناشارستانیە تاکو سنورێک خەڵکی بسەننەوە.

ئێمە دووجـۆر "تاگگەرایی" مان هەیە، یەکێکیان تاگگەراییەکی پێش رینسانس وقۆناغی ڕۆشنگەریەو ئەوی دیکەیان تاگگەرایی پاش قۆناغی ڕۆشنگەری. تاگگەرایی پاش قۆناغی ڕۆشنگەری لەراستیدا تاگگەراییەکە کەلەسەر دیاریکردنی مافی تاکەکەسی بـونـیـادنـراوە. واتــە بابەتی "مــاف" نـاسـراوە و هەرتاکێک مافی جیانەبووی خۆی داوادەکات وحەزی لێ نیە لەکۆمەڵدا بتوێتەوە. بـەڵام تاگگەرایی ناشارستانیانەی ئێمە پێش قۆناغی ڕۆشنگەری لەراستیدا تاگگەراییەکە کەخاڵیە لەچەمکی (ماف) و(ئـەرک) ولەگەڵ هەمان ئەو روونیەی کەووتمان بـەتـەواوی گونجاوە. لـەوێدا یاساو ڕێسایانەی کەهەمووان ناگرنەوەو هەمووان ئەو مافەیان نیە، هەرکەسێک حەزو مەیل ودەرکـی خۆی بەخودی ماف دەزانێت وخوازیاری جێبەجێکردنیەتی. ئەم دووجۆرە تاگگەراییە جیاوازی و دووریەکی زۆریان لەگەڵ یەکدا هەیە. تاگگەرایی دواتر لەگەڵ یاسادا هیچ جیاوازیەکی نیە، لەکاتێکدا تاگگەرایی پێش قۆناغی ڕۆشنگەری دژی یاساو خودی فەردگەراییە. لەراستیدا تیۆریای شارستانیەت تیۆریایەکی مرۆڤناسیە کـەهـاورا لەگەڵ ئــەوەدا مرۆڤەکان بـەهـۆی هـۆکـارو بەڵگەی جـیـاوازو جـۆراوجـۆر لەقۆناغی ڕووتــی و دڕندەیی دەرەوەدا چوونەتە نێو قۆناغی داپۆشراوی وشارستانیەتەوە. ئەخلاق، ئایین، فەرهەنگ، وزانست هەموو یارمەتی زیاتر شارستانیەتبوونی مرۆڤ واتە، یارمەتی غەریزەی ماف شکێن ودژە شێوازو دژە ڕێگەیان داوە. ئەم یارمەتیدانی غەریزانە لەبەرامبەر مافـو ڕێگەو شێواز سەردەرهێنان کەئەمە بە "ئەدەب" دەردەبڕێت، کۆی هەموویان مرۆڤیان شارستانی کردووە،. "ئەدەب" نەک بەمانای ڕێزگرتن لەگەورەکان، بەڵکو بەمانای ناسینی ئەدەب هەرپلەو شێوازو شێوەی ڕەفتاری گونجاو لەگەڵ هەرشوێنو پلەیەکدا. وەکو: ئەدەبی شەڕ، ئادابی میوانداری، ئادابی پۆلی وانە، ئادابی شۆفێریو ...هتد وتوندوتیژی، دروست بەمانای بێ ئەدەبی یان ئاداب شکاندنە نەک تەنها داگیرکردن یاخود بەکارهێنانی ووشەی ناشیرین یان لێدانو شکاندن. فرۆید ودەروونناسانی پـاش ئـەو، ئەم تیۆریایەیان جوانترو وورتر کردەوە، واتە دەستیان کردبە ئاشکراکردنی غەریزەو حەزشاراوەکانی مرۆڤ کەلەلای خـودی مرۆڤیش پەنهان وشـاراوەبـوون وهەوڵیاندا نیوە شاراوەی مرۆڤ پیشان بدەن، بەبێ ئەوەی بیانەوێت لەبنەڕەتدا دەست بۆ دابەشکردنی مرۆڤ بۆ دوونیوە عەقڵ وشەهوەت ببەن، ئەوەی کەمەولانا دەیگوت:

ای برادر توهمه اندیشه‌ای
مابقی استخوان وریشه‌ای
واته: ( ئه‌ی براده‌ر تۆ هه‌ر ئه‌ندێشه‌ی و بیریت، ئه‌وه‌ی دیکه‌ت ئێسک و گۆشته). ئه‌م "ئه‌ندێشه" ده‌بێت به‌مانای زۆر فراوات وه‌ربگیرێت تاکو قسه‌ی مه‌ولانا به‌راستی به‌کاربێت. ئه‌گه‌ر پرسیار له‌فرۆید بکه‌ین ده‌ڵێت: ئه‌ی براده‌ر تۆ هه‌موو حه‌زو ئاره‌زوویت وئه‌ندێشه‌ی تۆش له‌ژێر فه‌رمانره‌وای حه‌زو ئاره‌زوو وغه‌ریزه‌كانتدایه.

ئه‌گه‌ر مرۆڤ به‌كۆی دوو به‌ش "عه‌قڵ" و"غه‌ریزه" بزانین، به‌پێی ئه‌وه‌ی مرۆڤناسی ئێمه كام یه‌ك له‌دوو به‌ش به‌سه‌ر ئه‌وی دیكه‌دا زاڵ بكات، ئه‌نجامه‌كه‌ی جیاوازده‌بێت. زۆرێك له‌كه‌سانی رابردوو (له‌ووشه‌كانی ئیمامی علی (خ) له (منهج البلاغه)ش ده‌بینرێت) غه‌ریزه‌ی ئاژه‌ڵی به‌سه‌ر عه‌قڵیدا زاڵترن، مه‌گه‌ر له‌كه‌مینه‌یه‌كدا وله‌به‌رئه‌وه پێش ئه‌وه‌ی عاقڵ بێت، ئاژه‌ڵێكی درنده‌یه. ئه‌مه ئه‌و تیۆرییایه‌یه كه غه‌ریزه‌كان به‌سه‌ر عه‌قڵی مرۆڤه‌كاندا زاڵ ده‌كات. كه‌سانێك كه‌حه‌زیان كردووه مرۆڤ له‌ئاوێنه‌و روخسارێكی دیكه‌دابیبینن واته بڵێن مرۆڤ ده‌توانێت به‌عه‌قڵی خۆی غه‌ریزه‌كان كۆنترۆڵ بكات. تیۆریای شارستانیه‌ت ئه‌مه‌ی ده‌خواست وده‌یگوت ئێستا مرۆڤایه‌تی به‌قۆناغێك گه‌یشتووه كه‌غه‌ریزه‌كانی جنگی عه‌قڵیدان.

له‌رابردوودا ئامانجی خوازراوی زانایان ئه‌خلاق ئه‌وه‌بوو كه‌مرۆڤ بتوانیت به‌عه‌قڵی خۆی غه‌ریزه‌كانی كۆنترۆڵ بكات، ئه‌م كۆنترۆڵكردنه هه‌ندێجار ئاگایانه‌و به‌دژواری ده‌كرێت وهه‌ندێجار خۆبه‌خۆو به‌بێ ئه‌رك. له‌شته سه‌رسوڕهێنه‌ره‌كانی ئه‌مرۆ ئه‌وه‌یه‌كه له‌تیۆریاكانی پۆست مۆدێرنه دووباره بۆ قۆناغی رابردوو گه‌راونه‌ته‌وه. واته له‌پۆست مۆدێرنیزمدا ده‌وترێت عه‌قڵی مرۆڤ زۆر له‌وه‌بێ تواناتره كه‌ده‌یزانێت وه‌هۆكارو سیفه‌تی وه‌كو هۆكاری ناعه‌قلانی‌و ونامه‌عریفی فه‌رمان به‌سه‌ر عه‌قڵدا ده‌كه‌ن، عه‌قڵی مرۆڤ وه‌كو ئه‌و منداڵه وایه كه‌گه‌رچی ده‌رباره‌ی خۆی لافی گه‌وره لێده‌دات، به‌ڵام له‌توانای بینین وروانین زۆر به‌كه‌می خاوه‌ن توانایه. ئه‌م بانگه‌شه‌یه له‌راستیدا نه‌فیكردنی تیۆریای شارستانیه‌ته. به‌دڵنیاییه‌وه كتێبی "بۆچی جه‌نگ؟"ی فرۆیدت بینیوه. كێشه‌ی گرنگی فرۆید ئه‌وه‌بووكه ئێمه چاوه‌ڕوانی ئه‌وه‌مان نه‌ده‌كرد مرۆڤه شارستانیه‌كان شه‌ڕبكه‌ن. ئێستاش كه‌جه‌نگ روویداوه ده‌بێت ببینین كه‌ئایا مرۆڤ له‌راستیدا بووه‌ته مرۆڤێكی شارستانی یان نه‌بووه! ده‌ڵێی مرۆڤه‌كان هه‌روه‌ك هه‌مان ئه‌و گیانه‌وه‌ره‌یه كه‌به‌ندكراوه‌و ئاماده‌یه رۆژێك ئه‌م كۆتو به‌نده بشكێنێت ودووباره ده‌ست به‌وه‌حشیگه‌ری ودرنده‌یی بكاته‌وه. له‌شه‌ڕدا مرۆڤه‌كان خۆیان پیشانده‌ده‌ن‌و ئه‌وه‌ده‌سه‌لمێنن كه‌هێشتا نه‌بوونه شارستانی. پۆست مۆدێرنیش كه‌له‌مه‌یدان‌و گۆڕه‌پانی ئه‌ندێشه‌ی نوێدا شێوه‌ی ژیان یه‌كێك له‌مه‌دلولاته كۆتاییه‌كانی ئه‌وه‌یه كه‌مرۆڤ به‌وجۆره‌ی كه‌واده‌زانرێت شارستانی نیه وعه‌قڵی ئه‌سیرتره له‌وه‌ی كه بتوانرێت پشتی پێ ببه‌سترێت وداوای كۆنترۆڵی غه‌ریزه‌كانی لێ بكرێت. له‌ڕاستیدا ووشه‌ی "سیاسه‌ت" له‌رابردوودا زیاتر ئاماژه‌ی به"ئه‌ده‌ب داران‌و ئاگاداركردنه‌وه — تادیب وتنبیه" ده‌كرد و مانای ئه‌مرۆی واته "رێكخستن" و"به‌رنامه‌ڕیژی"ی نه‌بوو، بۆچی؟ له‌به‌رئه‌وه‌ی حكومه‌ت پشتی به‌عه‌قڵی كۆیی گشتی نه‌ده‌به‌ست، به‌ڵكو وه‌زیفه‌ی خۆی به‌كۆنترۆڵكردنی مرۆڤه‌كان

دەزانی کەزیادلەوەی پەرێشانی عەقڵبن، ئەسیری غەریزەکان بوون.
ئەگەر لەڕووی مەعریفەت ناسییەوە عەقڵی مرۆڤ بەلاواز بزانین وئەگەر حەزو ئارەزووی مرۆڤەکان لەبەرامبەری عەقڵیدا بەهێز یان نیوە ئاژەڵیەکەی مرۆڤ لەمەڕ نیوە مرۆییەکەی مرۆڤ گەورەتربکەین، زەمینەی پێویست وئامادە بۆ دەرکەوتنو ئاراستەکردنی توندوتیژیمان فەراهەمکردووە. بەڕوونکردنەوەیەکی دی کارە توندوتیژیەکان کارێکی سروشتی وبەڵکو پێویست دەبن. بەڵام ئەگەر لەبەرامبەردا عەقڵی مرۆڤ هێندە بەئەسیروبەند نەزانین ونیوە مرۆییەکەی گەورەتر لەنیوە ئاژەڵیەکەی بزانین، توندوتیژی بەلانی زۆرینەوە بەشێوەی کارێکی ئاوارتەیی دەردەکەوێت. سودێکی کرداری بەپەلە کەلەم پێشەکیەوە دەست دەکەوێت ئەوەیە کەبۆ کەمکردنەوەی توندوتیژی دەبێت مرۆڤەکان تێگەیشتووتر، خوێندەوارترو بەئاگاتربکەین. توندوتیژی بەدەشتەکیەکانو نائاگایانەوە پەیوەستە. لەومرۆڤانەی کەنیوە ئاژەڵیان زاڵترە بەسەر نیوەی مرۆییاندا، توندوتیژی یاساو ڕێسایە ولەوەمرۆڤانەی کەنیوەی مرۆییان بەسەر نیوەی ئاژەڵیاندا زاڵە توندوتیژی شتێکی ئاوارتەییە وکاروانی شارستانیەتیش بەرەو زاڵبوونی مرۆڤایەتی بەسەر ئاژەڵیەتی بەرەو پێشەوە دەڕوات. گشتاندنی فێرکردنی خوێندەواری نەک تەنها بۆئەوەیە کەزانست فەزیلەتە، بەڵکو بۆئەوەیە کەخوێندەواری لەپایەکانی شارستانیەت بوونەو مرۆڤە شارستانیەکان، کێشەکانیان بەسەر پەنجەی عەقڵ دەکەنەوەو نەبەزۆرو بازوو یا نووکی شیر و تیغ. ئازادی چاپەمەنی وئازادی رادەربڕینیش لەهۆکارەکانی کەمکردنەوەی توندوتیژین، لەم ڕێگەیەوەیەکە ئاستی ئاگاییەکان بەرەو بەرزتردەبەن. لەبەرئەوە سەندنەوەی ئازادی لەچاپەمەنیەکان، خودی توندوتیژیە، چ بەشێوەی ترساندن بێت چ بەڕێگە بەڕوکەش دادگاییو یاساییەکان بێت. هیچ یاسایەک ناتوانێت ڕێگە بەتوندوتیژی بدات. توندوتیژی یاسایی وەکو حەڵوای تاڵی هەڵگەراوەیە بەومەرجەی توندوتیژی بەتێگەیشتن وچەمکە فراوانەکەیمان لەبەرچاو بێت وهەرشتێک لەئازادی خەڵکان ومرۆڤەکان کەم بکاتەوە بەجۆرێک لەتوندوتیژی بزانین.

### پ: دەکرێت پەیوەندی تاکگەرایی بەتوندوتیژیەوە، ڕوونکردنەوەیەکی زیاتر بفەرموون؟

د.سروش: هەربەوجۆرەی عەرزمکرد دووجۆر تاکگەراییمان هەیە، تاکگەراییەک کە گونجاوە لەگەڵ یاساو ڕێساو سازگارە وتاکگەراییەک کەدژی یاسایە. تاکگەرایی یەکەم بەمافەوەیەو ماف بەشێوەی یاسایی وگشت دەردەهێنێت وهەمووان مافی خۆیان لەبوونی ئەو یاسایەی کەهەیە دەیدۆزنەوە ولەبەرئەوە یاسا لەگەڵ تاکگەرایی ئەواندا هیچ جیاوازییەک دروست ناکات. "تاکگەرایی" نەک بەومانایەی کەهەمووکەس تەنها پێ لەسەرمافی خۆی دابگرێتو مافی ئەوانی دی بەهەندوەرنەگرێت، بەڵکو "تاکگەرایی" بەمانای ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ ئەوەی مافی خۆی بەبەرێز دەژمێرێتو هەندێک لەمافیش بەوەدەزانێت کەهی ئەوانیترە ورێزلەمافی ئەوانی دیی بگرێت ویاسا بەپارێزەری مافی هەمووان بزانێت بەڵام لە"تاکگەرایی ناشارستانیانە" نەک تەنها مافی ئەوانی دی تەرح

ناکرێت، بەڵکو چەمکی "ماف" وبەدوی ئەویشدا ئەرکیش لەبنەڕەتدا لەدایک نەبووە وتاک بەپاڵنەری غەریزەو حەزەکان بەرەو کردار دەڕوات وئەوانی دی وەکو هۆکارو ئامرازی کارو کرداری حەزەکانی خۆی دەناسێت. ئێمە ئەمڕۆ لەگەڵ تیۆریای ئیرادەی گشت یان هەڵبژاردن هێندە ئاشناییین کەگرنگی مێژوویی ئەم تیۆریایە بەمجۆرەی کەدەبێت دەرکی ناکەین. لەکۆمەڵگای مەدەنیدا مرۆڤەکان بەحەزو مەیلی تاکەکەسی خۆیان، کەسێکی دی یان دامەزراوەیەکی دیکە لەجێگەی خۆیاندا دادەنێن. دانانی کەسێکی دیکە لەجێگەی خودو قسەی ئەو بەقسەی خودزانین، هەنگاوێکی باڵابووەلە مێژووی فیکری مرۆییدا. "تاکگەرایی" ئەگەر بەم مانایەبێت کە کەسێک جێگەی من ناگرێت وهەموو جێگەیەک دەبێت خودی "من" ئامادەبم وتەنانەت هەرگیز ئەوی دیکە نابینم شتێکی ناشارستانیانەیە. لەراستیدا شارستانیەتی مرۆیی کاتێک فراوان دەبێت کەداوێنو بازنەی گریمانەکانو ئیعتباراتی مرۆڤ فراوان بن. (مەبەست لەئیعتیباردانان بەو مانایەناکە: الف لەجیاتی الف بەگریمانە دابنرێت و جگە لەخۆمان لەجێگەی خۆماندا دابنێین، وەکو بریکاردانانو هەڵبژاردنی سەرۆک و... هتد). شارستانیەتی مرۆیی لەگەڵ فراوانبوونی بازنەی ئیعتیبارسازی مرۆڤ پەیوەندیەکی راستەوخۆی هەیە. هەندێک لە کۆمەڵناسان وفەیلەسوفانی زانستی کۆمەڵناسی ئاماژەیان بەوەکردووە کەئاژەڵەکان شارستانیەتیان دانەهێناوە، چونکە ئیعتیبارسازی لەتوانایاندا نەبووە.

لەئاژەڵاندا تەنها "عادات" وغەریزەکان بوونیان هەیەکە لەوەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دی دەگوازرێتەوە. لەبارەی مرۆڤەوە لەگەڵ بوونی عادات وغەریزە بازنەی ئیعتیبار سازی هەم لەزمان وهەم لەکرداردا فراوان دەبێت. مرۆڤ لەقەڵەمڕەوی زمان، شیعرو ڕۆمان وجۆرەکانی دیکەی ئەدەبی دروست کردووەو داهێناوە کەجۆرێک ئیعتیبارسازین وتوخمی خەیاڵ لەرادەبەدەر تیایاندا بەشراوە. لەجیهانی سیاسەتیشدا دەستی بردووە بۆجۆرێک لەئیعتیبارسازی گرنگ، واتە مرۆڤەکان توانیان کەسێکی دیکە لەجێگەی خۆیان دانێن وچەمکی "جێنشین" یان بەدیهێناوە وقسەو ئیرادەی بەقسەو ئیرادەی خۆیان بزانن. ئەم کارە لەراستیدا مەجازسازییەک وجۆرێک ئیعتیبار بوو. کاتێک کەمرۆڤ کەسێکی دیکەی بەنوێنەرو بریکاری خۆی زانی وقسەو ئیرادەی ئەوی بەقسەو ئیرادەی خۆی ژمار، سیستەمێکی سیاسی وکۆمەڵایەتی نوێی داهێنا. ئیعتیبارسازی لەکارەلە ڕادەبەدەرە پێشکەوتووەکانی ژیری مرۆییەو هەوڵو کۆششێکە کەپایەی شارستانیەت سازیە. ئەمە هەمان ئەو تاکگەراییە کەلەگەڵ ڕێکخستنو یاسادا سازگارەو جیهانی نوێ بونیاددەنێت. بەگریمان دانانو ئیعتیبارکردن هەمیشە پرۆسێسی مەبەستێکی کۆمەڵایەتیە، لەبەرئەوە تاک لەڕێگەی ئەم ئیعتبار سازیەوە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دەهێنێتەبوون. "گریمانە وئیعتیبار" ئەوەیە کەلەکۆمەڵ وگشتیدا بەفەرمی بناسێت. ئەگەر "گریمانەی ئێوە" لەلایەن گشتیەوە قبوڵ نەکرێت، ئەوە بەهایەکی نیە. ئەگەر

پارچە كاغەزێك بەخەياڵی خۆتان بەپارەدابنێن (ئیعتیباری پارەی بۆدابنێن)، بەڵام ئەوانی دی بەپارە ناژمێرن، ئەوكاتە ئەوپارەیە لەكۆمەڵگەدا بەهاو بایەخێكی نیە. لەبەرئەوە ئەم جۆرە تاكگەرایی‌و ئیعتبارانە تاكەكەسیە لەسەر دیاریكردنی مافی تاكەكەسی بینابوو وسیستەمی سیاسی نوێی دروستكرد. لەتاكگەرایی ئێمەپێش مۆدێرن، چەمگی "ماف"و"ئیعتبارسازی" و"جێنشینی" و"بریكاری" و"ئەو سەرۆكایەتیەی لەبریكاریەوە دروست دەبێت" و"فراوانبوونی هێزی خەیاڵ" بوونی نەبوو وئەمەش هەمان ئەو دڕندەییە كەئێمە باسی دەكەین. فراوانبوونی توخمی "خەیاڵ" یان بەدەستەواژەیەكی دی فراوانبوونی گریمانەسازی، ئیعتیبارسازی، هونەرو شیعر، زۆر هاوكاری فراوانبوونی بازنەی شارستانیەتی كردووە. ئەو ئەنجامەی كە دەستمان دەكەوێت ئەوەیەكە شارستانیەت لەگەڵ هونەردا پەیوەندیەكی تەواو وراستەوخۆی هەیە. هەرجێگەیەك كەهونەر فراوان دەبێت، شارستانیەتیش فراوان‌و تاكگەرایی بەمانای زمكراوی كەمتر دەبێتەوە وسیستەمی كۆمەڵایەتی وسیاسی ماناو مەبەستی باشتری دەبێت و مرۆڤەكان شارستانیتر دەبن. مرۆڤ‌و كۆمەڵگەی هونەرمەندتر، شارستانیترە. ئەوجێگەیەی كەتوخمی خەیاڵ بەمانای وردی ووشە زیاتر بەكاردێت وكارایی زیاتری هەیە، شارستانیەت وتەنانەت یاساگەرایی وڕێكخستنێكی زیاتریشی هەیە. هەمیشە واگومان دەكرێت لەبەرئەوەی هونەر ناسكی هەیە، لەبەرامبەر توندوتیژیدا دەوەستێت. بەڵام هونەر لەڕێرەوێكی گرنگتر بەردەم توندوتیژی دەگرێت. هونەر، بەرهەم هێنراوو لەدایكبووی فراوانبوو بۆ ئیعتیبارسازی دەگەرێتەوە. بریكارسازی، بونیادسازی، پارەسازی وپارەدروستكردن، زمانسازی‌و ... لەجیلوەكانی ئیعتیبارسازین. هەرلەم رووەوەیە كەفراوانبوونی هونەر دەتوانێت بەشێوەیەكی ناراستەوخۆ زەمینەسازی شارستانیەت‌و سیستەمی سیاسی بێت كەبەردەم توندوتیژی بگرێت.

پ: كەواتە لەراستیدا ئێوە باس لەدوو جۆر توندوتیژی دەكەن، یەكێكیان ئەو توندوتیژیەی كەلەبەرامبەری نێوان شارستانیەت‌و پێش شارستانیەت هاتۆتەدی‌و ئەوی دیكەیان ئەو توندوتیژیەی كەلەبەرامبەر نێوان سوننەت‌و مۆدێرنە هاتۆتەدی؟

د.سروش: هەربەم جۆرەیە. شارستانیەت، توندوتیژی كۆنترۆڵ دەكات و لەكاتێكدا كەمرۆڤ دەچێتە نێو قۆناغی مۆدێرنەوە ئەم كۆنترۆڵكردنە شێوەی یاسایی‌و شتێكی بەڵگەنەویست وەردەگرێت. پەرینەوە لەقۆناغی زاڵبوونی ئاژەڵیەیی بەرەو قۆناغی زاڵبوونی مرۆیی شتێكی پلەبەپلەیە. لەبەرئەوە لەدڵی مرۆڤی شارستانی هەمیشە دەتوانرێت ئەو مرۆڤە شارستانیە یان كەم شارستانیە ببینرێت وهیچ كاتیش نابێت لەم ساتە خاڵی ببێتەوە كەتێكەڵێك لەدڕندەیی هەروەها لەبوونی مرۆڤە شارستانیەكاندا هەیە.

سەرچاوە: سیاسەت نامە، د.عبدالكریم سروش، دامەزراوەی فەرهەنگی صراط، چاپی چوارەم، ١٣٨٤، لاپەرەكانی ٢٢٥- ٢٣٦.

* شیعرەکانی بێژەن جەلالی..
* ئاوێنەی شکاو..
* نرخی بیست کوژراو..
* میلان کوندێرا..
* دۆستێڤسکی و..
* زمانی چیا



# هەڵبژاردەیەك
# لە شیعرەكانی بیژەن جەلالی

نووسـنـی: بیژەن جـەلالـی
و. لـە فـارسـیـیـەوە: ئازاد بـەرزنـجـی

**پ**ێشەکییەکی کورت
بیژەنی جەلالی ساڵی ١٩٢٧ لە تاران هاتۆتە دونیاوە و باوکی ناوی «ئیبراهیم جەلالی» بووە و دایکیشی «ئەشرەف الملوک هیدایەت» ە کە خوشکی نووسەری گەورە «سادیق هیدایەت» بووە.
بیژەن چەند مانگێک لە کۆلێجی فیزیای زانکۆی تاران خوێندی، بەڵام وازی هێنا و چوو بۆ فەڕەنسا و لە زانکۆکانی تۆلێز و پاریس بەشی زانستە سروشتییەکانی خوێند. گەرچی لەوێش، خۆشەویستیی بۆ شیعرو ئەدەب وای لێ کرد خوێندنەکەی پشتگوێ بخات و لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا کە لەوێ مایەوە، بە ئەزموونی شیعری شاعیرە گەورەکانی فەڕەنسا ئاشنابوو، لەوانە: بۆدلێر، ڕامبۆ، مالارمێ، ڤالیری و پۆڵ ئێلوار. شایانی باسە هاوڕێیەتییەکی بەهێزی لەگەڵ پۆڵ ئێلواردا هەبوو.
ئەمە جگە لەوەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ماڵی سادیق هیدایەتی خاڵیدا مایەوە و لەو ماوەیەشدا بەردەوام لەگەڵ خاڵیدا لە

**شایانی ئاماژە پێدانە که بیژەن لەسەر دەستی کۆمەڵێك مامۆستای بەناوبانگ پەروەردە بووە، لەوانە: مەهدی موجتەهیدی، یەدوڵای سەحابی، ڕەزا جەودەت، زەبیحوڵای سەفا، مەحمود بەهزاد، عەبدوڵا شەیبانی و محەمەد حوسێن مەشایخ فەریدەنی**



بیژەن جەلالی

گفتوگۆی ئەدەبی و فیکری و عیرفانیدا بوو.
بیژەن بە یەکێک لە شاعیرە گەورەکانی شیعری پەخشان دەژمێردرێ لە ئێراندا و ئەزموونی شیعریی ئەو کاریگەریی تایبەتی هەبووە لەسەر وەچەی دوای خۆی.
شیعری بیژەن شیعرێکە لەگەڵ حاڵەتە گەوهەرییەکانی ژیان و بووندا مامەڵە دەکات. ئەو حاڵەتانەی کە دەشێ لای هەر مرۆڤێک و لە هەر سەردەمێک و هەر وڵاتێکدا بێت دووبارە ببنەوە. شیعرەکانی چرکەساتی دڵڕفێنەکانی بوون و ژیانی ڕۆژانە ڕاو دەکەن و لە پەڕەی دڵی ئادەمیزاد دەدەن.
لە کاتێکدا شیعرەکانی بیژەن لە چەمک و واتا قووڵەکانی فەلسەفە و عیرفانی خۆرهەڵاتی خاڵی نین، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تا بڵێی دوورن لە ئاڵۆزی و تەمومژاوی نین. ئەو بە شێوازێکی سادە واتا قووڵەکانی بوونمان بۆ بەرجەستە دەکات. هەربۆیە شەفافیەت و قووڵبینی دوو خەسڵەتی بنەڕەتیی دونیای شیعریی بیژەنی جەلالین. بیژەن دێت و پرسیارەکانی ژیان دەکاتە چرکەساتی شیعری و ناچارمان دەکات بە چاوی تێرامان و خوردبوونەوەوە لێیان بڕوانین.
شایانی ئاماژە پێدانە کە بیژەن لەسەر دەستی کۆمەڵێک مامۆستای بەناوبانگ پەروەردە بووە، لەوانە: مەهدی موجتەهیدی، یەدوڵای سەحابی، ڕەزا جەودەت، زەبیحوڵای سەفا، مەحمود بەهزاد، عەبدوڵا شەیبانی و محەمەد حوسێن مەشایخ فەریدەنی.
بیژەن لە کۆمپانیای پترۆکیمیاوی کارمەند بوو تا لە ساڵی ١٩٨٠ دا خانەنشین کرا، دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەو تا مرد ژنی نەهێنا و هەر بە تەنیا ژیا. ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٩٩ دا تووشی سەکتەی مێشک بوو و تا ماوەی مانگێک بێهۆشی کرد و پاشان لە تەمەنی ٧٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.
لە دیوانە شیعرییەکانی بیژەن: ڕۆژەکان ١٩٦٢، دڵی ئێمە و جیهان ١٩٦٥، ڕەنگی ئاوەکان ١٩٧١، ئاو و هەتاو ١٩٨٣، گەمەی ڕووناکی ١٩٩٠، ڕۆژانەکان ١٩٩٤.
شایانی باسە شیعرەکانی بیژەن بۆ سەر گەلێ زمان وەرگێڕراون و لە ئێران خەڵاتێک هەیە بە ناوی ئەوەوەیە و لە خەڵاتە شیعرییە گەورەکانە و ساڵانە دەدرێ بە شاعیرێک.
ئەم شیعرانەی کە لێرەدا وەرمگێڕاون، هەڵبژاردەیەکن لە دیوانەکانی.

«وەرگێڕ»

پێشکەشە بە « Naza "

١

گوڵان چەند دێوانەن
بێباکانە و بە بێ خەم
بەچاو بەستراوی ڕێ دەکەن
گەڵاکانیان چەند شێتانە سەوز دەبن
بە هەموو لایەکدا و
لەبەر بای دێوانە ئاسادا
لەبەر خۆیانەوە ئاواز ئەچڕن
ئەم گوڵە بێباکانە
چی ئەڵێن؟
ئەم گەڵا بێ خەمانە؟

٢

من لێرە
لەم سەرزەمینی حیکمەتە ڕاوەستاوم
تا شایەتیی هەڵهاتنی خۆر بدەم
من لێرە
لەم سەرزەمینی زستانە ڕاوەستاوم
تا چاودێریی زیندوویەتیی یادی وەرزی بەهار بکەم
وەستاوم تا لەبارەی «بوون» و «باشی» «وە بدوێم و
بە تەنیاش شایەتی هەقیقەت بم

٣

مردن شتێکی سادەیە
لە ژیان گەلێ سادەترە
تەواوی دڵەکوتێی مەرگ
بەرامبەر گومانێك
بەرامبەر چاوچنۆکییەك
بەرامبەر ترسێك
بەرامبەر ڕقێك
بەرامبەر خۆشەویستییەك
هیچ نییە
مردن شتێکی سادەیە و
بەرامبەر ماندووێتیی ژیان
وەك سەفەرێکە لە ڕۆژێکی پشوودانا ئەیکەین و
ئیدی هەرگیز ناگەڕێینەوە



٤

ئەمەوێ بمرم
بەڵام نەك دڵم لە لێدان بوەستێ و
لەشم سارد و سڕ بێ و
بمكەنە خاك
ئەمەوێ بمرم
بەڵام نەك گوێم لە هیچ نەبێ و
هیچ خۆرێك بەسەرما هەڵنەیێ و
مانگ و ئەستێرەكان نەبینم
ئەمەوێ مەرگێكی تەواو نائاسایی بمرم
مەرگێك لە بوونەهەڵمی ئاو بچێ
لە ڕسكانی تۆو
ئاوابوونی خۆر
هەوراوی بوونی ئاسمان
ئەمەوێ نەمێنم
تا لە دونیایەكی ترا دەربكەومەوە
دونیایەك كە هێشتا ناوم لێ نەناوە

دونیایەك كە تامیم تەواو نەچەشتووە
دونیایەك كە لە جیهانی خەیاڵ ئەچێ
كە تیایدا هەموو شتێ ئاسایی بێ
جگە لە ترسی نەمان و
لە تیامان
جگە لە تەنیایی

٥

من كوێرم وەك ئەو كەسەی
زۆر تەماشای خۆری كردووە
یا سپێتیی هەقیقەت
چاوانی ئەبڵەق كردووە
من خامۆشم وەك ئەو كەسەی
بە ڕاكردن
لە ڕێیەكی گەلێ دوورەوە هاتووەو
بەرلەوەش كە ڕازی خۆی بدركێنێ
بە جیهان و
هەموو شتەكانی ناوی
نامۆ بووە

٦

چارەنووسی شاعیریش
ڕسكان و هەڵكشانە بەرەو ڕووناكی
وەك ئەو تۆوەی
كە لەژێر خاكێكی سەخت و ساردەوە
ڕێی خۆی بەرەو ڕۆژ و
بەرەو خۆر
ئەكاتەوە

٧

من تێناگەم بۆ ئەنووسم
باس لە خۆم ئەكەم
یا دونیا
بۆ خۆم ئەنووسم
یا ئەوانی دی
هێندە ئەزانم كە كەسێك
یاخود شتێك
لە گۆڕێیە
كە لە من و دونیا زیاترە
لە من و ئەوانی دی گەورەترە

٨
ئێمە هەموومان پیر ئەبین
هەروەکو فنجانی چا و دیواری ژوور
وەلێ من خێراتر هەناسە ئەدەم و
زووتر پیر ئەبم
٩
لەبەر چاومدا مەرگ ئەبینم
وەستاوە یا دانیشتووە
یاخود ئەڕوا
چاو لەسەری لا ئەبەم و
ڕوو ئەکەمە شیعر
شیعر ئەبینم
وەستاوە یا دانیشتووە
یان ئەڕوا
وەك مەرگ
١٠
ئەمەوێ بچمە پێستی
گیانەوەرانەوە و
لەچاوی ئەوانەوە
سەیری دونیا بکەم
بەڵکو مانایەك بدۆزمەوە
هێندەی قەوارەی خەمم بێ
١١
سەرم ئەخەمە سەر قەراغی بەرد
لێوم ئەخەمە سەر لێواری ئاو
دەستیش ئەخەمە ناو دەستی باوە
ئەڕۆم تا لە شوێنێ بسووتێم
کە نازانم کوێیە
١٢
ئەوە ماندوویێتییە وا بە کوڵ ئەگری
یان برسێتی
یان تینووتێییە شین و زار ئەکا
یاخود ژیانە
کە بەدەم ئێش و ئازارەوە
بەدوای کۆتایی خۆیدا ئەگەڕێ؟

١٣

*چەند حەزم ئەکرد لەناو دەنگی تۆدا بمرم*

*یاخود لەگەڵ دەنگتا ڕێ کەم*

*یان لەناو دەنگتا بێدەنگ بم*

*دەنگی تۆ وەکو با ڕۆیی*

*منیش ئێستا*

*خۆم بە دامێنی تاریکیدا هەڵواسیوە*

١٤

*لەنێو پەنجەکانی «سین» و*

*چەتری «جیم» دا*

*گیرم خواردووە*

*ئاخۆ کەی بێ*

*بتوانم بێ وشە بژیم*

*بەر لەمردن؟!*

١٥

*خۆر لەو دوورەوە*

*چرایەکی چەند پڕشنگدارە*

*هەموو ژوورەکەی منی*

*ڕووناك کردۆتەوە.*

١٦

*کە چاوم ئەبڕمە ئاسمان*

*هەر ئاسمانە*

*لەو دیویەوە*

*من هیچی دی بەدی ناکەم*

*چون ئاسمان لە ئاسماندایە*

*منیش بە تەنها*

*چاوم بڕیوەتە ئاسمان*

١٧

*تۆ دەنگی پێی خۆت*

*بیرنایەتەوە*

*چون هەمیشە لەگەڵتایە*

*بەڵام من دێتەوە یادم*

*لەبەرئەوەی لەگەڵما نیت*

*دەنگی پێی تۆ*

*لە نێو دڵما ڕۆنیشتووە*

١٨
مەرگ ئەبینم کە وا دێت
گوڵەباخێکی لە دەستایە
منیش باسی ڕەنگی گوڵ و
بۆنی گوڵی بۆ ئەکەم
پەیڤەکانی گوڵی بۆ ئەچڕم و
تەماشای زەردەخەنەی گوڵ
بەسەر لێوی مەرگەوە ئەکەم
١٩
ئەوە مەرگە
ئێمە دەناژۆێ
لە سپێدەوە تا ئێوارێ
تا زیندوو بین
بۆ خواردن و بۆ خەوتن و
بۆ مردن.
٢٠
ئەفسووس کە ژیان
مەحاڵە
کەچی هەرهەین و
لە ئارەزووی هەموو شتێکدا
دێین و دەڕۆین.
٢١
من قایلم بە ژیان
لە پێناوی گەڵاکانا
لە پێناوی هاوڕێکانا
سەگ و پشیلەکانا و
لە پێناوی چەند خۆشەویستییەکی تێپەڕ
من قایلم بە ژیان
لە پێناوی سەیرکردنی
ساتەکانا.
٢٢
بەیانییەکی غەمگینە
لێ وا چاکە
قەدری ئەم غەمە بزانم

٢٣

خووم بە تاریکیی
شەوەوە گرتووە
ڕۆژیش لای من
زۆر ڕووناکە و
زۆر جەنجاڵە

٢٤

چرکەساتێکی چەند شکۆدارە «بێدەنگی»
کە بەردەوام ئەبێت
لە بێ پایانیی چرکەساتەکان و
بێ پایانیی بێدەنگییا.

٢٥

مردن لەناو جەستەمدا
چەند شپرزەیە و
بێ ئۆقرەیە
منیش لەو خەم و
شپرزەییەیدا
خۆم بە هاوبەشی ئەزانم

٢٦

تەمەنم بە با داوە
ساتەکانیشم وەشاندووە
وەك تۆوی
بێهوودەیی و نەزانین
بەڵام چ سەوزەڵانێك ئەبینم و
چ گوڵانێك ئەچنمەوە

٢٧

جیهان زەردەخەنەیەکە
لەسەر لێوی مەرگ و
تروسکەیەکە لە چاوانیا
جیهان وشەیەکە
کە لە ڕەشایی مەرگدا
پەرێشان ئەبێت

٢٨

بە پێپلیکانەی شیعری مندا
تۆ سەرکەوتوویت
ئەی ئەستێرە ڕەشەکە
منیش ئومێدم بە ددانە سپییەکانی تۆیە
بۆ دادڕینی ڕەشایی شەو

٢٩
هەموو شتێ لە «ئێستا» دا
کورت ئەبێتەوە
ئەو ئێستایەی جگە لە وەهمێ هیچی تر نییە
٣٠
کاتێ ڕاستییەك بە قسە نەگوترا
یان ئەبێ بێدەنگ بین
یان ئەبێ شیعر بڵێین

٣١
ئەمەوێ لەوانیتر بپرسم
کێن
تا بزانم خۆشم کێم و چارەنووسم چییە
٣٢
ئەوە عەدەمە
کە شەپۆل ئەداو
لە هەموو شوێنێ هەیە و
بەسەر ڕووی بوونەوە
زەردەخەنە ئەیگرێ
٣٣
فراوانیی مەرگ
چەند جوانە
ئەم هەموو گەڵای خەزانە
هەڵوەریونەتە سەر زەوی
٣٤
کەس نازانێ
ڕووی دەمی من
لە کێ بووە
لە خواوەندی خۆم
کە ئەڵێی ژنێکی جوانە
یا لە ژنێکی جوان
کە خواوەندی
ژیانی من بووە
٣٥
چ دەریاچەیەك بوو
نیگات
منیش نەمدەزانی تا کوێ
لەگەڵ زەردەخەنەکەتدا
سەوڵی تیا لێ ئەدەم

٣٦

خودایا

من تۆم نەناسیوە

بە تەنها تۆم

خۆشویستووە

٣٧

عیشقی ئێمە

بوو بە دەنگێ

لە زاری باڵندەیەکدا و

بەرە و شوێنە دوورەکان چوو و

لە نێو لق و پۆپی درەختەکانیشدا

ون بوو

٣٨

ئاخۆ ئەبێ چەند شاعیر بیت

تا بتوانیت گوڵێك ببینیت

تا بتوانیت گوڵێك بڵێیت

٣٩

هەموو داخی من

لە مردن ئەوەیە

کە چیتر لە ناو خاکدا

ناتوانم هەست

بە بۆنی خۆشی خاك بکەم

٤٠

بریا هێندەی

خرێتیی خۆرم ئەزانی

یاخود بریا

بەقەدەر شەو تاریك ئەبووم

وەلێ من ئەستێرەیەکم

لە شەوێکدا گرفتارم

٤١

گەر کەسێك ویستی بمبینێ

پێی بڵێن چووە تا تەماشای باران بکا

گەر هەر زۆری کرد

پێی بڵێن چووە بۆ سەیری تۆفانەکان

گەر هەر سوور بوو لەسەر ئەوە

بڵێن چووە

تا چیدی نەگەڕێتەوە

٤٢
قسەیەکم پێیە
کە تا ئێستا نەمنووسیوە
لەبەرئەوەی
لە تەواوی کاغەزەکان سپیترە...
٤٣
نابینای تۆم
نزیکتر بەرەوە لێم
من تەنها بە خەتی بریل ئەتوانم تۆ بخوێنمەوە
نزیکتر بەرەوە لێم
تا مانای ژیان بزانم
٤٤
گوڵێک
هەموو شتێکە
وەختێ باش لێی ڕادەمێنیت
ئەڵێی گەردوونە و
بە چاوی درەوشاوەیەوە
حەپەساوە و
سەیرمان ئەکا
٤٥
هەمیشە پەنجەرەیەک هەیە
کە بە ڕووی تاریکییا ئەکرێتەوە
هەمیشە نیگایەکیش هەیە
کە ئەڕوانێتە
یادەوەرییەکی دوور
٤٦
ناوی من
پاش من ئەمێنێتەوە
وەلێ ناوی من
چ پەیوەندییەکی بە من و
بە شیعری منەوە هەیە
نازانم
٤٧
من
لە گەڵایەک ئەچم
بەگەردووندا هەڵواسراوم

٤٨

شیعر نە سەرەتای هەیە و
نەکۆتایی
شاعیر چون باخەوانێکە
چەپکە گوڵ ئامادە ئەکا
بەبێ ئەوەی کە بزانێ ئەیدا بە کێ و
لەبەر دەرگای کێ دایدەنێ

٤٩

ناوت ئەنێم شیعر
یان ڕووتیی جیهان
یاخود برسێتیی
بە هەزاران ناو بانگت ئەکەم
تۆ کە وەك گوڵێکی نادیار
شکۆفەت کردووە لە دڵما

٥٠

مەرگ دێت و
بە دەستێك چاومان ئەنووقێنێ و
بەوی تریش
میوەی خۆر لێدەکاتەوە

٥١

ئاخۆ کەی وەرزی شیعر دێ؟
ئاخۆ کەی جیهان
لەسەر باڵی پەیڤ ئەفڕێ؟
ئاخۆ کەی وەرزی شیعر دێ و
لەغەم و بێزاریی دونیا
ڕزگارمان ئەکا؟

٥٢

با وا سەیری شیعر بکەین
ئاسمانێکە پڕ ئەستێرە
لە ئاسمان و ئەستێرەکانیش وا بدوێین
کە شیعرێکن
پڕ لە جوانی.

# ئاوێنەی شکاو

نووسینی: سادقی هیدایەت
و. لە فارسییەوە: پشکۆ جەباری

ئۆدێت وەک گوڵەکانی سەرەتای بەهار تەڕو تازە بوو، بە جووتە چاوێکی خووماری ڕەنگ ئاسمانی و زوڵفە خۆڵەمێشییەکانی کە بەردەوام بەشێکی بە سەر گۆنایەوە بوو. کاتێکی زۆر بەو لاڕووە جوانکیلە ڕەنگ پەڕپوەیەوە لە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی دائەنیشت و پێی لەسەر پێ دائەنا، ڕۆمانی ئەخوێندەوە، گۆرەویەکانی ئەدوریەوە یاخود پینەی دەکرد، بە تایبەتی کاتێ بە کەمانەکەی پارچەیەک مۆسیقای خەمباری ئەژەن، بەیەکجاری دڵمی ئەهەژان.

پەنجەرەی ژوورەکەم رووبەڕووی پەنجەرەی ژوورەکەی ئۆدێت بوو، چەنەها خولەک و



سارق هیدایەت

چەن کاتژمێر و ڕەنگە هەموو ڕۆژانی یەکشەم من لەپشتی پەنجەرەی ژوورەکەمەوە تەماشام ئەکرد، بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە گۆرەوییەکانی دەرئەهێنا و ئەچووە جێی خەوەوە!

بەمشێوەیە پەیوەندییەکی ئاڵۆز لە نێوان من و ئەودا دروست بوو. گەر ڕۆژێک نەمدیتبا، وەک ئەوە وابوو کە شتێکم بزر کردبێ. هەنێ رۆژ ئەوەندەم تەماشا ئەکرد، هەڵئەستاو پەنجەرەکەی دائەخست.

دوو هەفتە بوو کە هەموو ڕۆژێ یەکترمان ئەبینی، بەڵام نیگاکانی ئۆدێت سارد و بێ باکانە ئەینواند، بێ ئەوەی بزەیەک بکا یا هەتا ئاماژەیەک بکا بۆ ئەوەی هەستی خۆی بەرامبەر من نیشاندا، تەنانەت ڕووخساریشی جددی و بە پەرۆش بوو.

یەکەم جار کە ڕووبەڕووی بوومەوە، بەیانییەک بوو کە چووبوومە قاوەخانەکەی سەری کۆڵانەکەمان ناشتایی بخۆم. لەوێ کە هاتمە دەرەوە ئۆدێتم بینی جانتای کەمانەکەی لەدەس بوو و بەرەو لای میترۆوە ئەڕۆیشت. سڵاوم لێ کرد ئەویش بە بزەیەکەوە وەڵامی دامەوە، پاشان پێم وت: ڕووخسەتم بدە کە جانتاکەت بۆ هەڵگرم، ئەمما لە وەڵاما سەری لەقاندو وتی: ((سوپاس))، لەم وشەوە یەکترناسینی ئێمە دەسی پێکرد.

لەو ڕۆژە بە دواوە کاتێ پەنجەری ژوورەکانمان ئەکردەوە، لە دوورەوە بە دەست جوڵاندن و زانستی ئاماژە قسەمان لەگەڵ یەکتر ئەکرد. بەڵام هەمیشە وا کۆتایی ئەهات کە بچینە خوارەوە لە باغی لۆگزامبۆرگ دیدار کەین و پاشانیش بەرەو سینەما یان شانۆ یان قاوەخانە شۆڕببینەوە، یانیش بە شێوەیەکی تر چەند

دەمژمێرێک کات بەسەر بەرین. ئۆدێت لەماڵەو بە تەنیا بوو، چونکە زڕباوکی لەگەڵ دایکییا چووبوونە سەفەر، ئەویش بەهۆی کارەکەیەوە لە پاریس مابوویەوە.

ئەو زۆر کەمدوو بوو. بەڵام ئەخلاق و ئەتواری منالآنە بوو، سمرِ و کەللەڕەق بوو، هەنێ جاریش بە تەواوی تووڕەی ئەکردم. دوو مانگ ئەبوو کە هاوڕێ بووین، ڕۆژێک ڕێککەوتین کە شەو بچینە تەماشای جەژنی هەفتەبازاڕ. ئەو شەوە ئۆدێت جلێکی شینی هەڵاڵەی لەبەرکردبوو، بە زەوقتر لە هەمیشە ئەینواند. کە لە خواردنگە دەرچووین، بەدرێژایی ڕێیەکەی ناو میترۆ باسی ژیانی خۆی بۆ کردم. تا ئەوکاتەی لەبەردەم لۆناپارک لەمیترۆکە دابەزین.

خەڵکانێکی زۆر لەوێ بوون. ئەمبەروو ئەوبەری جادەکە بە یاری و سەرگەرمی چێنرابوو. هەنێک خەریکی نانەوەی هەڵاو بەزم بوون، نیشانەنانەوە، بەخت ئەزموونی، شیرینی فرۆشی، سێرک، ئەو سەیارە بچوکانەی بە کارەبا ئیشیان ئەکرد و بە دەوری شوێنێک ئەسوڕانەوە، ئەو باڵۆنانەی بە دەوری خۆیان ئەخولانەوە، چەرخوفەلەک و شانۆگەری جۆراوجۆری لێ بوو. قیژەی کچان، قسە، پێکەنین، گیزەگیزی ماتۆڕ، دەنگی مۆزیکە جیاوازەکان هەر هەمووی تێکەڵاوی یەکبوون.

ئێمە بڕیارماندا سواری واگۆنە زەردەکە بین، ئەویش چەرخوفەلەکێک بوو کە بە دەوری خۆیا ئەخولایەوە و لە کاتی خولانەوە ڕووپۆشێکی پارچەیی سەری دائەپۆشی و لە شێوەی کرمێکی سەوز ئەینواند.

کاتێ ویستمان سەرکەوین ئۆدێت پەنجەوانەکەی و جانتاکەی بە من دا، تا لە کاتی جوڵانەوە لەدەستی بەرنەبێتەوە. ئێمە بە سەخڵەتی بە تەنیشتی یەکەوە دانیشتین، واگۆن کەوتە کار و سەرپۆشە سەوزەکەش بە هێواشی بەرزبوویەوە و ئێمەشی بۆ ماوەی پێنج خولەک لەبەرچاوی تەماشاگەرەکان بزر کرد.

وەختێ ڕووپۆشی واگۆنەکە هاتە خوارەوە، هێشتا لێوەکانمان بەیەکەوە نووسا بوون، من ئۆدێتم ماچ ئەکرد ئەویش هیچ بەرگری نەئەکرد- پاشانیش دابەزین و لە ڕێگە بۆی باس کردم کە ئەمە سێیەم جارە دێتە چەژنی هەفتەبازار، چونکە دایکی ئەوەی لێ قەدەغە کردبوو. چووینە تەماشای چەند شوێنێکی تریش، لە دواییدا نیوە شەو بوو کە هیلاک و ماندوو گەڕاینەوە. بەڵام ئۆدێت دڵی لێرە دانەئەکەوت، بەدیار هەر بەزم و ڕەزمێکەوە ئەوەستا منیش ناچار بووم بوەستم. دوو سێ جار بە زۆر قۆڵیم ڕاکێشا، ئەویش بە نابەدڵی کەوتە دوام، تا ئەوەی بەدیار بەزمێکی ترەوە ڕاوەستا، کابرایەک بوو کە مووسی جۆڵێتی ئەفرۆشت، ڕیکلامی بۆ ئەکرد، باشەکانی ئەخستەڕوو خەڵکی بانگ ئەکرد بۆ کڕینی. ئەمجارەیان بە تەواوی تووڕە بووم، بە توندی قۆڵیم ڕاکێشاو وتم:

(ئەمەیان ئیتر خۆ ئیشی ژنان نییە)

بەڵام ئەو قۆڵی ڕاتەکاند و وتی:

(خۆم ئەزانم، ئەمەوێت تەماشا بکەم)

منیش بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، بەرەو میترۆ بەڕێ کەوتم. کاتێ گەیشتمەوە لای ماڵ، کۆڵانەکە تاریک بوو، پەنجەرەی ژوورەکەی ئۆدێت خامۆش

بوو. چوومە ژوورەکەمەوە گڵۆپەکەم داگیرساند، پەنجەرەکەم کردەوە، چونکە خەوم نەدەهات بۆ ماوەیەک کتێبم خوێندەوە. کاتژمێر یەکی شەو بوو، ڕۆیشتم پەنجەرەکە دابخەم و بخەوم. بینیم کە ئۆدێت لەبن پەنجەرەی ژوورەکەی لە تەنیشت دار چراکەی نێو کۆڵانەکە ڕاوەستاوە. سەیرم بەم کارەی ئەو هات، پەنجەرەکەم بە تووڕەیی داخست، ویستم خۆم بگۆڕم هاتەوە یادم کە جانتا زەنگیانە دروەکە و پەنجەوانەکەی وا لە گیرفانما، ئەشمزانی کە پارە و کلیلی دەرگا لە جانتاکەیایە، هەموویانم گرێداوەب ەیەکەوە و لە پەنجەرەکەوە فڕێمدایە خوارەوە.

سێ هەفتە تێپەڕی و بە درێژی ئەو ماوەیە من ئەوم پشتگوێ ئەخست. کاتێ پەنجەرەی ژوورەکەی ئەکرایەوە من پەنجەرەی ژوورەکەم دائەخست، وێڕای ئەوەش سەفەرێکی لەندەنم هاتەپێش. ڕۆژێ بەر لە چوونم بۆ ئینگلتەرا لەسەری کۆڵانەکە تووشی ئودێت بووم، جانتای کەمانەکەی بە دەستەوە بوو و بەرەو میترۆ ئەڕۆیشت. پاش سڵاو و ئەحواڵ پرسی، هەواڵی سەفەرەکەم پێی دا، سەبارەت بە کردەی ئەو شەوەم داوای لێبوردنم لێ کرد. ئۆدێت بە ڕووساردییەکەوە جانتا زەنگیانەدروەکەی کردەوە و ئاوێنەیەکی بچوکی دا بەدەسمەوە کە لە ناوەڕاستەوە شکا بوو.

وتی: (ئەو شەوەی کە جانتاکەمت لە پەنجەرەکەوە فڕێ دا وای لێهات. ئەزانی، ئەمە نەگبەتی بەدواوەیە.) لە وەڵامیا پێکەنیم و پێم وت کە (خورافات پەرەستی)، بەڵێنیشم پێ دا کە بەر لە سەفر بیبینم، بەڵام بەداخەوە پێم نەکرا.

نزیکەی مانگێک ئەبوو لە لەندەن بووم کاتێ ئەم نامەیەی ئۆدێتم پێگەیشت:

(پاریس ٢١سیپتامبەری١٩٣٠)

جەمشید گیان

(نازانی کە چەندە تەنیام، ئەم تەنیاییە زۆر ئازارم ئەدات، ئەمەوێت ئەم شەو لەگەڵ تۆیا هەندێ قسە بکەم. چونکە کاتێ کە نامە بۆ تۆ ئەنووسم وا هەست ئەکەم کە لەگەڵتا قسە ئەکەم. بمبورە ئەگەر لەم نامەیە ئەنووسم "تۆ". ئەگەر ئەتزانی ئازاری ڕۆحم چەندە زۆرە! ڕۆژەکان چەندە درێژن- ئەگەر ئەتزانی کە میلی دەمژمێرەکان چەند بە هێواشی و لەسەرخۆ ئەخوولێنەوە! نازانم چی بکەم. ئایا زەمەنیش لای تۆ ئەوەندە درێژە؟ لەوانەیە لەوێ هاوڕێیەکی کچت پەیا کردبێ، گەرچی من دڵنیام کە هەمیشە سەرقاڵی خوێندنەوەی، هەر وەکو چۆن لە پاریس وا بووی، لەو ژوورە ناچیزەیەی کە بەردەوام لەپێش چاومە. ئێستا خوێندکارێکی چینی بە کرێی گرتووە، بەڵام من پەردەی ئەستوورم بۆ پەنجەرەکەم کردووە تاکو دەرەوە نەبینم، چونکە ئەوەی کە خۆشم ئەویست ئێستا ئیتر لەوێ نییە، هەر وەکو چۆن وەرگێڕی ئەم هونراوەیە ئەڵێ: (ئەو باڵندەیەی کە بەرەو خاکێکی تر ڕۆیشت ئیتر ناگەڕێتەوە)

دوێنی لەگەڵ هێلنا لە باغی لۆگزامبۆرگ پیاسەمان ئەکرد، کە نزیکی ئەو ئەسکەملە بەردینەیە بووینەوە ئەو ڕۆژەم هاتەوە یاد کە لەسەر هەمان ئەسکەمل دانیشتبووین و تۆ باسی وڵاتەکەی خۆتت بۆ ئەکردم، ئەو هەموو بەڵێنانەت پێ دام و منیش باوەڕم بە هەموویان کرد. ئەمرۆش بوومە بە بنێشتە خۆشەی

سەر زمانی خەڵکی و گاڵتەجاڕی هاوڕێکانم! من هەمیشە بە یادی تۆوە واڵسی گرێزەری ئەژەنم، ئەو وێنەیەی لە ڤنسن گرتمان وا لەسەر مێزەکەمە، تەماشاکردنی وێنەکەت دڵگەرمیم پێ ئەبەخشێ. بە خۆم ئەڵێم: (نا، ئەم وێنەیە من فریو نادا!) مخابن! نازانم تۆ بڕوات بەو شتانە هەیە یان نا؟ بەڵام لەو شەوەوە کە ئاوێنەکەم شکاوە، هەر ئەو ئاوێنەیەی کە خۆت پێتدابووم، دڵم خەبەری دا کە پێشهاتێکی ناخۆش بەڕێوەیە. ئاخر ڕۆژ کە یەکترمان دی تۆ پێتوتم کە بۆ ئینگلتەرا ئەچی، دڵم پێی وتم کە زۆر دوور دەڕۆی و ئیتر قەت یەکتر نابینینەوە- لەوەی کە دەترسام بەسەرم هات. مادام بۆرلا پێی وتم: بۆ ئەوەندە خەفەتباری؟ ئەیوست لەگەڵ خۆیا بۆ بەرتانیم ببا، بەڵام من لەگەڵیا نەچووم، چونکە ئەمزانی بێزار تر ئەبم.

با ئیتر لێیگەڕێ- ئەوەی ڕۆیی ڕۆیی. ئەگەر نامەکەم توند بوو بزانە لە دڵتەنگیم بووە، بمبورە، ئەگەریش بوومە هۆی ئازاری تۆ، هیودارم کە لە بیرم کەی، نامەکانم بدڕێنەو لە ناویان بەرە، باشە ژیمی؟

(ئەگەر ئەتزانی لەم چرکەساتەیا چەنێ غەم و ئازارم زۆرە! لە هەموو شتێ بێزار بووم، لە کاری ڕۆژانەی خۆم وەڕسم، لەکاتێکا پێشتر وانەبووم. ئەزانی؟ من ئیتر ناتوانم لەوە زیاتر دەستەو ئەژنۆ بم، ئەگەرچی ئەبمە هۆی نیگەرانی زۆرێک، بەڵام غەمی ئەوان بە پشکێ غەمی من نابێ — هەر وەکو بڕیارم داوە ڕۆژی یەکشەممە پاریس بەجێئەهێڵم و سواری شەمەندەفەری دەمژمێر شەش و سی و پێنج خولەک ئەبم و بەرەو کاڵە بەڕێئەکەوم دوایین شار کە تۆ تێیا گوزەرتکردووە، ئەو کات ئاوی شینی دەریا ئەبینم، ئەم ئاوە هەموو بەدبەختییەکانم ئەشورێ و هەر چرکەیەکیشی ڕەنگی ئەگۆڕێ، بە ورتە ورتێکی غەمناک و تەلیسماوی لەسەر کەنارە لماوییەکەی خۆی ئەخواتەوە، کەف ئەکات لمەکان دەمەچێژی کەفەکان ئەکەن و قووتی ئەدەن، پاشانیش هەر ئەم شەپۆلانەی دەریا دوایین یادەوەرییەکانم لەگەڵ خۆیا ئەبات. هەر وەکو کەسێ کە مەرگ بزەیەکی بۆ بکا هەر بەم بزەیەش بەرەو لای خۆی ڕائەکێشێ و ئەیبا. لای خۆت ئەڵێی کە ئەو کاری وا ناکات، بەڵام ئەبینی کە من درۆ ناکەم.

لێرەوە تا ئەوێ چاوەکانت ماچ دەکەم.

ئۆدێت لاسۆر

لە وەڵامیا دوو نامەم بۆ نووسی، بەڵام یەکێکیان بێ وەڵام بوو و ئەوی تریش گەڕایەوە بۆ ناونیشانەکەی خۆم کە بە مۆرکراوی لەسەری نووسرابوو (بگەڕێتەوە بۆ بنێری نامە.)

ساڵی دواتــر کە گـەڕامـەوە پاریس زۆر بەپەلە خـۆم گەیاندە کۆڵانی سـان ژاک، ئـەو شوێنەی کە ماڵە کۆنەکەمی لێ بوو. لە ژوورە کۆنەکەی مـن خوێندکارێکی چینی ڤاڵسی گـرێـزەری بە فیکە لـێ ئــەدا، بــەڵام پــەنـجـەرەی ژوورەکـــەی ئۆدێت داخـرابـوو و لەسەر دەرگـاکـەش پارچە کاغەزێکیان هەڵواسیبوو کە لەسەری نووسرابوو :

(خانوو بۆ کرێ.)

# نرخی بیست کوژراو

نووسینی: گابریێل گارسیا مارکیز
و. لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵڵا

ڕۆژی دووشەممە ڕۆژێکی فێنک و بێباران بوو، (ئۆریلیۆ ئاسکۆفار) کە دانسازێکی باش نییە، وەک باڵندە زوو لەخەو هەستا و لەکاتژمێر شەشدا کلینیکەکەی کردەوە ... پاشان هەندێک ددانی دەستکردی لە دۆلابێکی شووشەوە هێنایە دەرەوە، کە هێشتا لەناو قاڵبی ددان دروستکردنەکەدا دانرابوون، هەندێک کەلوپەلی خستە سەر مێزەکە و بەپێی قەبارە ڕێکی خستن ... وەک ئەوەی بۆ نمایشکردن دانرابن. کراسێکی بێ یەخەی خەت خەتی لەبەردابوو، بە ئاورزۆنێکی ئاڵتونی لەلای ملیەوە داخرابوو، پانتۆڵێکی لەپێدابوو کە شەیالەی پێوەبوو ،باڵای ڕێک و جەستەی باریک بوو، سەرو سیمای زیاتر لەسەرو سیمای پیاوییێکی لاڵ دەچوو..

کاتێک لە ڕێکخستنی کەلوپەلی سەر مێزەکە بووەوە، بۆ ساف کردنی ددانە دەستکردەکان ئامێری کونکردنەکەی ڕاکێشایە نزیک کورسی ددانەکە و دانیشت ......

وادیار بوو بیر لەو کارە ناکاتەوە کە



مارکیز

ئەنجامی دەدات، بۆیە بەردەوام بوو لە کارکردندا، بەپێکانی کورەی ئامێری کونکردنەکەی پڕ دەکرد لەهەوا، هەرچەندە پێویستیشی پێی نەبوو.
کاتێک کاتژمێر بوو بە هەشت، کەمێک وەستا تا لەپەنجەرەکەوە سەیری ئاسمان بکات، دوو باڵندەی گۆشت خۆری لەسەر سەربانی ماڵەکەی بەرامبەر بینی کە خۆیان لەبەرخۆرەکەدا وشک دەکردەوە ... هەر کە دەستی بەکارکردن کردەوە واپێشبینی کرد پێش وەختی نانی نیوەڕۆ باران دابکاتەوە... تا کوڕەکەی کە تەمەنی یانزە ساڵە بە دەنگە تیژەکەی بانگی کردو لەخەیاڵ کرنەوەکەی خست، پرسیاری لێکرد و وتی:
کوێخا دەیەوێت بزانێت دەتوانیت ددانی بۆ هەڵبکێشیت؟
–پێی بڵێ من لێرە نیم
دەستیکردەوە بە ساف کردنی ددانێکی ئاڵتونی ... پاشان ددانەکەی گرت و لە سەر قەیدێک داینا، بە دوو چاوی نیوە داخراوەوە پشکنی ... لەو کاتەدا لە ژوورە بچووکەکەی چاوەڕوانیدا دەنگی کوڕەکەی بەرزبووەوە. کوێخا دەڵێت تۆ لەوێیت چونکە گوێی لە دەنگتەن:

پزیشکەکە لە پشکنینی ددانەکەی بەردەوام بوو ... وەڵامی نەدایەوە تەنها دوای ئەوکاتە نەبێت کە ددانەکەی خستە سەر مێزەکە لەتەنیشت ئەو ددانانەوە کە تەواوی کردبوون، وتی باشتر وایە کە گوێ بگرێت...
ئامێری کونکردنەکەی خستەوە کار ... پاشان چەند پارچەیەک لە (جسری ددان) ی لەو دۆڵابەوە دەرهێنا کە چەند شتێکی تێدابوو پێویست بوو تەواویان بکات، دەستیکرد بەزاخاوکردنی ئاڵتون ... بەڵام کوڕەکەی جارێکی دی بانگی کرد ... پزیشکەکە بێئەوەی ڕوخساری بگۆڕێت، وتی: پرسیارت لێکرد بزانیت چی دەوێت، کوڕەکە وتی:
کوێخا دەڵێت ئەگەر ددانەکەی بۆ هەڵنەکێشیت تەقەت لێدەکات...!
بێ هیچ پەلە کردنێک و بەجوڵەیەکی زۆر هێمنەوە وازی لە کونکردنەکە هێناو خستیە سەر کورسیەکە ، پاشان چەکمەجەی خوارەوەی مێزەکەی بەتەواوی کردەوە کە دەمانچەیەکی تێدابوو... بەکوڕەکەی وت: باشە – پێی بڵێ بابێتە ژوورەوەو بمکوژێت...
کورسیەکەی ڕاکێشایە بەردەمی دەرگاکە ، کوێخاکە لە ڕاڕەوەکەدا دەرکەوت، ڕوومەتی لای چەپی تەراش

کردبوو، بەڵام ڕوومەتەکەی تری ئاوسابوو ئازاری دەهات، پێنج ڕۆژبوو ڕیشی نەتاشیبوو، کوێخا لە چاوە لێڵەکەنییەوە دیاربوو کە شەوانێکی زۆری بەدەم ئازارەوە چەشتووە.
پزیشکەکە بەپەنجەکانی چەکمەجەکەی داخست و بە هێمنییەوە وتی: دانیشە...کوێخا وتی: بەیانیت باش...
پزیشکەکە بەنیوە سڵاو وەڵامی دایەوە.
لەکاتێکدا کەرەستەکانی ددان هەڵکێشان دەکوڵان، کوێخا پاڵی بە کورسییەکەوەداو هەستی بە باشبوون کرد... کلینیکەکە سادە بوو، کورسیەکی تەختەی کۆنی تێدابوو، ئامێری کونکردن ,دۆڵابێکی شووشە کە چەند کەمۆڵەیەکی گڵینەی تێدابوو.... پەنجەرەکە پەردەیەکی پێوە بوو بەرزیەکەی تاسەرشان دەبوو، کاتێک کوێخا هەستی کرد پزیشکەکە نزیک دەبێتەوە — پاژنەکانی لە زەویەکە توند کردو دەمی کردەوە ...
ئۆریلیۆ ئاسکۆفار سەری کوێخای بەلای ڕووناکیەکەدا بادا... پاش ئەوەی ددانە توشبووەکەی پشکنی؛ بە تۆزێک سڵەمینەوەوە دەمی کوێخای داخست ... وتی:
دەبێت ددانەکە بەبێ بەنج کردن هەڵبکێشین...
__بۆچی؟
.__لەبەرئەوەی دومەڵی کردووە
کوێخا ڕووبەڕوو تەماشای کرد، پاشان بەزەردەخەنەوە وتی: باشە...
بەڵام پزیشکەکە وەڵامی زەردەخەنەکەی نەدایەوە ... بەڵکو ئەو دەفـرەی هێنایەسەر مێزەکە کە کەرەستە پاکژکراوەکانی تێدا بوو، بە مقاشێکی سارد لە ئاوەکە دەریهێنان ...
بێ هیچ پەلەکردنێک هەموو ئەو کارانەی کرد... پاشان بەنوکی پێڵاوەکەی پاڵی بەو دەفرەوە نا کە تفی تێدا ڕۆ دەکرا، چوو دەستی لە حەوزەکە شۆرد، هەموو ئەم شتانەی کرد بێ ئەوەی سەیری کوێخا بکات ... بەڵام کوێخا بۆ ساتێک چییە چاوەکانی لێ نەئەتروکاند.
ددانە ڕزیوەکە (دانی عاقڵی خوارەوەبوو) ...
پزیشکەکە قاچی بڵاوکردەوەو کاکیلەکەی بە دەمی گازێک گرت ... کوێخا بەتوندی خۆی نووساند بە هەردوو قۆڵی کورسیەکەوە ، بەهەموو هێزی پێکانی توند کرد، هەموو گیانی کەوتە سەر چینێک ئاوی سارد، بەڵام هیچ دەنگێکی لێوە نەهات پزیشکەکەش تەنها مەچەکی دەجوڵا ... بێ ڕق وکینە بەنەرم و نیانیەکی تاڵەوە بە کوێخای وت:
__ئێستا دەبێت باجی هەموو ئەو بیست کەسە کوژراوەمان بدەیتێ...!
کوێخا هەستی بەشکاندنێک کرد وەک شکانی ئێسقانی کاکیلەی وابوو، چاوەکانی پڕبوون لەفرمێسک .... هەناسەی نەدا تا دانەکەی هاتە دەرەوە، پاشان لە میانەی فرمێسکەکانەوە خرێکەی بینی ... زۆر سەیر دیاربوو سەبارەت بەو ئەشکەنجەیەی چەشتبووی، تاڕادەیەک نەیتوانی لەو ئەشکەنجەیە تێبگات کە بەدرێژایی پێنج ڕۆژی ڕابردوو چەشتبووی.
کاتێک بەسەر ئەو دەفرەدا دانەویەوە کە تفی تێدا ڕۆدەکرێت ئارەقی کردبوەوە و هەناسە بڕکێی پێکەوتبوو، قۆپچەکانی جلە فەرمیەکەی کردەوە ، دەستی بۆ گیرفانی پانتۆڵەکەی درێژ کرد بۆ دەستەسڕەکەی دەگەڕا...
پزیشکەکە پارچە دەسڕێکی خاوێنی دایە و وتی:-
فرمێسکەکانت بسڕە...!__
کوێخا فرمێسکەکانی سڕی ... دەلەرزی، لەکاتێکدا پزیشکەکە دەستەکانی دەشت، ئەو سەیری سەقفە داخـوراوەکـەی دەکـرد کە جاڵجاڵۆکە و مێرووە مردووەکانی لێوە شۆڕببونەوە.
پزیشکەکە دەستەکانی سڕی و بە کوێخای وت:
بڕۆرەوە بۆماڵەوەو غەرغەرە بە خوێیاو بکە.
کوێخا هەستایە سەرپێ و سڵاوێکی ساردوسڕی عەسکەریانەی بۆ کرد،پاشان بە هەنگاوی فراوانەوە بەرەو دەرگاکە چوو بێ ئەوەی قۆپچەی چاکەتەکی دابخا. ......
لەلای دەرگاکەوە وتی: پسولەی پارەکە بنێرە ...
__بۆ تۆ، یان بۆ نوسینگەی حکومەت؟
کوێخا سەیری نەکرد، لەکاتێکدا کە دەرگاکەی دادەخست وتی: هەردووکیان یەکێکن و نەفرەت لە هەردووکیان.

**وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: عەبدولڕەحمان حەسانی**
**سەرچاوە: ئینتەرنێت**

# میلان کوندێرا
# چوونە ناو ڕۆحی شتەکانەوە

نووسینی: میلان کوندێرا
و. لە ئەڵمانییەوە: کەریم پەڕەنگ

**چوونە ناو ڕۆحی شتەکانەوە**

سان بۆف لە ڕەخنەکەیدا لە بارەی خانمی بۆڤارییەوە دەنووسێ: «ئەو سەرکۆنەیەی، کە بۆ کتێبەکەی دەکەم ئەوەیە، کە شتی باشی کەم تێدایە.» دەپرسێ، بۆچی لەم ڕۆمانەدا «تاقە کەسێک نییە، ڕەوشتی بە جۆرێک بێ، بتوانێ بە نیگایەکی باش خوێنەر دڵنەوایی بکا، بیبووژێنێتەوە»؟ ئەمجا ڕێ بە نووسەرە لاوەکە پیشان دەدا: «من لە گوند، لە ناو جەرگەی فەڕەنسادا هێشتا کچێکی گەنج بە ژیرییەکی سەردەستەوە دەناسم، خوێنگەرم، وەڕس: مێردارە، بەڵام دایک نییە، چی کرد، لەبەرئەوەی منداڵی نەبوو گەورەی بکا، خۆشی بوێ، بۆ ئەوەی عەقڵ و هەستە زۆرەکەی پێ پڕ بکاتەوە؟ ... ژنەکە بووە خێرەومەندێکی بەکار ... زۆرجار منداڵە

**هەروەك وترا، نیهێلیزم بە پوچگەرایی ناسراوە کەواتە سەیر نییە کاتێ هیچ نووسەر یاخود بیرمەند و فەیلەسوفێك ڕاستەوخۆ ئامادە نەبێ خۆی بە پوچگەرا ناوزەد بکات، لەم ڕووەوە بنیاتنەران و پەیڕەوانی ئەم تێزە خۆیان وەك تیۆریزانانی نیهیلیزم ناناسێنن، بەڵکو بە بڕوای شرۆڤەکاران لە ناواخنی بیروباوەڕەکانیاندا، وەك ئاراستەکەر یاخود بە پشتیوانی نیهێلیزم ناوزەدیان دەکەن**



میلان کوندێرا

ماڵ لە یەکتر دوورەکان فێری خوێندنەوە و ڕەوشتی باش دەکا ... ئەو جۆرە ڕۆحانە لە شارە بچکۆلە و گوندەکان هەن: بۆچی ئەوانیش پیشان نادرێن؟ ئەمە دڵخۆشکەرە، ئەمە دڵنەواییکەرە، وێنای مرۆڤ لە ڕێیەوە تەواوتر دەبێ.» (جەغدکردن لە وشە سەرەکییەکان هی منن.)

بۆ من فریودەرە، بەم وانەیەی ڕەوشتەوە تیز بکەم، کە بێ بەرگری وریاکردنەوەکانی پەروەردەکارانەی «ڕیالیزمی سۆسیالیستی»ی زووم بیر دەخاتەوە. بەڵام، با بیرەوری ئافەرۆز بکەین، ئایا ئەوەندە نەشیاوە، کاتێ بەناوبانگترین ڕەخنەگری فەڕەنسی ئەدەبی کاتی خۆی نووسەرێکی لاو وریا دەکاتەوە، خوێنەرەکانی، وەکو ئێمە هەمووومان، شایستەی کەمێک هەواداریی و هاندان نین، لە ڕێی «نیگایەکی باشەوە» «بەرز بکاتەوە» و «دڵنەوایی بکا»؟ بەڵام ژۆرژ ساند نزیکەی بیست ساڵ دواتر لە نامەیەکیدا نزیکەی هەمان شت دەڵێ: بۆچی ئەو «هەستە» دەشارێتەوە، کە بۆ کەسایەتییەکانی هەیەتی؟ بۆچی لە ڕۆمانەکانیدا «بنەما کەسییەکانی» پیشان نادا؟ بۆچی «بێنەوایی» بە خوێنەران دەگەیەنێ، بە پێچەوانەوە ئەو خۆی، ساند، پێی خۆشترە خوێنەران «دڵنەوایی» بکا؟ بە دڵۆڤانی سەرزەنشتی دەکا: «هونەر تەنیا ڕەخنە و ساتیر نییە.»

فلاوبێر وەڵامی دەداتەوە، کە هەرگیز ڕەخنە یان ساتیری لە زەیندا نەبووە. ئەو ڕۆمانەکانی نانووسێ، بۆ ئەوەی حوکمەکانی بە خوێنەر ڕابگەیەنێ. ئەو شتێکی دیکەی لە دڵدایە: «من هەمیشە هەوڵم دا، بچمە ناو ڕۆحی شتەکانەوە ...» وەڵامەکەی بە ئاشکرا دەیسەلمێنێ: بابەتی ڕاستەقینەی ئەم ناتەباییە کاراکتەری فلاوبێر نییە (ئایا باشە یان خراپ، دڵساردە یان هاوسۆز؟)، بەڵکو ئەو پرسیارەیە، ڕۆمان چییە.

تابلۆکێشان و مۆسیقا سەدان ساڵ لە خزمەتی کڵێسادا بوون، کە بە هیچ کلۆجێک جوانی خۆی لە دەست نەدا. بەڵام ڕۆمان بخرێتە خزمەتی دەسەڵاتێکەوە، هەرچی چەندە بەشکۆ بێ، بۆ ڕۆماننووسێکی ڕاستەقینە مەحاڵە. چ بێماناییەکە، یەکێک بیەوێ بە ڕۆمانێک شکۆ بە دەوڵەتێک یان سوپایەک بدات! بەڵام ڤلادیمێر هۆلان لە سەرسامیدا بۆ ئەوانەی، کە لە ساڵی ١٩٤٥دا نیشتمانەکەیان ئازاد کرد، شیعرگەلی جوان، لە بیرنەکراوی بۆ سەربازەکانی سوپای سوور نووسی. دەتوانم وێنای تابلۆیەکی نایابی فرانس هالس بکەم، کە «ژنە خێرەومەندێکی چالاک» لە لادێدا پیشان دەدا، بە منداڵ دەورەدراو، کە «ڕەوشتی جوانیان» فێر دەکا، بەڵام ڕۆماننووسێکی زۆر مایەی پێکەنین دەیتوانی ئەم خانمە بکاتە ژنە پاڵەوانێک، بۆ ئەوەی لە ڕێی میناکییەوە ورەی خوێنەر «بەرز بکاتەوە». مرۆڤ نابێ هەرگیز لە بیری بکا: هەموو هونەرەکان هاوشێوە نین؛ هەریەکەیان لە دەرگایەکی دیکەوە دێتە ناو جیهانەوە. لە ناو ئەم دەرگایانەدا یەکێکیان تەنیا بۆ ڕۆمان تەرخانکراوە.

من وتم: تەنیا، چونکە بۆ من ڕۆمان «ژانرێکی ئەدەبی» نییە، تەنیا لقێک لە ناو لقە زۆرەکانی تاقە درەختێکدا نییە، مرۆڤ ناتوانێ لە ڕۆمان تێبگا، ئەگەر مشتومڕ لە بارەی ئەفراندنی ڕۆمان خۆیەوە بکا، ئەگەر مرۆڤ هونەری ژانری خۆی، هونەرێکی سەربەخۆ نەبینێ. ڕۆمان سەرهەڵدانی خۆی هەیە (لە کاتێکدا، کە تەنیا هی خۆیەتی)؛ مێژووی لە هاوئاهەنگی قۆناغی خانەبەندکراوی تایبەت بە خۆی هەیە (کە پەرەسەندنی ئەدەبی درامی ماوەی گرنگی گۆڕانی لە شیعرەوە بۆ پەخشان لەگەڵ پەرەسەندنی ڕۆماندا بە هیچ جۆرێک هاوتا نییە؛ مێژووی ئەم دوو هونەرە هاوکات ڕێناکا)، ئاکاری خۆی هەیە (هێرمان برۆخ ئەوەی گوتووە: تاقە ئاکاری ڕۆمان مەعریفەیە؛ ئەو ڕۆمانەی بەشێکی هەتا ئێستا نەناسراو نەدۆزێتەوە نائاکارییە؛ «چوونە ناو ڕۆحی شتەکانەوە» و میناکێکی باش بداتە دەستەوە لە ئەنجامدا دوو مەبەستی جیاواز و ناتەبان)؛ ڕۆمان پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ «من»ی نووسەردا هەیە (بۆ ئەوەی دەنگی پەنهانی، زۆر نزم لە «ڕۆحی شتەکاندا ببیسترێ، دەبێ ڕۆماننووس، بە پێچەوانەی شاعیر و ئاوازدانەرەوە تێبگا، هاوارەکانی ڕۆحی خۆی بێدەنگ بکا)؛ کاتی سەرهەڵدانی (نووسینی ڕۆمانێک قۆناغێکی تەواو لە ژیانی نووسەر داگیر دەکا، کە لە کۆتایی کارەکەدا هەمان ئەو کەسە نییە وەکو لە سەرەتادا)؛ لە سەرووی زمانی نەتەوەییەوە خۆی بۆ جیهان دەکاتەوە (لەوەتەی ئەورووپا سەرەوای خستۆتە سەر شیعر، ناتوانرێ جوانی شیعر بۆ زمانێکی دیکە بگوازرێتەوە؛ وەرگێڕانی دەستپاکی کارێکی شیعری سەختە، بەڵام شیاوە؛ لە جیهانی ڕۆماندا سنووری دەوڵەت نییە؛ ئەو ڕۆماننووسە گەورانەی، کە بۆ ڕابلییە گەڕاونەتەوە، نزیکەی هەموویان بە وەرگێڕدراوی خوێندوویانەتەوە).

## بە هەڵەداچوونی بنەبڕنەکراو

ڕاستەوخۆ دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەڵقەیەکی ڕۆشنبیری نایابی فەڕەنسا وشەی «بوونگەرایی»یان بەناوبانگ کرد، بەوەی نەک تەنیا ناویان لە ئاڕاستەیەکی نوێی فەلەسەفی، بەڵکو هەروەها لە ئاڕاستەی شانۆ و ڕۆمانیش نا. وەکو تیۆرکاری شانۆنامەکانی سارتەر، خۆی بە هەستە نایابەکەیەوە بۆ داڕشتن «شانۆی کاراکتەر» لە بەرامبەر «شانۆی بارودۆخ»دا دادەنێ. لە دەقێکیدا لە ساڵی ١٩٤٦دا دەنووسێ، ئامانجمان ئەوەیە، «لە هەموو ئەو بارودۆخانە بکۆڵینەوە، کە لە ئەزموونی مرۆڤدا

زۆر جار دێنە ئاراوە ... و ڕەهەندی جەوهەری مرۆڤبوونیش ڕوون بکرێتەوە ...»

کێ جارێک لە جاران لە خۆی نەپرسیوە: ئەگەر من لە جێیەکی دیکە لە دایکببوومایە، لە وڵاتێکی دیکەدا، لە کاتێکی دیکەدا، ژیانم چۆن دەبوو؟ لەم پرسیارەدا یەکێک لە بەربڵاوترین وەهمەکانی مرۆڤ گوزارشتی لێدەکرێ، وەهمێک، بارودۆخی ژیانمان تەنیا وەکو پشتی شانۆیەک، وەکو هەلومەرجێکی ڕێکەوت، لە گۆڕینهاتوو سەیر بکرێ، کە بە ناو «ئێگۆ»ی ناوابەستە و نەگۆڕماندا ڕێدەکا. ئاخ، ئەوەندە خۆشە، ژیانەکانی دیکە بۆ خۆت بنەخشێنی، دەرزەنێک ژیانی شیاوی دیکە! بەڵام خەون بەسە! ئێمە هەمووممان داماوانە بە بەرواری لەدایکبوون و شوێنی لەدایکبوونمانەوە بەستراوین. «ئێگۆ»ی ئێمە لە دەرەوەی بارودۆخی ژیانی تۆکمە، دانسقەمانەوە پەیپێنەبراوە، تەنیا لە ناو ئەم بارودۆخە و لە ڕێی ئەم بارودۆخەوە پەیپێبراوە. ئەگەر بەیانییەک دوو کەسی نەناسراو یوسف (ک.)یان نەبردایە و پێیان ڕانەگەیاندبایە، شکاتی لێکراوە، ئەو بە تەواوی یەکێکی دیکە دەبوو وەکو لەو کەسەی ئێمە دەیناسین.

خوێنگەرمی کەسایەتی سارتەر خۆی، شوێنگەی دووفاقەی وەکو فەیلەسووف و نووسەر، ئەو وێنایە بە هێز دەکا، گوایە ئاڕاستەی بوونگەرایی شانۆ و ڕۆمان لە سەدەی بیستەمدا بۆ کاریگەری فەلسەفەیەک دەگەڕێتەوە. دیسان ئەو بەهەڵەداچوونە بنەبڕنەکراوەمان هەیە. هەڵەی هەموو بەهەڵەداچوونەکان، واتە وا بیر بکرێتەوە، پەیوەندی نێوان فەلسەفە و ئەدەب تەنیا بە یەک ئاڕاستەدا دەڕوا، «پسپۆڕەکانی گێڕانەوە» دەیانتوانی، ئەوەندەی بیرۆکەیان هەبوایە، تەنیا لە «پسپۆڕەکانی بیرکردنەوە»ی قەرز بکەن. ئەو وەرچەرخانەی کە هونەری ڕۆمان نادیار لە ئاڕاستەی سایکۆلۆژییەوە (تۆژینەوەی کاراکتەرەکان) بەرەو ڕاڤەی بوونگەرایی (ڕاڤەی «ئەو بارودۆخانەی، کە ڕەهەندە جەوهەرییەکانی مرۆڤبوون ڕووندەکەنەوە») برد، بەڵام بیست یان سی ساڵ پێش ئەوەی مۆدەی بوونگەریی لە ئەورووپادا بڵاوببێتەوە؛ بە فەلسەفەش نەوروژابوو، بەڵکو بە لۆژیکی گەشەکردنی ڕۆمان.

## بارودۆخگەل

سێ ڕۆمانەکەی فرانتس کافکا سێ شێوەی جیاوازی هەمان بارودۆخن: مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤێکی دیکەدا ناکەوێتە کێشەوە، بەڵکو لەگەڵ جیهانێکی بێهاوتا بەفەرمانبەریکراو. لە یەکەم ڕۆماندا (١٩١٢ سەری هەڵداوە) مرۆڤەکە ناوی کارل ڕۆسمانە و جیهانەکە ناوی ئەمەریکایە. لە دووەمدا (١٩١٧) مرۆڤەکە ناوی یوسف (ک.)یە و دنیا دادگایەکی گەورەیە، کە شکاتی لێدەکا. لە سێیەمدا (١٩٢٢) مرۆڤەکە ناوی (ک.)یە و دنیا گوندێکە لە ژێر سەروەری کۆشکدا.

کە کافکا پشتی لە سایکۆلۆژیا کردووە، بۆ ئەوەی خۆی لە تۆژینەوەی بارودۆخێکدا چڕ بکاتەوە، بە هیچ جۆرێک ئەوە ناگەیەنێ، کە فیگۆرەکان لە لایەنی سایکۆلۆژییەوە قەناعەتپێکەر نین، بەڵکو کە گێرمەوکێشەی سایکۆلۆژی کەوتووەتە پشتەوە: ئایا (ک.) منداڵییەکی بەختەوەر یان غەمگینی هەبووە، ئایا کوڕی شیرینی دایکی بووە یان لە هەتیوخانەیەکدا گەورە بووە، ئایا ئەڤینێکی گەورەی لە پشتەوە بووە یان نەو، هەموو ئەم شتانە لە چارەنووسی یان لە ڕەفتاری هیچ ناگۆڕن. لە ڕێی پێچەوانەکردنی ئەم گیروگرفتەوە، لە ڕێی ئەم شێوەیەی دیکەوە، پرسیار لە ژیانی مرۆڤ بکرێ، ئەم تێگەیشتنەی دیکە لە

شوناسنامەی تاکێک، کافکا تەنیا لەگەڵ ئەدەبی پێشووتردا جودا ناکاتەوە، بەڵکو لە پرۆست و جۆیسی گەورەی هاوچەرخیشی جودای دەکاتەوە.
«ڕۆمانی مەعریفی لە جیاتی ڕۆمانی سایکۆلۆژی»، برۆخ لە نامەیەکیدا، کە تیایدا شیعرییەتی خەوڕۆکان (لە ساڵانی ١٩٢٩ و ١٩٣٢دا سەریهەڵداوە) ڕووندەکاتەوە؛ هەموو ڕۆمانێکی ئەم سێیەیە، ١٨٨٨ — پاسێنۆڤ یان ڕۆمانتیک، ١٩٠٣ — (ئێش) یان پاشاگەردانی، ١٩١٨ — هوگیەناو یان بابەتگەرایی (ژمارەی ساڵەکان سەر بە ناونیشانەکەی)، پازدە ساڵ پاش ئەوەی پێشوو ڕوو دەدا، لە دەوروبەرێکی دیکەدا، لەگەڵ بەشدارێکی دیکەدا. ئەوەی ئەو سێ ڕۆمانە (کە هەرگیز بە تەنیا ئامادە ناکرێن) دەکاتە یەک کار، یەک بارودۆخ و هەمان بارودۆخە، بارودۆخی سەرووی تاکی پرۆسێسی مێژووییە، کە برۆخ بە «ڕووخانی بەهاکان» ناوزەدی دەکا، هەموو تاکێکی بەشدار هەڵوێستی خۆی بۆ دەدۆزێتەوە: یەکەمجار پاسێنۆڤ، بۆ ئەو بەهایانە دڵسۆز دەمێنێتەوە، کە خەریکن بە بەرچاویەوە وندەبن؛ ئەمجا دواییتر (ئێش)، کە پێویستیی بەهاکان دایگرتووە، بەڵام ناتوانێ ئیدی بیانناسێتەوە؛ لە دواییدا هوگیەناو، کە بە باشترین شێوە لەگەڵ جیهانی لە بەها خاڵیدا هەڵدەکا.

بۆ من سەختە، یارۆسلاڤ هاشەک لەگەڵ ئەم ڕۆماننووسانەدا خانەبەند بکەم، کە من لە «مێژووی شەخسی ڕۆمانمدا» بە بنتیاتنەری مۆدێرنیزمی لە هونەری ڕۆماندا دەزانم؛ چونکە مۆدێرنبوون یان نا، ئەمە هیچ بە لای هاشەکەوە گرنگ نییە؛ ئەو نووسەری گەلەکی بوو لە مانایەکی ئیدی بەکارنەهاتوودا، گەڕیدەیەکی نووسەر، سەرچڵێکی نووسەر، کە ڕقی لە دەوروبەری ئەدەبی دەبووەوە و ڕقی لەوە دەبووەوە، داڕێژەری تاقە ڕۆمانێک بێت، کە لە سەرجەمی جیهاندا خوێنەرێکی زۆری دۆزییەوە. دوای ئەم وشانە بۆ من ئەوەی شایانی سەرنج بێ ئەوەیە، کە ڕۆمانەکەی (لە نێوان ١٩٢٠ و ١٩٢٣) سەریهەڵداوە، سەرکێشییەکانی سەربازی سەلار شڤایک لە کاتی شەڕی جیهانیدا هەمان ئاڕاستەی ئیستاتیکی تیا دەردەکەوێ وەکو ڕۆمانەکانی کافکا (هەردوو نووسەر لە هەمان ئەو ساڵانەدا لە هەمان شاردا ژیان) یان ڕۆمانەکانی برۆخ.
شڤایک کاتێ لە لایەن لێژنەی پشکنینی سەربازییەوە بانگ دەکرێ، لە عەرەبانەیەکی کەمئەندامانداندا بە ناو شەقامەکانی پراگدا پاڵی پێوە دەنرێ و لەبەرچاوی تەوساوی پراگیکییەکانەوە هەردوو دارشەقەکەی شەڕخوازانە ڕادەوەشێنێ و هاوار دەکا: «لێخوڕە بۆ بەلگراد!» ئەمە لەو ڕۆژەدایە، کە ئیمپراتۆریەتی قەیسەری نەمسا-هەنگاریا جاڕی جەنگ دژی سێربیا دەدا و ئەمە بووە هۆی بەرپابوونی جەنگی گەورەی ١٩١٤ (کە بۆ برۆخ ڕووخانی بەهاکان و کاتی کۆتایی سێینەکەی دەگەیەنێ.) بۆ ئەوەی بە بێ زیان لەم جیهانەدا بژی، شڤایک زیادەڕۆیی بە هەوادارییەوە بۆ سوپا، نیشتیمان و قەیسەرەوە بە ڕادەیەک دەکا، کە کەس بە دڵنیاییەوە ناتوانێ بڵێ، ئایا ئەو گەمژەیە یان قۆشمەیە. هاشەکیش پێمان ناڵێ؛ ئێمە هەرگیز نازانین، شڤایک بیر لە چی دەکاتەوە، کاتێ گەمژەیی خۆگونجاندنی نمایش دەکا و هەر لەبەرئەوەی ئێمە نایزانین، کونجکۆڵمان دەکا. لە سەر تابلۆی پڕوپاگەندەی میوانخانەکانی پراگ هەمیشە بچووک و قەڵەو ئەو دەبینرێ، بەڵام وێنەکێشی بەناوبانگی کتێبەکە بوو، کە ئەوی بەوجۆرە وێنا کرد، لە کاتێکدا هاشەک هەرگیز تاقە وشەیەکی لە بارەی دیمەنی شڤایکەوە نەوتووە. ئێمە نازانین، ئەو سەر بە چ

ماڵباتێکە. هەرگیز لەگەڵ ژنێکدا نایبینین. بە بێ ژن دەردەبا؟ بە نهێنی دەیهێڵێتەوە؟ وەڵام نییە. بەڵام ئەوەی هێشتا گرنگترە: پرسیار نییە! دەمەوێ بڵێم: ئێمە هیچ بە لامانەوە گرنگ نییە، ئایا شڤایک حەزی لە ژنانە یان نا!

ئەمە وەرچەرخانێکی نابەرچاو لە هەمان کاتدا ڕادیکاڵی ئیستاتیکییە: بۆ ئەوەی فیگۆرێک «زیندوو»، «بەهێز»، هونەرمەندانە «لەواو» دەرکەوێ، پێویست ناکا، هەموو زانیارییە شیاوەکان لە بارەیەوە بە دەستەوە بدرێ؛ پێویست ناکا ئەو هەستە بێدار بکرێتەوە، ئەو وەکو ئێوە و من ڕاستییە؛ بۆ ئەوەی بەهێز بێ و لە بیر نەچێتەوە، ئەوە بەسە، کە ئەو پانتاییەی لە لایەن ڕۆماننووسەوە خوڵقێنراوە بە تەواوی پڕ بکاتەوە. (لەم کەشە ئیستاتیکییە نوێیەدا تەنانەت ڕۆماننووس خۆی لەوەدا بە دڵە، جاروبار ئەوە بیر بخاتەوە، کە هیچ شتێک لەوانەی دەیگێڕێتەوە، ڕاست نین، کە هەموو شتێک دۆزینەوەی خۆیەتی — وەکو فیلێنی، لە کۆتایی پاپۆڕی خەونەکاندا هەموو پشتی شانۆ و هەموو میکانیزمەکانی شانۆی خەیاڵمان پیشان دەدا.)

## ئەو شتەی تەنیا ڕۆمان دەتوانێ بیڵێ

پێشهاتی پیاوە بێ خەسڵەتەکە لە ڤێنا ڕوو دەدا، بەڵام ئەم ناوە لە ڕۆمانەکەدا، ئەگەر باش لە بیرم مابێ، تەنیا دوو یان سێ جار دەوترێ. هەروەکو جاری جاران لە لای فیدلینگ وەسفی لەندەن، تەنیا دوو جار ناوی ڤێنا دەهێنرێ. هێشتا کەمتریش وەسف دەکرێ. ئەی ئەو شارە پەنهانە کامەیە، کە تیایدا یەکتربینینی گرنگی ئولریخ لەگەڵ ئاگاتەی خوشکیدا ڕوو دەدا؟ ئێوە ناتوانن بیزانن؛ شارەکە بە چیکی ناوی برنۆیە، بە ئەڵمانی بروین؛ من بە چەند وردەکارییەک بە ئاسانی ناسیمەوە، چونکە من لەوێ لەدایکبووم. هەر لەگەڵ ئەمەم گوت، سەرکۆنەی خۆمم کرد، بەمە مەبەستی موزیلم پێشێل کردووە. مەبەست؟ چ مەبەستێک؟ هیچی هەبوو بیشارێتەوە؟ نەخێر، نەخێر؛ مەبەستەکەی ئیستاتیکی ڕووت بوو: خۆی تەنیا بە شتی جەوهەرییەوە خەریک بکا؛ ئاگایی خوێنەر بە چاودێری ناپێویستی جوگرافییەوە خەریک نەکات.

مانای مۆدێرنیزم زۆرجار لە هەوڵی هەر هونەرە و بۆ خۆی دەبینرێ، خۆی لە تایبەتمەندی خۆیدا، لە جەوهەری خۆی ئەوەندەی دەکرێ نزیک بکاتەوە. چۆن شیعر هەموو شتێکی کە ڕەوانبێژی، فێرکاری، جوانکەر بوو فڕێدا، بۆ ئەوەی کانی ڕوونی فەنتازیای شیعری هەڵقوڵێ. هونەری شێوەکاری وەزیفەی دۆکۆمێنتاری، لاساییکەرەوەی خۆی ئافەرۆز کرد، هەموو ئەو شتانە، کە لە ڕێی هۆکاری دیکەوە توانرا گوزارشتیان لێ بکرێ (بۆ نموونە وێنە). ئەی ڕۆمان؟ ئەویش مل نادا ببێتە وێنەی قۆناغێکی مێژوویی، وەسفی کۆمەڵگەیەک، بۆ بەرگری لە ئایدۆلۆژیایەک لە ئارادا بێ و خۆی دەخاتە خزمەتی ئەو شتەوە، «کە تەنیا ڕۆمان دەتوانێ بیڵێ».

من ڕۆمانەکەی کێنزابورۆ ئۆ، مێگەلی باڕەبارکەر، کە ساڵی ١٩٥٨ نووسراوە، بیر دەکەوێتەوە: دەستەیەک سەربازی سەرخۆشی سوپایەکی بیانی ئێوارەیەک سواری پاسێک دەبێ کە پڕە لە ژاپۆنی. دەست بەوە دەکەن، نەفەرێک، خوێندکارێک، ئازار بدەن. ناچاری دەکەن پانتۆڵەکەی دابکەنێ و پاشەڵی پیشان بدا. خوێندکارەکە لە دەوروبەری گوێی لە پێکەنینی چەپەرکراو دەبێ. بەڵام سەربازەکان بەم تەنیا قوربانییە دڵیان ئاو ناخواتەوە و نیوەی نەفەرەکان

ناچار دەکــەن، بە هەمان شێوە پانتۆڵەکانیان دابکەنن. پاسەکە دەوەستێ و سەربازەکان دادەبەزن و لێقەوماوەکان پانتۆڵەکانیان لە پێ دەکەنەوە. ئــەوانــی دیکە لــە نـاکـارایـیـان بـێـدار دەبـنــەوە و سووکایەتیپێکراوەکان ناچار دەکەن، بچن بۆ پۆلیس و ڕەفتاری سەربازەکان ڕابگەیەنن. یەکێکیان، مامۆستایەک، دوای خوێندکارەکە دەکەوێ: لەگەڵی دادەبەزێ، هەتا خانووەکەی لەگەڵی دەڕوا، دەیەوێ ناوی بزانێ، بۆ ئەوەی سووکایەتیپێکردنەکەی بە خەڵکی ڕابگەیەنێ و شکات لە بێگانەکان بکا. هەموو شتێک بە تەقینەوەی ڕقێک لە نێویاندا کۆتایی دێت. چیرۆکێکی نایابی ترسنۆکی، شــەرم، هەڵەشەیی سادیستی، کە جلی خۆشەویستی بۆ دادپــەروەری لە بەر دەکا ... بەڵام من تەنیا باسی ئەم نۆڤێلە دەکـەم، بۆ ئەوەی بپرسم: ئەم سەربازە بێگانانە کێن؟ بێگومان ئەمەریکی، کە دوای جەنگ ژاپۆنیان داگیر کرد. ئەگەر نووسەر بە ناو باسی نەفەرە «ژاپۆنییەکان» دەکـا، بۆچی ناوی ڕەگەزنامەی سەربازەکان ناهێنێ؟ ئایا ئەمە سانسۆری سیاسییە؟ کاریگەری شێوازە؟ نەخێر. وێنای ئەوە بکەن، لە سەرجەمی نۆڤێلەکەدا نەفەری ژاپۆنی ڕووبەڕووی سەربازی ئەمەریکی دەبـنــەوە! لە ژێر قورسایی تەنیا ئەم وشە، بە ئاشکرا گۆ کـراوەدا نۆڤێلەکە دەگۆڕێتە دەقێکی سیاسی، شکاتکردن لە داگیرکار. دەستبەرداربوونی ئەم ئاوەڵناوە بەسە، بۆ ئەوەی ڕەهەندی سیاسی لە نیوەتاریکیدا ونبێ و تیشک دەخرێتە سەر گرنگترین گرێ، کە ڕۆماننووس بە لایەوە گرنگە، گرێ بوونگەراییەکە.

مێژوو بە جوڵانەوەکانییەوە، بە جەنگەکانییەوە، بە شۆڕش و دژە شۆڕشەکانییەوە، بە سوکایەتیپێکردنە نەتەوەییەکانییەوە خۆیان لە خۆیاندا بۆ ڕۆماننووس، وەکو بابەتێکی وەسفکەر، ناوزڕێنەر، ئاماژە بۆ کراو گرنگ نین: ڕۆماننووس خزمەتکاری مێژوونووس نییە؛ مێژووی بە لاوە گرنگە، لە بەر ئەوەی وەکو پرۆجەکتۆرێکە بە دەوری بوونی مرۆڤدا دەسووڕێتەوە، کە تیشکەکەی دەخاتە سەر ئەو، تیشک دەخاتە سەر ئەگەرە چاوەڕواننەکراوەکانی، لە کاتی ئاشتیدا، کە مێژوو وەستاوە، بە واقیع ناکرێن، نادیار و نەناسراو دەمێننەوە.

## ڕۆمانە بیرکەرەوەکان

ئــەو داواکـاریــە هــەیـە، کـە ڕۆمـانــنــووس ئـاگـادار دەکاتەوە، «بیر و هۆشی خۆی بخاتە سەر شتە جەوهەرییەکان» (سەر ئەو شتەی، کە «تەنیا ڕۆمان دەتوانێ بیڵێ»)، بۆ ئەوانە لە جێی خۆیدا نییە، کە تاودانەوەکانی نووسەر وەکو ڕەگەزێکی بە شێوەی ڕۆمان نامۆ ڕەت دەکەنەوە؟ واتە ئەگەر ڕۆماننووس هۆکار بە کار دەهێنێ، کە هی خۆی نین، بەڵکو زیاتر هی زانا و فەیلەسوفەکانن، ئایا ئەمە نیشانەیەکی بێتوانایی نییە، کتومت ڕۆماننووس بێ و جگە لە ڕۆماننووس هیچی دیکە نەبێ، ئایا ئەمە نیشانەی لاوازی هونەرییە؟ جگە لــەوە: تێڕامانە پەرش و بڵاوەکان مەترسی ئەوەیان نییە، هەڵسوکەوتی کەسەکان بکەنە تەنیا وێنەیەکی تێزەکانی نووسەر؟ ئــەی: ئایا هــونــەری ڕۆمـــان، بــە زەینییەوە بۆ ڕێژەگەرایی ڕاستییەکانی مرۆڤ داوای ئەوە ناکات، نەک، کە بیروڕای نووسەر پەنهان بمێنێتەوە و هەموو تاودانەوەکان بۆ خوێنەر بن.

وەڵامــی بــرۆخ و موزیل زۆر ڕوون بــوو: لە ڕێی دەرگایەکی زۆر کـراوەوە هێڵایان بیرکردنەوە بێتە ناو ڕۆمانەوە وەکو هەرگیز پێشوتر نەکرابوو. ئەو وتارەی بە ناونیشانی داتەپینی بەهاکان ئاوێزانی

خەوڕۆکان کراوە بە (دە بەش لە سێیەم ڕۆمانی بە ناو سێینە پەرشوبڵاوەکەدا پێکدەهێنێ) بەدوای یەکداهاتنی ڕاڤە، تێڕامان، قسەی نەستەقن لە بارەی بارودۆخی عەقڵی ئەورپا لە سێ دەیەدا؛ مەحاڵە مرۆڤ بتوانێ بانگەشەی ئەوە بکا، ئەم وتارە بۆ شێوەی ڕۆمان نەگونجاوە، چونکە لە ڕێی ئەوەوە ئەو شوورەیە ڕوونـاک دەکرێتەوە، کە لە سەری چارەنووسی سێ بەشدارەکە نسکۆ دەهێنێ، لە ڕێی ئەوەوە سێ ڕۆمانەکە بۆ یەک ڕۆمان یەکانگیر دەکرێ. من ناتوانم هەرگیز پڕ بە دڵ جەغدی لێبکەم: تاودانەوەیەکی وا بەرزی ڕۆشبیرانە لە ڕۆمانێکدا ئاوێزان بکرێ و بە شێوەیەکی جوان، مۆسیقایی بکرێتە بەشێکی جیانەکراوەی بینا و یەکێکە لە بوێرترین نوێکردنەوەکان، کە ڕۆماننووسێک لە قۆناغی هونەری مۆدێرندا پڕکێشی کردووە.

ئەوەی لە دیدی منەوە بەڵام گرنگترە: لە لای ئەم دوو ڤێناوییە تاودانەوە ئیدی وەکو ڕەگەزێکی ناوازە، وەکو ناوبڕ تەماشا ناکرێ؛ سەختە، «لەباسلدان»یان ناو لێبنرێ، لەبەرئەوەی بێوچان لە ڕۆمانگەلی بیرکەرەوەدا ئامادەیە، تەنانەت کاتێک ڕۆماننووس ڕووداوێک دەگێڕێتەوە یان وەسفی ڕووخسارێک دەکا. تۆڵستۆی یان جۆیس، وایان کرد گوێمان لەو ڕستانە بێ، کە بە مێشکی ئانا کارینینا یان مۆلی بلومدا گوزەر دەکەن؛ موزیل پێمان دەڵێ، خۆی بیر لە چی دەکاتەوە، کاتێ نیگایەکی درێژ دەخاتە سەر لیۆ فیشەر و نمایشە شەوانەییەکانی:

«بـەڵام ژووری نووستنی هاوبەش، ئەگەر تاریک کرابێ، پیاوێک دەخاتە باری ئەکتەرێکەوە، کە لە بەردەم بینەرانێکی نادیاردا دەبێ ڕۆڵی پاڵەوانێکی سوپاسگوزار، بەڵام زۆر سواو نمایش بکا، کە بە ئەفسوون شێرێک بە پرمەوە دێنێتە سەر شانۆ، چەندان ساڵە هۆڵی تاریکی بینەران نە بێدەنگترین چەپڵە نە بچووکترین نیشانەی ڕەتکردنەوەی لێوە دەرچــووە و مـرۆڤ دەتـوانـێ بڵـێ، کە ئـەم شتە توانیویەتی بەهێزترین ئەعساب بهەژێنێ. بەیانی لە کاتی بەرچایی خواردندا ... کلێمەنتینە وەکو تەرمێکی بەستوو ڕەق بوو و لیۆش هەستیاریی ڕایدەتەکێنێ. تەنانەت گێردای کچی هەموو جارێک کەمێک تێبینی ئەوەی دەکرد و زۆر بە ترس و بە نابەدڵییەکی تاڵەوە وێنای ژیانی ژن و مێردایەتی وەکو شەڕەپشیلە لە تاریکی شەودا دەکرد.» موزیل ئاوا دەچێتە «ناو ڕۆحی شتەکانەوە»، واتە «چوونە ناو ڕۆحی کۆرپەلە»ی فیشەڵی ژن و مێردەوە. بە هۆی درەوشانەوەی تاقە مەجازێکەوە، مەجازێکی بیرکەرەوە ڕووناکی دەخاتە سەر ژیانی سێکسی ئێستا و ڕابردوویان و تەنانەت ژیانی ئایندەی کچەکەیان.

با جەخت لە شتە جەوهەرییەکان بکەین: تاودانەوە، بەوجۆرەی بڕۆخ و موزیل هێنایانە ناو ئیستاتیکای ڕۆمانی مۆدێرنەوە، هیچ پەیوەندییەکی بە تاودانەوەی زانا یان فەیلەسوفێکەوە نییە؛ من تەنانەت دەڵێم، بە دەستی ئەنقەست نافەلسەفی، بەڵێ تەنانەت دژە فەلسەفییە، واتە بنەبڕکەرانە ناوابەستەی هەموو سیستەمی هزرێکە کە لە ئارادایە. حوکم نادا؛ جاڕی حەقیقەت نادا؛ پرسیار لە خۆی دەکا، سەری سوور دەمێنێ، دەیـەوێ بگاتە بنجوبنەوان؛ شێوەکەی زۆر جیاوازە: مەجازییە، تەوسگەرایە، گریمانەییە، زیـادەڕەوە، پڕە لە قسەی نەستەق، کۆمیدییە، شەڕەنگێزە، پڕ فەنتازیایە. پێش هەموو شتێکیش: هەرگیز جـوغـزی ئەفسوونی ژیـانـی کەسەکان بەجێناهێڵێ؛ چونکە ژیانی کەسەکان خۆراکی دەداتێ و پاساوی دەدا.

لە ڕۆژی خۆپیشاندانێکی گەورەدا ئولریخ لە نوسینگەی

گراف لاینسدۆرفی وەزیـرە. خۆپیشاندانێک؟ دژی چی؟ ڕوونکردنەوە دەدرێتە دەست، بەڵام لاوەکییە؛ گرنگ دیاردەی خۆپیشاندان خۆیەتی: خۆپیشاندان لە سەر جادە مانای چییە؟ ئەم خۆ سەرقاڵکردنێکە دەستەجەمعییە بۆ سەدەی بیستەم چی دەگەیەنێ؟ ئولریخ بە پەستییەوە لە پەنجەرەکەوە تەماشای خۆپیشاندەرەکان دەکا؛ کاتێ لە خوارەوە دەگەنە تـەلارەکـە، سـەریـان بـەرز دەکـەنـەوە و تووڕەیی دایاندەگرێ، پیاوەکان بە گۆچەنەکانیان هەڕەشە دەکەن، بەڵام «چەند هەنگاوێک ئەولاتر، کە ڕێگاکە پێچی دەکردەوە و وادەردەکەوت لە پشتەوەدا ونبێ، زۆربەیان دەستیان بەردابوو؛ بێمانا دەبوو، بە بێ بینەران هێشتا هەڕەشە بکرێ». لە بەر تیشکی ئەم مەجازەدا خۆپیشاندەران مرۆڤی تووڕە نین، ئەوان ئەکتەری تووڕەیین! هەر لەگەڵ نمایشەکە کۆتایی دێـت، پەلەیانە، «دەسـت هەڵگرن»! ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی سیاسەتناسەکان بیکەنە بابەتی خۆشەویستی خۆیان، «کۆمەڵگای نمایش» لە سایەی ڕۆماننووسێکەوە ئیشاعەی گیرابوو، لە سایەی «تێگەیشتنی خێرا و تیژی» (فیدلینگ) شتە جەوهەرییەکەی بارودۆخێک.

پیاوە بێ خەسڵەتەکە ئینسکلۆپیدیای بێ هاوتای بوونی سەرجەمی سەدەکەی خۆیەتی. ئەگەر بمەوێ ئەم کتێبە جارێکی دیکە بخوێنمەوە بە ئاسایی لامسەرلایی دەیکەمەوە، هەرچ لاپەڕەیەک بێ، بە بێ ئەوەی مشووری ئەوە بخۆم، چی پێشتر هاتووە و چی دوواتر دێت؛ ئەگەر «چیرۆک»ێکیش هەبێ، لەسەرخۆ، نەبەرچاو بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێ، بە بێ ئەوەی بیەوێ هەموو ئاگادارییەکە بۆ خۆی ڕاکێشێ؛ هەموو بەشێک بۆ خۆی شتێکی چاوەڕواننەکراوە، دۆزینەوەکەیە. بیرکردنەوەی لە هەموو شوێنێکدا ئامادە بە هیچ جۆرێک کاراکتەری ڕۆمانی لە ڕۆمانەکە نەسەندۆتەوە؛ شێوەکەی دەوڵەمەند کردووە و بواری ئەوەی زۆر فراوان کردووە، کە تەنیا ڕۆمان دەتوانێ بیدۆزێتەوە و بیڵێ.

## ئیدی پاسەوانی لە سنووری ناشیمانەیی ناکرێ

دوو ئەستێرەی گەورە ئاسمانی سەر ڕۆمانی سەدەی بیستەمیان ڕووناک کردەوە: سوریالیزم بە ناوبانگی دڵڕفێنییەوە بۆ ئاوێتەکردنی خـەون و ڕاستی و بوونگەرایی. کافکا زوو مرد، بۆ ئەوەی بتوانێ نووسەران و پرۆگرامەکانیان بناسێ. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو ڕۆمانانەی ئەو نووسیونی، پێشدەستی ئەم دوو ئاڕاستە ئیستاتیکییەی کردووە، لەوەش سەرنجڕاکێشتر، پیشانی دا، کە بە یەکەوە گرێ دراون.

ئەگەر بەلزاک یان فلاوبێر یان پرۆست بیانەوێ ڕەفتاری تاکێک لە دەوروبەرێکی سۆسیالی تۆکمەدا وەسف بکەن، هەموو بەزاندنێکی شیمانە لە جێگای خۆیدا نییە و لە لایەنی ئیستاتیکییەوە پچڕ پچڕە؛ بەڵام ئەگەر ڕۆماننووس بایەخی سەرەکی بخاتە سەر گیروگرفتێکی بوونگەرایی، ئیدی بە مەرج پێویست نییە، جیهانێکی شیمانەیی بۆ خوێنەر بخوڵقێنێ. نووسەر دەتوانێ ڕێ بە خۆی بدا، لە بەرامبەر ئەم ئامرازی زانیاری، وەسف، پاڵنەرانە، کە دەبێ ڕووکەشییەکی واقیعی بە گێڕانەوەکە بدا، زۆر بێپەرواتر بێ. لە حاڵەتی تایبەتیشدا لەوانەیە بە باشی بزانێ، کەسەکانی بۆ جیهانێکی زۆر ئاشکرا مەحاڵ بگوازێتەوە.

دوای ئەوەی کافکا سنووری مەحاڵی بەزاند، ئەو سنوورە بە بێ پۆلیس، بە بێ گومرک، بۆ هەمیشە بە کراوەیی مایەوە. ئەمە چرکەساتێکی گەورە بوو

لە مێژووی ڕۆماندا، بۆ ئەوەی لە زەینی ئەو سەهوو سەر هەڵنەدا، یەکسەر ئەوەی دەخەمە سەر، کە ڕۆمانتیکییە ئەڵمانییەکانی سەدەی نۆزدە پێشەنگ نەبوون. خەیاڵی نایابیان مانایەکی دیکەی هەبوو؛ پشت کردنە ژیانی ڕاستەقینە، لە گەڕاندا بوون بە دوای ژیانێکی دیکەدا؛ زۆر سەروبەندی لەگەڵ هونەری ڕۆماندا نەبوو. کافکا ڕۆمانتیکی نەبوو؛ نۆڤالیس، تیک، ئارنیم، ئـ.ت.ئا. هۆفمان لە دڵیدا شیرین نەبوون. برێتۆن حەزی لە ئارنیم بوو، کافکا نەو، وەکو کوڕێکی لاو لەگەڵ برۆدی هاوڕێیدا، بە جۆش و خرۆشەوە فلاوبێریان بە فەرەنسی دەخوێندەوە. لێیکۆڵییەوە. ئەو چاودێریکەرە گەورەیە مامۆستای بوو.

هەتا ئاگادارتر، هەتا ڕژدتر مرۆڤ چاودێری واقیعێک بکا، ئەوەندە باشتر تێدەگا، کە هاوتای ئەو وێنایە نییە، کە هەمووان بۆی هەیانە؛ لە ژێر نیگایەکی درێژی کافکادا هەمیشە زیاتر خۆی وەکو نامەنتیقی، واتە دژە مەنتیق. واتە مەحاڵ بەیان دەکا. هەر ئەم نیگا درێژە چاوبرسییەیە بە سەر دنیای واقیعیدا کافکا و دوای ئەو ڕۆماننووسی گەورەی بردە ئەودیوی سنووری شیمانەوە.

## ئاینشتاین و کارل ڕۆسمان

نوکتە، سەرگوزەشتە، چیرۆکی خۆش — من نازانم، چ وشـەیـەک بۆ ئـەم شێوە چیرۆکە زۆر کورتە کۆمیدیانە هەڵبژێرم، کە من پێشووتر زۆر لەزەتم لێیان بینیوە، چونکە پراگ پایتەختی بوو. نوکتەی سیاسی، نوکتە لە سەر یەهودی. نوکتە لە سەر جوتیار. لە سەر پزیشک. شێوەیەکی سەیری نوکتە لە سەر پرۆفیسۆر، هەمیشە نارێک و هەمیشە، نازانم بۆچی، بە چەتری بارانەوە.

ئاینشتاین تازە وانەکەی لە زانکۆی پراگ کۆتایی پێهێنابوو (بەڵێ، ماوەیەک لەوێ وانەی دەوتەوە) و دەیەوێ بڕوا. «جەنابی پرۆفیسۆر، چەترەکەتان لەگەڵ خۆتان ببەن، باران دەبارێ!» ئاینشتاین بە دەم بیرکردنەوەوە لە سووچێکی هۆڵەکەدا سەیری چەترەکەی دەکا و بە خوێندەکارەکە دەڵێ: هاوڕێی ئازیز، دەزانن، زۆر جار چەترەکەم لە بیر دەچێ، لەبەرئەوە دوو دانەم هەیە. یەکێکیان لە ماڵەوەیە، دووەمیان لە دانیشگا. بێگومان ئێستا دەتوانم لەگەڵ خۆم بیبەم، وەکو ئێوە دروست دەیڵێن، لە دەرەوە باران دەبارێ. بەڵام لە ئەنجامدا دوو چەترم لە ماڵەوە دەبێ و لێرە هیچ چەترم نابێ.» دوای ئەم وشانە دەچێتە دەرەوە بۆ بەر بارانەکە.

ئەمەریکای کافکا بە هەمان وێنەی چەترێکی وەڕەسکەر، بێزارکەری هەمیشە ونبوو دەست پێدەکا؛ کارڵ ڕۆسمان لە کاتی بەجێهێشتنی پاپۆڕەکەدا لە لەنگەرگای نیویۆرک بە جانتا قورسەکەیەوە دەکەوێتە ناو قەرەباڵغییەکەوە. لە پڕ چەترەکەی بیر دەکەوێتەوە، کە لە خوارەوە لە ناو کەشتییەکە لە بیری چووە. جانتاکەی لە لای کوڕێکی گەنج بەجێدەهێڵێ، کە لە کاتی سـەفـەردا ناسیویەتی، لەبەرئەوەی ڕێڕەوەکەی پشتەوەی لە بەر حەشاماتاکە گیراوە، لە پلیکانەیەکەوە کە ئەو شارەزای نییە دادەبەزێتە خوارەوە و لە ناو ڕاڕەوەکەدا ڕێ ونده‌کا، لە دواییدا لە دەرگـای کابینەیەک دەدا، کە پیاوێکی تێدا دەبینێ، تونچییەکی کەشتی، یەکسەر قسەی لەگەڵ دەکا و گازندە لە سەرکارەکانی دەکا؛ لەبەرئەوەی گفتوگۆکە تاوێک دەخایەنێ، داوا لە کارڵ دەکا لە سەر پێخەوەکە ڕاکشێ، بۆ ئەوەی ئیستراحەت بکا.

مەحاڵیی سایکۆلۆژی ئەم بارودۆخە روون و ئاشکرایە. بە ڕاستی، ئەو شتەی بۆمان دەگێڕدرێتەوە ڕاست نییە! ئەمە نوکتەیە، لە کۆتاییدا کارڵ ڕۆسمان بێگومان بە

بێ جانتا و بە بێ چەتر دەمێنێتەوە! بەڵێ، ئەمە نوکتەیە؛ تەنیا کافکا وای ناگێڕێتەوە، وەکو چۆن نوکتە دەگێڕدرێتەوە؛ بە پانی و درێژی، وردینەیی دایەڕێژێ، هەموو نیشانەیەک ڕووندەکاتەوە، بۆ ئەوەی لە لایەنی سایکۆلۆژییەوە جێی بڕوا دەرکەوێ؛ کارڵ بە زەحمەت سەردەکەوێتە سەر جێخەوەکە و بە شەرمەوە بە بێسەلیقەیی خۆی پێدەکەنێ؛ دوای ئەوەی ماوەیەکی درێژ مشتومڕ لە بارەی ئەو سوکایەتییەوە دەکا کە بە تونچییەکە کراوە، لە پڕ چاوەڕواننەکراو بەرچاوڕوون دەڵێ، « لە جیاتی ئەوەی لێرە ئامۆژگاری بکا باشتر بوو جانتاکەی بهێنێ...» کافکا ماسکی شیمانە دەکاتە سەری مەحاڵ، ئەوەی بەم ڕۆمانە (و هەموو ڕۆمانەکانی) دڵڕفێنییەکی ئەفسوونی بێئەندازە دەبەخشێ.

## ستایشی نوکتەکان

نوکتە، سەرگوزەشتە، چیرۆکی خۆش – باشترین بەڵگەن، کە زەینی خەملاو بۆ ڕاستی و فەنتازیای گەڕیدەی ناو مەحاڵ بە باشترین شێوە لەگەڵ یەکدا هەڵدەکەن. پانورگە تاقە ژنێک ناناسێ، کە حەز بکا بیخوازێ؛ لەگەڵ ئەوەشدا وەکو عەقڵی مەنتیقی، تیۆری، پێشبینیکەر بڕیار دەدا، کە یەکسەر پرسیاری بنەمایی ژیانی بۆ هەمیشە چارەسەر بکا: مرۆڤ دەبێ هاوسەرگیریی بکا یان نا؟ ئەو لە پسپۆڕێکەوە بۆ لای یەکێکی دیکە ڕا دەکا، لە فەیلسەسوفەوە بۆ لای یاساناس، لە لای فاڵگرەوەیەکەوە بۆ لای فەلەکناسێک، لە لای شاعیرەوە بۆ لای ئایینزان، بۆ ئەوەی پاش توێژینەوەیەکی زۆر بگاتە ئەو یەقینەی، کە بۆ ئەم پرسیارەی هەموو پرسیارەکان وەڵام لە ئارادا نییە. سەرجەمی کتێبی سێیەم جگە لە باسکردنی ئەم وەگەڕخستنی مەحاڵە باسی هیچی دیکە ناکا، ئەو نوکتەیە، کە خۆی دەکاتە سەفەرێکی درێژ، نامیهرەبانی کۆمیدی بە ناو زانستی سەردەمی ڕابلێدا. (کە من دەخاتە سەر ئەو بیرەی کە سێسەد ساڵ دواتر بوڤار و پێکوچێ بە هەمان شێوە لە نوکتەیەکی لە ڕێی زانستی کاتێکەوە درێژبووەوەیە کە بۆتە سەفەر.)

سێرڤانتس بەشی دووەمی دۆن کیخۆتە دەنووسێ، کاتێ بەشی یەکەم چەندان ساڵە بڵاو بۆتەوە و ناسراوە. ئەمە دەیگەیەنێتە بیرۆکەیەکی نایاب: ئەو کەسانەی دۆن کیخۆتە تووشیان دەبێ، وەکو پاڵەوانی زیندووی ئەو کتێبە دەیناسنەوە، کە خوێندیانەتەوە؛ لە بارەی سەرچڵییەکانی پێشوویەوە مشتومڕی لەگەڵ دەکەن و دەرفەتی ئەوەی دەدەنێ، ڕاڤەی وێنە ئەدەبییەکەی خۆی بکا. بێگومان ئەمە شیاو نییە! ئەمە تەنیا فەنتازیایە! نوکتەیە!

ئەمجا ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو سێرڤانتس دەهەژێنێ: نووسەرێکی دیکە، نەناسراوێک پێشی کەوتووە، بەوەی درێژەپێدانی سەرچڵیی دۆن کیخۆتە بڵاودەکاتەوە. لە تووڕەییدا هەڵچوو، سێرڤانتس لە سەر لاپەڕەکانی بەشی دووەم، کە ئێستا خەریکی نووسینێتی تێر جنێوی پیسی پێدەدا. بەڵام یەکسەر دوای ئەوە سوود لەم ڕووداوە ناخۆشە وەردەگرێ و بیرۆکەیەکی دیکەی لێوە دەخوڵقێنێ: دوای هەموو نەگبەتییەکانیان دۆن کیخۆتە و سانچۆ شەکەت و غەمگینن، بە دەم ڕێوە بۆ گوندەکەیان، کاتێ دۆن ئەلڤارۆ ناوێک دەناسن، فیگورێکی لە دزینی لەعنەتی نووسینەوە؛ ئەلڤارۆ سەری سووڕ دەمێنێ، کاتێ ناوەکانیان دەبیستێ، چونکە ئەو زۆر باش دۆن کیخۆتەیەکی بە تەواوی دیکە سانچۆیەکی بە تەواوی دیکە دەناسێ! تووشی یەکبوونەکە

چەند لاپەڕەیەک پێش کۆتایی ڕۆمانەکە ڕوو دەدا: ڕووبەڕووکردنەوەیەکی فیگورەکان لەگەڵ تارماییەکانی خۆیاندا؛ بەڵگەی بنەبڕکەری درۆی هەموو شتەکان؛ تریفەی میلانخۆلی دوا نوکتە، نوکتەی ماڵئاوایی.
لە فێردیدەرکی گۆمبرۆڤیچدا پرۆفیسۆر پیمکۆ بڕیار دەدا یۆیۆی سی ساڵان بکاتە لاوێکی شازدە ساڵی، بەوەی ناچاری دەکا، ڕۆژەکانی لە سەر تەختەیەکی قوتابخانە بە سەر بەرێ، وەکو خوێندکارێکی ناو خوێندەکارەکان. لەم بارودۆخە شانۆی تەوسئامێزەدا پرسیارێکی زۆر قووڵ حەشارە: ئایا گەورەیەک، کە هەمووان بەڕێکوپێکی وەکو لاوێک ڕەفتاری لەگەڵ دەکەن، ئاگایی تەمەنی ڕاستەقینەی لە دەست بدا؟ گشتیتر: مرۆڤ بەو جۆرەی لێدێ، چۆن ئەوانی دیکە دەیبینین و مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، یان ئەو وزەیە دەدۆزێتەوە، لەگەڵ هەموو شتێکدا و دژی هەمووان، شوناسنامەی خۆی بپارێزێ؟
سەرگوزەشتەیەک، نوکتە وەکو بنەما بۆ ڕۆمانێک بە کار بهێنێ دەبوو بۆ خوێنەرەکانی گۆمبرۆڤیچ وەکو شەڕەنگێزیی مۆدێرنیستێک دەربکەوێ. بە ڕەوایی: ئەمە شەڕەنگێزی بوو. بەڵام ڕەگی لە ڕابردوویەکی زۆر دووردا داکوتابوو. لەو کاتەدا، کە هونەری ڕۆمان لە شوناسنامەکەی و ناوەکەی هێشتا دڵنیا نەبوو. فیدلینگ ناوی نابوو نووسینی- پەخشان- کۆمیدیی- داستانی؛ مرۆڤ دەبێ ئەمە هەمیشە لە مێشکیدا بهێڵێتەوە: کۆمیدیا یەکێک بوو لە فریشتەکانی مەتەڵ بە سەر لانکەی ڕۆمانەوە.

## مێژووی ڕۆمان لە ڕوانگەی کارخانەکەی گۆمبرۆڤیچەوە

ڕۆماننووسێکی کە لە بارەی هونەری ڕۆمانەوە قسە دەکا کەمێک جیاوازە وەکو لە پرۆفیسۆرێکی کە سەر دوانگەوە وانە دەڵێتەوە. ئێوە وێنای زیاتر وەکو نیگارکێشێک بکەن، کە بۆ وەرشەکەی بانگهێشتتان دەکا، ئێوە تابلۆ بە دیوار دراوەکانییەوە لە هەموو لایەکەوە تەماشا دەکەن. باسی خۆی دەکا، بەڵام پتر باسی ئەوانی دیکە دەکا، باسی ڕۆمانەکانیان، کە ئەو حەزی لێیانە و لە کارەکانی خۆیدا بە داپۆشراوی بە ئامادەیی دەمێننەوە. سەرجەمی ڕابردووی مێژووی ڕۆمان سەر لە نوێ لە بەردەمتاندا نمایش دەکا و بیرێکی شیعرییەتی ڕۆمانی خۆیتان دەداتێ، کە تەنیا هی ئەمە و لەبەرئەوە بێگومان بە پێچەوانەی شیعرییەتی ئەوانی دیکەوەیە. بەم شێوەیە ئەو هەستەتان لە لا دروست دەبێ، بە سەرسامییەوە دابەزنە خواری خوارەوەی کەشتییەکەی مێژووەوە، کە لە مشتومڕدا، لە ناکۆکیدا، لە بەیەکدادانیدا بڕیاری ئایندەی ڕۆمان دەدرێ، پەرەی پێدەدرێ، بە واقیع دەکرێ.
١٩٥٣، لە ساڵی یەکەمی یادەوەرییەکانیدا (کە لە شازدە ساڵی داهاتوودا هەتا مردنی درێژەی پێدەدا)، ڤیتۆڵد گۆمبرۆڤیچ لە نامەی خوێنەرێک دەهێنێتەوە: «خۆتان خۆتان ڕاڤە مەکەن! تەنیا بنووسن! حەیف دەبێ، ئەگەر فریوی ئەوە بخۆن، پێشەکی بۆ کارەکانی خۆتان بنووسن، پێشەکی یان ڕاڤە!» گۆمبرۆڤیچ وەڵامی دەداتەوە، ئەو لەمەودواش «ئەوەندەی بکرێ و هەتا بکرێ بەدرێژی» خۆی ڕوون بکاتەوە، چونکە نووسەرێک، کە لە توانایدا نییە، لە بارەی کتێبەکانی خۆیەوە بدوێ، ئەوا «نووسەرێکی تەواو نییە». با ماوەیەک لە وەرشەکەی گۆمبرۆڤیچدا بمێنینەوە. ئەمە لیستێکی دڵخواز و نادڵخوازەکانێتی: «شێوەی مێژووی ڕۆمانی کەسانی خۆی»:
لە هەموو ئەوانی دیکە زیاتر حەزی لە ڕابلێیە. (کتێبەکان لە بارەی گارگانتوا و پانتاگروێل لە

کاتێکدا نووسران، کاتێ ڕۆمانی ئەورووپی، هێشتا زۆر لە هەموو ڕێساکانەوە دوور بوو، تازە لە دایک بوو بوو؛ ئەگەریان لێدەڕژێ، کە مێژووی داهاتووی ڕۆمـان بە واقیع دەکـا یان ئافەرۆز دەکـا، بەڵام هەموویانمان وەکو وروژێنەر بۆ دەمێنێتەوە: سەفەر بۆ مەحاڵ، شەڕەنگێزی ڕۆشنبیری، ئازادیی شێواز. خۆشەویستی گۆمبرۆڤیچ بۆ ڕابلیە زەینی مۆدێرنیزمی ئەو بەیان دەکا: نەریتی ڕۆمان ڕەت ناکاتەوە، ئەو داوای دەکا، بەڵام بە تەواوی و سەرومڕ داوای دەکا، بە ئاگادارییەکی تایبەتەوە بۆ چرکەساتی نایابی پەیدابوونی.)

لە هەمبەر بەلزاکدا زیاتر بێپەروایە. (لـە دژی شیعرییەتی ئەو بەرگری لە خۆی دەکـا، کە لەو سەروبەندەدا کرابووە مۆدێلی ڕێسای ڕۆمان.)

حەزی لە بۆدلێرە. (ئەو هەواداری شۆڕشی شیعری مۆدێرنە.)

بە پرۆست سەرسام نییە. (دووڕیانێک: پرۆست گەیشتۆتە کۆتایی سەفەرێکی مـەزن، کە هەموو ئەگەرەکانی بەکار هێناوە؛ گەڕان بە دوای شتی نوێدا بۆتە خولیای، گومبرۆڤیچ دەتوانێ تەنیا ڕێگایەکی دیکە بگرێتە بەر.)

نزیکەی هیچ ڕۆماننووسێکی هاوچەرخی بە دڵ نییە. (نووسەران زۆر جار کەلێنی باوەڕنەکردەنی خـوێـنـدنـەوەیـان هـەیـە: گۆمبرۆڤیچ نـە برۆخی خوێندۆتەوە نە موزیل؛ تـووڕە لەو خۆباییانەی کافکایان بە زۆر کردۆتە هی خۆیان مەیلێکی تایبەتی بۆ کافکا نییە؛ حەز بە ئەدەبی ئەمریکای لاتینی ناکا؛ مەزاقی بە بۆرخێس کرد، کە بۆ زەوقی ئەو زۆر ڕواڵەتباز بوو و لە ئەرژەنتین لە دوورەپەرێزیدا ژیا؛ تەنیا ئێرنێستۆ ساباتۆ بایەخی بەو دەدا و گۆمبرۆڤیچیش ئەم هاوسۆزییەی بۆ ئەو هەبوو.)

حەزی لە ئەدەبی پۆڵۆنی سەدەی نۆزدە نییە (بۆ ئەو زۆر ڕۆمانتیکییە).

بە شێوەیەکی گشتی لە بەرامبەر ئەدەبی پۆڵۆنیدا بە پارێزە. (هەستی دەکرد هاووڵاتییەکانی خۆشیان ناوێ؛ بەڵام پارێزەکەی کینە نییە، تەنیا گوزارشت لە قێزێک دەکاتەوە، لە جلی زۆردارەکـی ناوکۆیی بچووکدا قەتیس بکرێ. لە بارەی توڤیمی شاعیری پۆڵۆنییەوە دەڵێ: «لە بارەی هەموو شیعرێکییەوە دەتوانین بڵێین، کە ‹مایەی سەرسامییە›، بەڵام ئەگەر پرسیارمان لێ بکرێ، توڤیم بە چی توخمێکی توڤیمی شیعری جیهانی دەوڵـەمـەنـد کـردووە، سوکوسانا وەڵاممان پێ نییە.»)

حەزی لە ئەڤەندگاردی ساڵانی بیست و سییەکانە. (لـەگـەڵ ئـەوەشـدا لـە هـەمـبـەر ئـایـدۆلـۆژیـای «پێشکەوتنخوازی» و لە هەمبەر «لایەنگری - مۆدێرنیزمی- مۆدێرنیان» دوودڵە، بەڵام لە تاسەیاندا بۆ شێوازی نوێ، ئـازادی فەنتازیا لە گەڵیاندایە؛ ئامۆژگاری نووسەرێکی لاو دەکا: لە سەرەتاوە بیست لاپەڕە بە بێ هیچ کۆنترۆڵێکی ئەقڵانی بنووسێ، ئەمجا جارێکی دیکە زۆر ڕەخنەگرانە بیخوێنێتەوە، شتە جەوهەرییەکانی بهێڵێتەوە و لە نووسین بـەردەوام بێ. وەکو ویستبێتی ئەسپێک کە ناوی «مەستیی»ە لە تەنیشت ئەسپێکی مەشقپێکراوی دیکە کە نـاوی «ڕوونــی»ە لە پێش گالیسکەی ڕۆمانەوە ببەستێتەوە.)

ڕقی لە «ئەدەبی دەروەست» دەبێتەوە. (ئەوەی مایەی سەرنجە: زۆر دژی ئەو نووسەرانە وتار نادات، کە ئەدەبیان خستبووە ژێر خەباتی دژە کاپیتاڵیزمەوە. بۆ ئەو نموونەی «ئەدەبی دەروەست»، ڕۆماننووسی لە پۆڵۆنیا کۆمۆنیستەکەیدا قەدەغە، ئەدەبی لە

ژێر ئاڵای دژە کۆمۆنیستی مارشکەردا. لە یەکەم ساڵی یاداشتنامەکەیدا سەرکۆنەی مانیخایزم ، ساکارکردنیان دەکا.)
ئەڤاندگاردی ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان لە فەرەنسا، پێش هەموو شتێک «ڕۆمانی نوێ» و «ڕەخنەی نوێ» (ڕۆلاند بارت) حەز لێناکا. (لە بارەی ڕۆمانی نوێوە: «ئەمە کەمە. ئەمە تاکنەوایە ... سۆپیلیپیزمانەیە . ئاوی خۆ هێنانەوەیە ...» لە بارەی «ڕەخنەی نوێوە»: «هەتا ژیرانەتر بێ، ئەوەندە گەمژەترە.» ئەو تەنگوچەڵەمەیە ئەو پەست دەکا، کە ئەم ئەڤاندگاردە نوێیانە نووسەرەکانی دەخەنە بەردەم: یان مۆدێرنیزم بە بۆتەقەی ئەوان (ئەو مۆدێرنیزمەی، کە ئەو وەکو زمانی پسپۆڕانە، ئەکادیمی، دۆگمایی، بە بێ پەیوەندی بە نەریت و بە بێ پەیوەندی بە واقیعەوە دەبینێ) یان هونەری تەقلیدی، کە بە بێ کۆتایی هەمان شێواز بەرهەم دەهێنێتەوە. بۆ گۆمبرۆڤیچ مۆدێرنیزم مانای وایە: بە دۆزینەوەی نوێوە بە سەر ڕێگای بە میرات بۆ ماوەوە بەرەو پێشەوە بڕۆی. ئەوەندەی کە شیاو بێ. هەتا ڕێگای بە میرات بۆ ماوەوەی ڕۆمان لە ئارادا بێ.)

## کێشوەرێکی دیکە

سێ مانگ دوای ئـەوە بـوو کە سوپای ڕووسیا چیکۆسلۆڤاکیای داگیر کرد؛ ڕووسیا هێشتا لە توانایدا نەبوو، بە سەر کۆمەڵگای چیکیدا سەروەر بێ، کە لە ترسدا، بەڵام (هێشتا چەند مانگێک) لە ئازادییەکی زۆردا ژیا. یەکێتی نووسەران، بەوە تاوانبار دەکرا، لانەیەکی دژە شۆڕش بێ، هێشتا خانووەکانی خۆی هەبوو، گۆڤاری خۆی هەبوو، هێشتا پێشوازی لە میوانان دەکرد. ئەو کاتە سێ ڕۆماننووسی ئەمریکای لاتینی، خولیۆ کۆرتێزار، گابریل گارسیا مارکیز و کارلۆس فوێنتەس بە بانگێشتنێک هاتن بۆ پراگ. لە سیفەتیانیاندا وەکو نووسەر نابەرچاو هاتن. بۆ ئـەوەی ببینن. بۆ ئـەوەی تێبگەن. بۆ ئەوەی پشتگیری هاوەڵە چیکییەکانیان بکەن. هەفتەیەکی لە بیرنەچووەوەم لە گەڵیاندا بە سەر برد. بووینە هاوڕێ. بە کورتی دوای سەفەرکردنیشیان توانیم دەستنووسەکانی وەرگێڕانی چیکی سەد ساڵ تەنیایی بخوێنمەوە.
من بیرم لەوە کردەوە، کە سوریالیزم هونەری ڕۆمانی بە تەواوی نەفرەت کرد، کە وەکو دژە شیعرییەت مۆرکی لێدا، وەکو بۆ هەموو ئەو شتانە داخراو بێ، کە خەیاڵی ئازادە. ڕۆمانەکەی مارکیزیش جگە لە خەیاڵی ئـازاد هیچی دیکە نییە. یەکێک لە کارە مەزنەکانی شیعر، کە من بیناسم. هەموو ڕستەیەک لە دەوڵەمەندی خەیاڵدا دەجریوێتەوە، هەموو ڕستەیەکی غافڵگیرییە، شاگەشکەییە: وەڵامێکی برەرە بۆ ئەو ڕقەی لە ڕۆمان لە مانیفێستی سوریالیزمدا جاڕی بۆ دراوە (لە هەمان کاتیشدا پەسندانێکی نایابی سوریالیزمە، هەژێنەری، عەقڵی، کە بە ناو سەدەدا تێپەڕیوە).
ئەمە ئەوەش دەسەلمێنێ، کە هەڵبەست و شیعری عاتیفی جووتە چەمک نین، بەڵکو چەمکگەلێکن، کە دەبێ باش لە یەک جودا بکرێنەوە. شیعری گارسیا مارکیز چ پەیوەندییەکی بە شیعری عاتیفییەوە نییە، نووسەر دانپێدانان ئەنجام نادا، ڕۆحی ناکاتەوە، ئەو تەنیا بە جیهانی بابەتی سەرمەستە، کە بۆ دەوروبەرێکی دەگوازێتەوە، کە تیایدا هەموو شتێک ڕاست، مەحاڵ و لە هەمان کاتدا ئەفسوناوییە.
شتێکی دیکەش: هەموو ڕۆمانێکی گەورەی سەدەی نۆزدە دیمەنی کردۆتە توخمی بنەڕەتی بیناکاریی.

ڕۆمانەکەی گارسیا مارکیز لە سەر ڕێگایەکە، کە بە ئاڕاستەی پێچەوانەوە دەڕوا: لە سەد ساڵ تەنیاییدا دیمەن نییە! بە تەواوی لە تەوژمی مەستی گێڕانەوەدا تواونەتەوە. من نموونەیەکی دیکە بۆ شێوازێکی وا ناناسم. وا دەردەکەوێ، وەکو ڕۆمان بۆ لای گێڕەرەوەیەک گەڕابێتەوە، کە وەسفی هیچ ناکا، تەنیا دەگێڕێتەوە، بەڵام بە ئازادییەکی فەنتازیای واوە دەگێڕێتەوە، کە مرۆڤ پێشووتر هەرگیز نەیبینیوە.

## پردە زیوینەکە

چەند ساڵێک دوای بەیەکگەیشتنەکە لە پراگەوە ماڵم گواستەوە بۆ فەڕەنسا، لەوێ، ڕێکەوت وا بوو، کارلۆس فوێنتەس باڵیۆزی مەکسیک بوو. من ئەو کاتە لە ڕێنێ دەژیام، لە مانەوە کورتەکانمدا لە پاریس لە لای ئەو، لە هەورەبانێکی باڵیۆزخانەدا دەمامەوە لەگەڵیدا بەرچاییم دەخوارد، کە هەمیشە بۆ مشتومڕی بێکۆتایی درێژ دەبووەوە. لە پڕ ئەورووپای ناوەڕاستی خۆم بە دراوسێی چاوەڕواننەکراوی ئەمەریکای لاتین دەبینی: دوو کەناری ئەمسەر و ئەوسەری هاوپێچەوانەی ڕۆژئــاوا؛ دوو وڵاتی لە بیرکراوی، ڕقلێبووەوەی، ئافەرۆزکراو، دوو وڵاتی وەدەرنراو و بەشگەلێکی بە بەهێزترین ئەزموونی خورپەداری بارۆک خەمڵاوی جیهان. من وتم خورپەدار، لەبەرئەوەی بارۆک وەکو هونەری داگیرکەر بۆ ئەمریکای لاتینی هاتووە و لەبەرئەوەی لە لایەن دژەڕۆشنگەرییەکی بە تایبەتی خوێناوییەوە بۆ وڵاتەکەی من هێنراوە، ئەو شتەی ماکس برۆدی پاڵناوە، پراگ بە «شاری بەد» ناوزەد بکا؛ من دوو بەشی جیهانی بە هاوپەیمانی پڕ نهێنی ئاگاداری بەدی و جوانیم بینی.

گفتوگۆمان کرد، پردێکی سووکی، تروسکەداری، درەوشـاوەی زیوین وەکو پەلکەزێڕینەیەک بە سەر سەدەکەدا لە نێوان ئەورووپای ناوینی بچووکی من و ئەمەریکای لاتینی گەورەدا بەرز بووەوە، پردێک، کە پەیکەرە گەشکەدارەکانی ماتیاس براون لە پراگ و کڵێسە شادەکانی مەکسیکی بەیەکەوە دەبەستەوە.

بیرم لە خزمایەتییەکی دیکەش لە نێوان هەردوو وڵاتەکەماندا کـردەوە: شوێنگەیەکی گرنگیان لە پەرەسەندنی ڕۆمانی سـەدەی بیستەمدا گرتووە: لە سەرەتاوە ڕۆماننووسەکانی ساڵەکانی بیست و سییەکان (کارلۆس لە بەرامبەر مندا خەوڕۆکانی هێرمان برۆخی بە گرنگترین ڕۆمانی سـەدە ناو بـرد)؛ ئەمجا، پتر لە بیست، سی ساڵ دواییتر، ڕۆماننووسەکانی ئەمریکای لاتین، هاوچەرخەکانم.

نازانم کەی ڕۆمانەکانی ئێرنستۆ ساباتۆم دۆزییەوە؛ لە کارەکەیدا، عیزرائیل (١٩٧٤)، کە تاودانەوەی لێدەپژێ وەکـو لە کاتی خۆیدا ڕۆمانەکانی دوو ڤێناوییەکە، دەقاو دەق دەڵێ: دوای ئەوەی فەلسەفە دنیای بەجێهێشتووە، ئەو جیهانەی سەدان ڕشتەی زانست لەتوپەتیان کردووە ڕۆمانمان وەکو دوا ڕوانگە بۆ دەمێنێتەوە، کە لەوێوە مرۆڤ دەتوانێ نیگای سەرجەمی ژیانی مرۆڤ بکا.

نیو سەدە پێش ئەو، لە لایەکەی دیکەی هەسارەکەوە (پردە زیوینەکە بە سەر سەرمەوە لەرزی)، خەوڕۆکەی برۆخ و پیاوە بێ خەسڵەتەکەی موزیل بیریان لە هەمان شت کردۆتەوە. لە کاتێکدا، سوریالیستەکان شیعریان بۆ بەرزترین ئاستی هونەرەکان بەرز کردەوە، ئەمان ئەم شوێنە هەرە بەرزەیان بۆ ڕۆمان تەرخان کرد.

# دۆستۆیفسکی و نهێلیزمی ڕووسی

نووسینی: داریوش شایگان
و. لە فارسیەوە: هادی محەمەدی

نهێلیزمی ئەڵمانی بەپێی بنەمای وشیاری لە ڕەوتی هەڵدان و نسکۆی ئەندێشەی ڕۆژاوایی پێکهاتووە، بەڵام نهێلیزمی ڕووسی، نکۆڵی لەم مێژووە دەکا و ڕەتی دەکاتەوە. نهێلیزمی ڕووسی ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی و کولتوری هەیە. توندڕەوی و کوندڕەوی لە سروشتی خەڵکی ڕووسیا دایە. ڕووسەکان یان نهێلیستن یان بڕوایان بەو دنیا هەیە. ململانێی بەردەوامی ئەم دوو خەسڵەتە ناکۆکە، دیاردەیەکی لێدەبێتەوە کە بردیائۆف پێی دەڵێ «شێتی متافیزیکی». لە هەموو گەورە پیاوانی مەزنی ڕووسیا، بەتایبەت لە بەرهەمەکانی دۆستێڤسکی دا، ئەم



داریوش شایگان

**ئەو کەسەی کە هەموو ئەم ناکۆکییانەی ڕووسیای تێزاری لە ئاستێکی وشیاری بیماردا ئەزموون کرد، دۆستۆیفسکی بوو. ڕۆمانی «ئەهریمەنان» بەڵگەیەکی بەنرخە کە لەودا ئاکامی هەموو ئەم ناکۆکییانە و چارەنوسی ڕووسیا و مەزهەبی ئۆرتۆدۆکس پێشبینی کراوە**

ململانێیە بەدی دەکەین. مرۆڤی ڕووسی قەت ناتوانێ میانەڕەو بێت... ڕەنگە فەزای بێ کۆتایی دەشتەکان و ئاسۆی بێ سنووری بیابانی کاکی بە کاکی ڕووسیا، بەجۆرێک کاری کردۆتە سەر ڕۆحی خەڵکی ئەم وڵاتە، کە مرۆڤی ڕووسی حەد و ئەندازە ناناسێ، یان گۆشەگیر دەبێ و دەبێتە سۆفی، یان روو دەکاتە مەیخانە و بەردەوام مەستی. دەتوانین لەنێو تۆفانی ڕەقس و سەما و گۆرانی و مۆسیقی کۆڕی مەستانی شارەکانی ڕووسیادا وەها ڕەهەندێکی دیونیزیوسی بەدی بکەین. کۆڕی مەستی شەوانی پترزبورگ هەندێ جار چەندین شەو و ڕۆژ درێـژەی دەکێشا و بگرە لەگەڵ خۆی سروەت و سامان و خەون و خولیای بنەماڵەکانی بە با دەدا و سەرئەنجام لە ساتێک دا گێژوکاسی مەستی بە ئاستی شێتی دەگەیشت و بە دەنگی گولەیەک کۆتایی پێدەهات. مرۆڤی ڕووسی هەست و شەوق هەڵیدەگرێ، هەست و شەوقێک کە مرۆڤ بێ هۆش دەکات، چ وەک زێدەڕۆیی لە عەیش و مەستی دا، چ وەک بیری دۆگم و کەللە وشکانە لە باوەڕی شۆڕشگێڕی دا، چ وەک جۆرێک قومار کە سەر و ماڵی دەدۆڕێنێ و بە گوولەیەک کۆتایی دێ کە لە «ڕۆڵێتی ڕووسی»دا مێشکی نەجیب زادەیەک دەپڕژێنێ، چ وەک هەوڵێکی سۆفیانە کە پاک و خاوێنی مەسیحایی دەژێنێتەوە. بەڵام ئەم هەستانە چ موسبەت بن چ مەنفی، بەردەوام ڕەهەندێکی دێوئاسا بەخۆوە دەگرن: ئەگەر پەستی بێت دەگاتە ئاستی بلیمەتی، ئەگەر لەخۆبردوویی بێت دەگاتە ئاستی خۆنەویستی و فیداکاری، ئەگەر فیز و لووتبەرزی بێت دەگاتە ئاستی شێتی، ئەگەر عشق بێت دەگاتە

ئاستی سۆز و خۆشەویستی مەسیحایی، ئەگەر سەربزێوی بێت حاشا لە بوونی خودا و ئەم دنیا و ئەو دنیاش دەکا و بە نهێلیزمی پەتی دەگات. بەمجۆرەیە کە ئەدەبیاتی مەزنی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕووسیا، وەها مەیلێکی هەیە، چونکە وەکوو گەلی ڕووسیا دەیەوێ دواین پرسەکان باس و گەلاڵە بکات: خودا هەیە یان نا؟ مۆدێرنیتە باشە یان خراپە؟ هەموو شتێک ڕەوایە یان نا؟ ئەو پرسانە کە لە سەدەی نۆزدەهەم دا لەنێوان ڕۆشنبیرانی ڕووسیا گەلاڵە دەکرا و شەو تا بەیانی باسی لەسەر دەکرا و بە پرسی شووم و لەعنەتی ناودەنرا، لە پرسەکانی ئێستای وڵاتی ئێمە دەچێ، بەڵام جیاوازی لەمە دایە کە یەکەم: ئەگەرچی ڕووسیا وڵاتێکی ئاسیاییە، بەڵام بەشێکە لە ڕۆژاوا و، دووهەم: پرس و کێشەکانی ڕۆشنبیرانی ڕووسیا ڕەهەندی زەبەڵاحی ئەرکی نەتەوایەتی گەلی ڕووسی بەخۆوە دەگرت، سێهەم: کەسانێک کە ئەم پرسانەیان ئاراستە دەکرد مەزنترین بلیمەتەکانی فەرهەنگی مرۆڤی بوون. ئەگەر دۆستێڤسکی لە کتێبی «ئەهریمەنان» دا چارەنوسی شوومی ڕووسیای پێشبینی کرد، بەڕای «بۆریس پاسترناک» بەرهەمی شۆڕشی بۆلشڤیکی، کیژۆڵەیەکی ساویلکەیە کە لە «لارا»ی شەنگ و «ژیواگۆ»ی نەجیب بەدیهاتووە، بە وتەیەکی تر، ڕووسیای پیرۆز منداڵێکی بوو کە خاوەن بیر و بیرەوەری نەبوو.

دۆستێڤسکی دەیوت: «ئێمەی ڕووسی هەموومان نهێلیستین.» ئەمە وتەیەکی گرنگە. ئاخر نهێلیزم لە مێژوو و کولتوری ڕووسیادا ڕەگی داکوتاوە. لە بناغەدا نهێلیزم دیاردەیەکی ڕووسی و ئایینییە

**دۆستۆیفسکی دەیوت: «ئێمەی ڕووسی هەموومان نهێلیستین.» ئەمە وتەیەکی گرنگە. ئاخر نهێلیزم لە مێژوو و کولتوری ڕووسیادا ڕەگی داکوتاوە. لە بناغەدا نهێلیزم دیاردەیەکی ڕووسی و ئایینییە کە لە پشتخانێکی ئۆرتۆدوکسی پێکهاتووە و، لە ڕاستیدا، ڕەهەندی ئاوەژووی لایەنی مەعنەوی ڕووسی، جۆرێك پارێز و پاکییە کە لە بەخششی یەزدانی بەدەرە. ئەم بیرە کە گۆیا ئەم دنیایە پڕاوپڕ لە شتی خراپ و شووم و پیس، نهێلیزمی ڕووسی بە ئاقارێك دا برد کە نکۆڵی لە هەموو شتێك بکات، هەر لە دین، تا کولتور و هونەر. نهێلیزم وەك خەسڵەتی سۆفیانەی خەڵکی ڕووسیا، بەهاکانی تاکی دەویست، بەڵام سەرئەنجام حاشای لە تاك کرد و لەنێو سیستمی گشتی بۆلشڤیزم دا تواندییەوە... ڕیشەی ئەم نهێلیزمە و سەرکێشی خەڵکی ڕووس دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەهەم و بزاڤی «راسکۆڵ»ـەکان کە بڕوایان بە کلیسای «ئۆرتۆدوکس» هەبوو**

کە لە پشتخانێکی ئۆرتۆدوکسی پێکهاتووە و، لە ڕاستیدا، ڕەهەندی ئــاوەژووی لایەنی مەعنەوی ڕووسی، جۆرێک پارێز و پاکییە کە لە بەخششی یەزدانی بــەدەرە. ئەم بیرە کە گۆیا ئەم دنیایە پڕاوپڕ لە شتی خراپ و شووم و پیس، نهێلیزمی ڕووســی بە ئاقارێک دا برد کە نکۆڵی لە هەموو شتێک بکات، هەر لە دین، تا کولتور و هونەر. نهێلیزم وەک خەسڵەتی سۆفیانەی خەڵکی ڕووسیا، بەهاکانی تاکی دەویست، بەڵام سەرئەنجام حاشای لە تاک کرد و لەنێو سیستمی گشتی بۆلشڤیزم دا تواندییەوە... ڕیشەی ئەم نهێلیزمە و سەرکێشی خەڵکی ڕووس دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەهەم و بزاڤی «راسکۆڵ»ـەکان کە بڕوایان بە کلیسای «ئۆرتۆدوکس» هەبوو. راسکۆلەکان ئەم پرسەیان وروژانــد: ئایا وڵاتــی پیرۆزی ڕووسیا کە ڕۆمی سێهەمە، وڵاتی حکومەتی مەسیحە، یان دەڤەری دەسەڵاتی دەجاڵ، یانی «ئانتێ کریست»ـە؟ ئەم بڕوایە کە تێزار و کلیسا خیانەتیان بە دینی پیرۆزی گەلی ڕووس کــردووە، بەشێنەیی پــەرەی سەند، راسکۆلەکان بەردەوام پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە دەسەڵاتی مۆسکۆ دەڕوخــێ و حکومەتی دەجاڵ تێکدەشکێ، ئیتر لەوە بەدوا هەموو دەسەڵاتێکی دنیاییان هەر لە ئیڤانی سامناک، تا ناپلیۆن و پیتەری گەورە بە هێمای ئانتی کرێست دەزانی و پێیان وابوو یوتۆپیای ڕەسەنی «ئۆرتۆدوکسی» لە شاری خەیاڵی «کیتژ» و لە ناخی دەریا دایە. گەلی ڕووسیا مێتۆدی حاشا و ڕەتکردنەوەی لە گرووپی رادیکاڵی راسکۆڵ وەرگرتووە و خەسڵەتی نهێلیستی پێداوە، دواتــر لەگەڵ خواستی سۆسیالیستی و مارکسیستی ڕۆژاوایی تێکەڵی کردووە و بە ئانارشیزم و بۆلشڤیزم گەیشتووە.

حاشا کردن لە کولتور و مێژوو بوو بە هۆی ئەوە کە گەلی ڕووسیا هەردەم باسی پرسە ئایدیالەکان بکەن و تووشی توندڕەوی ببن. لەم بابەتەوە کتێبی نووسەری نهێلیستی ڕووسی «چرنیشفسکی» بە ناوی «دەبێ چ بکەین» زۆر سەرنجڕاکێشە، ئاخر هەموو بیرمەندانی ڕووس لە بیری ئەوە دا بوون کە دەبێ چ بکەن. ئایا دەبێ بە وتەی هێرتسن و لایەنگرانی، ببن بە ڕۆژئاوایی، یان بەوجۆرە کە لایەنگرانی ڕەوتی «سلاڤیزم» دەیانوت بگەڕێنەوە بۆ نەریتی گەلی ڕووسیا کە بریتییە لە ڕزگارکردنی هەموو دنیا؟ لە بەرانبەر نوسەرانی ئایدیالیستی ١٨٤٠ دا کە پێڕەوی هێگل و شلینگ بوون و بڕوایان بە ئەدەب و هونەر و ئامانجە بەرزەکان هەبوو، نووسەرانی نهێلیسی ١٨٦٠، کەسانێکی وەک «چرنیشفسکی»، «دوبریۆلۆڤ» و «پیسارۆڤ» ماتریالیست و سۆسیالیست بوون و زانست و بایۆلۆژی و دژی دین بوون. پیسارۆڤ دەیوت: جووتێ پێڵاو نادەم بە هەموو بەرهەمەکانی شیکسپێر. لە بەرانبەر نوسەرانی نهێلیست دا، نوسەرانی ئانارشیستی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، مارکسیست بوون. بە وتەیەک ڕەنگە بتوانین بێژین کە سۆسیالیزم و مارکسیزم، نهێلیزمی ڕووسی و نهێلیزمی ڕۆژئاوایی لێکدەبەستن. بەڵام چ نوسەرانی نهێلیست و ئانارشیست، چ لایەنگرانی ڕۆژئاوا و چ ڕەوتی سلاڤیست، هەموویان لایەنگری چارەسەری کۆتایی بوون: چ ئەم ڕێگە چارەیە بە ڕادیکاڵیزمی «نەچایف» بگات، چ بە ئانارشیزمی «باکونین» کە پێی وابـوو بۆئەوەی دنیای نوێ بخولقێنین،

دەبێ هەموو شتێک بڕوخێنین، چ بە ئانارشیزمی ئایینی تۆلستۆی بگات، چ بە چەمکی «مرۆڤایەتی یەزدانی» بیرمەندی رووس «سولویۆڤ» بگات، چ بە پلانی شۆڕشگێڕانەی لێنین کە تێکەڵاوێک بوو لە بیری باکونین و پیتەری گەورە.
ئەو کەسەی کە هەموو ئەم ناکۆکییانەی ڕووسیای تێزاری لە ئاستێکی وشیاری بیماردا ئەزموون کرد، دۆستێڤسکی بوو. رۆمانی «ئەهریمەنان» بەڵگەیەکی بەنرخە کە لەودا ئاکامی هەموو ئەم ناکۆکییانە و چارەنوسی ڕووسیا و مەزهەبی ئۆرتۆدۆکس پێشبینی کراوە. دۆستێڤسکی لەم ڕۆمانەدا شێوازی دیالێکتێکی مەنفی خۆی پەرەپێداوە و مێتۆدی خۆی بەم پرسە دەست پێدەکات: «ئایا دەتوانین هاوکات هەم بەفەرهەنگ و ئەوروپایی بین و هەم خاوەن بڕوا بین؟ ئایا دەتوانین بڕوامان بە مەسیح وەک کوڕی خودا هەبێت؟» بۆئەوەی ناکرێ وەڵامی حەتمی بەم پرسە بدەینەوە کەوابوو دەبێ بێ دینی هەڵبژێرین کە بەهۆی جیهانبینی زانستی نوێ پێکهاتووە. بەهەر حاڵ دەبێ بڕوا بەم بێ دینییە بکەین. ئێستا ئەم پرسە دێتە ئاراوە: ئایا دەتوانین وەک چۆن بڕوامان بە مەسیح هەیە، بڕوامان بە زانست هەبێت؟ بەم پرسیارە ناکۆکییەکی گەورەتر ئاشکرا دەبێت، چونکە ئەگەر بتوانین هەم بڕوامان بەم هەبێت هەم بە ئەو، یان تووشی «فەلسەفەی بێ خەیاڵی» دەبین، یان بە هیچ کام لەو دوانە بڕوامان نەماوە. لە ڕاستیدا فەلسەفەی بێ خەیاڵی هەر دوو پرس ڕەت دەکاتەوە. بە وتەیەکی تر، فەلسەفەی بێ خەیاڵی، یانی بێ خەبەری پەتی، بێ خەبەر لەم ڕاستییە کە نە ئەممان هەیە، نە ئەو. بۆچی؟ چونکە بڕوا و بێ بڕوایی قەت لەگەڵ یەکدا نایەنەوە و دژ بە یەکن و یەکتر ڕەت دەکەنەوە. کەوابوو یان دەبێ ئەمیان هەڵبژێرین، یان ئەویان، ڕێگەی سێهەم بریتییە لە فەلسەفەی بێ خەیاڵی و بێ خەبەری، یان حاشا لە هەردوویان دەکات. ئەگەر بڕوامان نەبێت، ئیتر ناتوانین باوەڕمان بە مەسیح هەبێت، کەوابوو نوسەری شۆڕشگێڕی ڕادیکاڵ، نەچایڤ، ڕاست دەکات، دەبێ هەموو شتێک بسووتێنین و سامان و سیستمی سەردەم بفەوتێنین. ئەگەر بڕوادارین، دەبێ حاشا لە سۆسیالیزم و بێ بڕوایی بکەین و دڵ بە مەسیح بسپێرین: یان ئیمان بێنین، یان هەموو شتێک بسووتێنین. ڕێگەچارەی سێهەم کە بریتییە لە ئاشتکردنەوەی ئەم دوو لایەنە، یان بریتییە لە فەلسەفەی بێ خەیاڵی، یان حاشا لە هەر دوو لایەن دەکات. دۆستێڤسکی لە هەموو بەرهەمەکانی دا ڕێگەی سەربزێوی دەگرێتەبەر و حاشا لە بڕوا و خودا دەکات، بەڵام حاشا و ڕەتکردنەوە کە بەرهەمی ئازادی بێ سنووری مرۆڤە، سەرئەنجام بە سەرەڕۆیی بێ سنوور دەگات و خودی ئەم ئازادییە ڕەت دەکاتەوە. تێکڕای دیالکتێکی مەنفی داستایڤسکی، هەر لە «تاوان و سزا» تا «ئەهریمەنان» و «برایانی کارامازۆڤ»، ئەنجامی سامناکی سەرکێشی و لەخۆنامۆیی مرۆڤ و هەروەها داڕوخانی بەها ئینسانییەکان دەردەخات کەسەرئەنجام بە کۆیلەیەتی حەتمی مرۆڤ دەگا و لوتکەی سەربزێوی لە ڕۆمانی کارامازۆڤ دا بە ئەفسانەی پشکێنەری مەزن کۆتایی دێت، پشکێنەری مەزن ڕووی ئاوەژووی مەسیحە، یان بە وتەیەکیتر «ئانتێ کرێست»ـە.

سەرچاوەی ئەم سەربزێوییە لەم وتەوە هەوێن دەگرێت: «ئەگەر خودا نەبێت هەموو شتێک ڕەوایە«، یانی ئازادی بێ سنووری مرۆڤ، بە ئاستێک دەگات کە مرۆڤ خۆی بە خودا دەزانێت. هەموو قارەمانانی دۆستێڤسکی هەر لە «راسکۆلنیکۆف» تا «ئیڤان کارامازۆڤ» تا «کیریلیۆڤ» و «ستاڤرۆگین» وەها مەیلێک بۆ گەیشتن بە ئازادی بێ سنوور ئەزموون دەکەن. ئەزموونی بان پیاوانەی راسکۆلنیکۆف کە بە مەبەستی خزمەت بە مرۆڤایەتی دەست بۆ تاوان و جنایەت دەبات، سەرئەنجام بە کارەسات و ئازاری ویژدان کۆتایی دێت. لەئاست وەها سەرکێشیێکی بچووکدا، سەرکێشی ئیڤان زۆر گەورەیە. ئەگەر راسکۆلنیکۆف خۆی لە قاڵبی سیستمی بان پیاوانەدا دەبەستەوە، ئیڤان هەموو سیستمێک دەبەزێنێ. ئیڤان حاشا لە بوونی خودا دەکات، بەڵام ڕەتکردنەوەی خودا، بە ڕەتکردنەوەی دنیا دەگات، هەروەها ڕەتکردنەوەی خودا و دنیا، بەشێوەی سروشتی بە دیالێکتێکی نە ئەم نە ئەو دەگات، ئاکامی ئەم سەرکێشییەش بە سەرەڕۆیی و دیکتاتۆری بێ سنووری مرۆڤ و دەسەڵاتی پشکێنەری مەزن دەگات. بە وتەیەکی تر، ئازادی و سەرەڕۆیی بێ سنوور، بە کۆیلەیەتی بێ سنوور دەگات. حکومەتی پشکێنەری مەزن، بریتییە لە دەسەڵاتی ئەقڵی ئۆقلیدۆسی، ئەقڵی ئۆقلیدۆسیش یانی پێکهێنانی سیستمێک کە لەودا نە ژان و ئازارێک هەیە، نە ئەرک و بەرپرسیارێتی، نە ئازادی. دەسەڵاتی ئەقڵی ئۆقلیدۆسی، ئاکامی ڕاستەوخۆی حکومەتی پشکێنەری مەزنە، یانی حکومەتێک کە لەودا مرۆڤەکان وەک مێرووله، تەنیا بیر لە خورد و خوراک دەکەنەوە و ئامانجە بەرزەکان پشتگوێ دەخەن. لە بەرهەمەکانی داستایڤسکی دا کەسانێک وەک «شیگالۆف» و «ڤۆرخونسکی» (لە ئەهریمەنان دا) و پشکێنەری مەزن/ ئیڤان (لە کارامازۆڤ دا) بانگەشەی وەها سیستمێک دەکەن.

حکومەتی ئەقڵی ئۆقلیدۆسی، یانی بەدیهاتنی سێ خواست کە مەسیح لەپێناو رزگارکردنی مرۆڤ، ڕەتی کردنەوە: ١. کردنی بەرد بە نان، ٢. موعجزەی کۆمەڵایەتی، ٣. یوتۆپیای دنیایی. مەسیح بۆئەوەی ئازادی مرۆڤ بپارێزێ، ئەم سێ خواستەی ڕەت کردەوە، چونکە ئەو نەیدەویست کە قووتی رۆحانی (نانی ئاسمانی) ببێت بە نانی زەمینی، موعجیزە جێگەی مافی هەڵبژاردنی ئازاد بگرێتەوە و، یوتۆپیایی زەمینی جێگەی یوتۆپیایی یەزدانی بگرێتەوە. بەپێچەوانەوە، ئەقڵی ئۆقلیدۆسی دەیەوێ ئەم سێ خواستە بەدیبێنێ، بۆئەوەی هەر کە مرۆڤ ئەم سێ خواستە قەبوڵ بکات، سۆسیالیزمێک بەدیدێت کە لە ئیمان داماڵراوە و ئازادی ڕاستینی مرۆڤ لەنێو دەبات. پشکێنەری مەزن بە مەسیح دەڵێ: «تۆ تاقە بەیداخێکی ڕەها کە دەیتوانی هەموانت بۆ ملکەچ بکات، یانی بەیداخی نانی زەمینیت لەپێناو نانی ئاسمانی ڕەت کردەوە... تۆ لە خاچ دانەبەزیت چونکە نەتدەویست بە پەرجو بە سەر مرۆڤەکاندا زاڵ ببیت، چونکە تۆ تینووی ئیمانی ئازادانە بوویت، تۆ عەشقی ئازادانەت دەویست، نەک شور و شەوقی کۆیلەکان لەئاست هێزێک کە ئەفسوونی کردوون. بەڵام تۆ زۆر گرنگیت بە مرۆڤ دا، مرۆڤەکان ئەگەرچی سەرکێشی دەکەن، بەڵام کۆیلەن.»

بۆ دۆستێڤسکی، سێ پەرجو بریتین لە: سۆسیالیزمی بەدەر لە ئیمان، دامەزراندنی یوتۆپیایی دنیایی و لەنێو بردنی ئـازادی مـرۆڤ. بەوتەیەکی تر، مەبەست بەدیهاتنی جڤاتێکە کە لەودا نە ئەرک و بەرپرسراوی هەیە، نە ژان و ئازارێک، نە وشیاری و مافی هەڵبژاردن. وەها جڤاتێک سەرئەنجام بە کوشتنی باوک و دەسەڵاتی حەزی ئاگرین کۆتایی دێت (سەمەردیاکۆف بە قسەی ئیڤان سەرئەنجام باوکی خۆی دەکوژێ). ئاخر ئەگەر ڕێبەرانی شۆڕش ڕۆشنبیرانێکی وەکوو ئیڤانن، بەڕێوەبەرانی چەند کۆیلەیەکی بێ ناوونیشانی وەکوو دیاکۆفن، دیاکۆف هێمای حەزی ئاگرینی مرۆڤە.

بەڵام دیالکتیکی مەنفی دۆستێڤسکی لەمەش واوەتر دەچێ. ئەگەر لوتکەی سەرکێشی لە کۆتایی دا بە حکومەتی ئەقڵی ئۆقلیدۆسی و دەسەڵاتی پشکێنەری مەزن دەگـات، ستاڤرۆگین قارەمانی ڕۆمانی ئەهریمەنان، بریتییە لە قۆناغی ڕەتکردنەوەی کۆتایی یان سەنتێز. بە وتـەی «توماس مان» ستاڤرۆگین «سامناکترین و سەرنجڕاکێشترین سیمای ئەدەبیاتی جیهانە.» هەموو قارەمانانی تری ڕۆمانی ئەهریمەنان، وەکوو مانگ بە دەوری ئەم هەتاوە نـادیـارەدا دەسوڕێنەوە، هەموویان بەشێوەیەک هێما و نیشانەی وەها ئەکتەرێکی سەیرن. هەر لە «شاتۆف»ی راستگۆ تا «ڤۆرخۆنسکی» پەست و توندڕەو ، هەر لە «کیریلیۆف»ی شێت و بێ تاوان کە دەیەوێ خۆی بکوژێ تا بیسەلمێنی کە خـودا بوونی نییە، هەموویان هێما و نیشانەی ستاڤرۆگینن؛ خودی ستاڤرۆگینیش ئەکتەرێکی ئاڵۆز و پرۆبلماتیکە کە هەموو ئەم قۆناغانەی تێپەڕاندووە و ئیتر بـڕوای بە هیچ، تەنانەت بە بێ بڕواییش نەماوە، ستاڤرۆگین بەجۆرێک لە هەر جۆرە بیر و مەکتەب و مەرامێک دابڕاوە کە دەڵێی مرۆڤ نییە، تارماییە.

کیریلیۆف لەمەر ستاڤرۆگین دبێژێ: «ئەو ئەسیری بیرێکی حەزاوی بوو: هەر کات بڕوای هەبوو، بڕوای بە بڕواکەی نەبوو، هەر کات بڕوای نەبوو، بڕوای بە بێ بڕوایی خۆی نەبوو.» نهێلیزم لەگەڵ ستاڤرۆگین بە دوا قۆناغی دەسەڵاتی خۆی دەگات، بەجۆرێک کە نە بڕوا دەمێنێ، نە بێ بڕوایی، یانی هەر دوو لە گێژەنی گومان دا قەتیس دەبن و سەرئەنجام ئەم ناکۆکییە بە حاشا لە حاشا (ڕەتکردنەوەی ڕەتکردنەوە) دەگـات. ئەمە هەر ئەو شتەیە کە دەکرێ بە ئەبسۆرد/ پووچی پێناسەی بکەین. ئەو سەرکێشییە کە بە راسکۆلنیکۆف دەستی پێکرد، بەشێنەیی پەرە دەستێنێ و سەرئەنجام خودا و پاشان دنیا ڕەت دەکاتەوە و بە دەسەڵاتی ئەقڵی ئۆقلیدۆسی دەگات، ئەوجار هانگاوێک ئەولاتر دەڕوات و ڕەتکردنەوەش ڕەت دەکاتەوە و هەموو شتێک لە گێژەنی گومان و پووچی دا قەتیس دەکات. ئەگەر پشکێنەری مەزن تەشقی سەرکێشی و حکومەتی ئەقڵی ئۆقلیدۆسی بێت، ستاڤرۆگین قۆناغێکە کە لە سەرکێشی واوەتـر دەچێت، ئاخر ئیتر شتێک نەماوە کە ڕەت بکرێتەوە و لێرەدا دیالێکتێکی مەنفی لەخۆڕا هەڵدەوەشێتەوە. بەمجۆرە دەتوانین بێژین کە داستایڤسکی نە هەر ئایندەی ڕووسیای پێشبینی کرد، بەڵکوو دواین ئاکامی دیالێکتێکی مەنفیشی دەرخست...

سەرچاوە: اسیا در برابر غرب، داریوش شایگان، نشر امیر کبیر، تهران ١٣٨٨، صص ٣٠- ٣٩.

# زمانی چیا

نووسینی: هارۆڵد پنتەر
و. لە فارسییەوە: مەجیدساڵح

کەسایەتیەکان (ژنێکی گەنج، پیرەژنێک، عەریف، ئەفسەر، چاوش، زیندانی، پیاوە تورەکە لەسەرەکە، چاوشی دووەم)

١.دیواری زیندان

(ڕیزێک ژن وەستاون، پیرەژنێک دەستێکی لە ملدایە. سەبەتەیەکی لە لای پێی داناوە. ژنە گەنجەکە بە هەردوو دەستی کەمەری پیرەژنەکەی گرتوە. چاوش دێتە ژورەوەو بە دوایدا ئەفەسەرەکە دێت. چاوش ئاماژە بە ژنە گەنجەکە دەکات)

چاوش: ناوت؟

ژنە گەنجەکە: پێشتر ناوی خۆمم وتوە.

چاوش: ناوت؟



هارۆلد پنتەر

ژنە گەنجەکە: پێشتر ناوی خۆمم وتوە.

چاوش: ناوت؟

ئەفسەر: (بە چاوش) وازبێنە (بە ژنە گەنجەکە) سکاڵات هەیە؟

ژنە گەنجەکە: گازیان لێگرتوە.

ئەفسەر: گاز لە کێ گیراوە؟ (وەستان) گازیان لە کێ گرتوە؟

ژنە گەنجەکە: ئەوە. دەستیان شی کردوەتەوە. سەیری بکەن. دەستی بریندارە. ئەوەش خوێنەکەیەتی.

چاوش: (روو لە ژنە گەنجەکە دەکات) ناوت چییە؟

ئەفسەر: دەمت داخە. (دەچێتە لای پیرە ژنەکە) دەستت چیەتی؟ کەسێک گازی لە دەستت گرتوە؟ (ژنەکە بە ئارامی دەستی بەرز دەکاتەوە، ئەفسەرەکە بە وردی سەیری دەستی ژنەکە دەکات) کێ ئەوەی کردوە؟ کێ گازی لێت گرتوە؟

ژنە گەنجەکە: سەگێکی زەبەلاح.

ئەفسەر: کامیان؟ (وەستان) کامیان؟ (وەستان) چاوش! (چاوش دێتە پێشەوە).

چاوش: گەورەم!

ئەفسەر: سەیری دەستی ئەو ژنە بکە. خەریکە پەنجە گەورەی لە لەپی دەستی دەبێتەوە. (بە پیرەژن) کێ وای کردوە؟ (پیرەژن سەیری دەکات) کێ ئەو کارەی کردوە.

ژنە گەنجەکە: سەگێکی زەبەلاح.

ئەفسەر: ناوچی چی بوو؟ (وەستان) ناوی چی بوو؟ (وەستان) هەموو سەگەکان ناوی خۆیان هەیە.

باوکیان ناویان دەنێن و ئیتر بەو ناوە بانگ دەکرێن.
پێش ئەوەی گاز بگرن دەبێ سەگەکان ناوی خۆیان بڵێن. ئەوە رێوشوێنێکی ڕەسمیە. پێش ئەوەی گاز بگرن دەبێ سەگەکان ناوی خۆیان بڵێن. ناوچی چی بوو؟ ئەگەر پێم بڵێ یەکێک لە سەگەکانمان گازی لەو پیرەژنە گرتوە، بێ ئەوەی ناوی خۆی بڵێت، هەر ئێستا تیربارانی دەکەم. چاوش!

چاوش: گەورەم!

ئەفسەر: هەرکەسێک سکاڵای هەیە بینوسە.

چاویش: کەس سکاڵای هەیە؟ کەسێک هەیە سکاڵای هەبێت؟

ژنە گەنجەکە: پێیان وتین سەعات نۆ لێرە ئامادەبین.

چاوش: راستە. زۆر راستە. سەعات نۆی ئەمڕۆ. زۆر راستە. سکاڵاکەت لە چییە؟

ژنە گەنجەکە: ئێمە سەعات نۆ هاتینە ئێرە. ئێستا سەعات پێنجە. هەشت سەعاتە لێرە بە پێوە وەستاوین. لەژێر بەفردا. پیاوەکانتان بۆ ترساندنمان سەگی «دوبرمن پینچر» تێبەرداوین. یەکێک لەوانە ئەو پیرەژنەی گەست.

ئەفسەر: ناوی ئەو سەگە چی بوو؟ (ژنەکە سەیری دەکات)

ژنەگەنجەکە: ناوەکەی نازانم.

چاوش: گەورەم رێگەم پێ ئەدەی؟

ئەفسەر: بڵێ بزانم.

چاوش: مێردەکانتان. باوک و کوڕەکانتان کە ئێوە چاوەڕێی بینینیان بوون، هەمویان گەن و گوون. دوژمنی حکومەتن. تەپاڵەن.

(ئەفسەر بەرەو لای ژنەکان دەچێ)

ئەفسەر: گوێم لێ بگرن. ئێوە خەڵکی شاخن. گوێتان لێیە چی دەڵێم؟ زمانی ئێوە مردوە. ئێوە بۆتان نییە بە زمانی چیاکان لێرە قسە بکەن. تێگەیشتن؟ لێرەدا بۆتان نییە لە گەڵ پیاوەکانتانا لێرە بەو زمانە قسە بکەن. ئەوە پێچەوانەی یاسایە. تێگەیشتن. ئێوە بۆتان نییە بەو زمانە قسە بکەن. نایاساییە. ئێوە تەنها دەتوانن بە زمانی ڕەسمی پایتەخت لەگەڵ یەکدا قسە بکەن. تەنها زمانێک کە بۆتان هەیە پێی قسە بکەن تەنیا ئەو زمانەیە. ئەگەر بتانەوێت لێرە بە زمانە چیاییەکەتان قسە بکەن، سزای توند دەدرێن. ئەوە فەرمانێکی سەربازیە. یاساییە. زمانەکەی ئێوە مردوە و کەس بۆی نییە بەو زمانەی ئێوە قسە بکات. زمانەکەتان ئیتر نەماوە. پرسیارتان نییە؟

ژنە گەنجەکە: من بە زمانی چیاکان قسە ناکەم.

(وەستان، ئەفسەرەکە بە هێمنی بەدەوری ژنەکەدا دەسوڕێتەوە. چاوش دەست دەخاتە سەر سمتی)

چاوش: ئەی بە چ زمانێک قسە دەکەی؟ ئەی سمتەکانت بە چ زمانێک قسە دەکەن؟

ئەفسەر: چاوش! لە بیرت نەچێ ئەو ژنانە هێشتا تاوانبار نین.

چاوش: گەورەم! خۆ ناشتانەوێت بڵێن بێ گوناهن؟

ئەفسەر: ئاە، نەخێر! مەبەستم ئەوە نەبوو.

چاوش: ئەمەیان زۆر گوناهبارە. ئەوەندە گوناهبارە ئاوساوە.

ئەفسەر: ئەوە بە زمانی چیا قسە ناکات.

(ژنەکە دەستی چاوشەکە لەسەر سمیتی لادەدات و

روویان تێدەکات)

ژنە گەنجەکە: ناوم سارا جونسنە. هاتوم مێردەکم ببینم. ئەوە مافی خۆمە. ئەو لە کوێیە؟

ئەفسەر: با بەڵگەنامەکانت ببینم.

(ژنەکە کاغەزێکی پیشان دەدات. ئەفسەرەکە تەماشای دەکات، ڕوو لە چاوش دەکات) مێردەکەی خەڵکی چیاکان نییە. لەو جەماعەتە نییە. هەڵەیەک ڕوویداوە.

چاوش: ژنەکەشی هەروەها. ڕوخساری لە ڕو□شنبیرە سەگبابەکان دەچێ.

ئەفسەر: بەڵام تۆ وتت سمتەکانی دەلەرزنەوە.

چاوش: سمتی رۆشنبیرەکان لە هەموو کەسێک باشتر دەلەرزنەوە.

(تاریکی)

٢. ژوری چاوپێکەوتن

(زیندانیەکە دانیشتوە. پیرەژنەکەش دانیشتوەو سەبەتەیەکی بە دەستەوە. پاسەوان لە پشتی ژنەکەوە ڕاوەستاوە. زیندانیەکەو پیرە ژنەکە بە زمانی ناوچەیی خۆیان دەدوێن)

پیرەژن: نانم بۆت هێناوە... (پاسەوانەکە بەدارەکە ئەژەنێ پێوەی)

پاسەوان: قەدەغەیە، ئەو زمانە قەدەغەیە. (پیرەژنەکە سەیری دەکات، پاسەوانەکە بەدارەکە ئەژەنێ پێوەی) قەدەغەیە! (بە زیندانی) پێی بڵێ بە زمانی پایتەخت قسە بکات.

زیندانی: نازانێت بەو زمانە قسە بکات (وەستان) نازانێت بەو زمانە قسە بکات (وەستان).

پیرەژن: سێویشم بۆت هێناوە... (پاسەوانەکە بەدارەکە ئەژەنێ پێوەی و دەنەڕێنێ)

پاسەوان: قەدەغەکراوە! قەدەغەیە. ئەی خوای گەورە! (بە زیندانی) ئەو ژنە تێ ناگات من چی دەڵێم؟

زیندانی: نە

پاسەوان: تێ ناگات؟ (بەسەر پیرە ژنەکەدا دەچەمێتەوە) تێناگەی؟ (پیرەژن سەیری دەکات)

زیندانی: ئەو پیر بووە تێناگات.

پاسەوان: خەتای کێییە؟ (پێدەکەنێ) ئەتوانم پێت بڵێم خەتای من نییە، ئەمەوێت، ئەمەوێت شتێکی دیکەت پێ بڵێم. من ژنێک و سێ منداڵم هەیە. ئێوەش هەموتان گەن و گون.

(وەستان)

زیندانی: منیش ژنێک و سێ منداڵم هەیە.

پاسەوان: چیت هەیە؟ (وەستان) تۆ چیت هەیە؟ (وەستان) تۆ چیت پێم وت؟ (وەستان) تۆ چیت هەیە؟ (تەلەفونەکە هەڵدەگرێت و یەک ژمارە لێدەدات) چاوش؟ من لە ژوورە شینەکەدام... بەڵێ... پێم باش بوو ئەو هەواڵەتان پێ بڵێم.. پێم وایە لێرە موهەڕیجێکمان هەیە.

(روناکی کز دەبێت و کەسکەکان لە شوێنی خۆیاندا ناجوڵێن و ئەم تۆماری دەنگیە دەبیسترێت)

دەنگی پیرەژن: منداڵە ساواکەت چاوەڕوانتە.

دەنگی زیندانی: گازیان لە دەستت گرتوە.

دەنگی پیرەژن: هەمویان چاوەڕێی تۆن.

دەنگی زیندانی: ئەوان گازیان لە دەستی دایکم

گرتوە.
دەنگی پیرەژن: کاتێک بگەڕێیتەوە بۆماڵەوە بە گەرمی پێشوازیت لێدەکەن. هەمویان چاوەڕوانی تۆن. هەر هەمویان لە چاوەڕوانی تۆدان. هەمویان دەیانەوێت بت بینن.
(روناکیەکە زیاد دەبێت، چاوش دێتە ژورەوە)
چاوش: کوا موهەڕیجەکە
(تاریکی)
٣. دەنگێک لە تاریکیدا
دەنگی چاوش: ئەم ژنە نەعلەتیە کێیەو کێ هێناویەتیە ئێرە. کێ رێگەی داوە ئەو سۆزانیە بەو دەرگا نەفرەتیەدا بێتە ژورەوە.
دەنگی پاسەوانی دووەم: ئەوە ژنەکەیەتی.
(روناکی هەڵدەکرێت، لە رێڕەوێکدا چاوش و پاسەوانەکەو پیاوێک کە تورەکەیەکی لەسەردایەو خۆی داوەتە سەر شانی پاسەوان و چاوشەکەدا، ژنە گەنجەکە لە دورەوە لێیان ڕاماوە)
چاوش: ئەمەیان چییە؟ بۆ خاتو «داک ماک» ئاهەنگ سازدراوە؟ ئەی شامپانیاکە لە کوێیە؟ سەگی سەگبابینە کوا شامپانیا بۆ خاتون خانم.
(لە ژنە گەنجەکە نزیک دەبێتەوە) سڵاو خاتون. لێمان ببورە. هەندێک هەڵەی ئیداری ڕویداوە. ئێوەیان لە دەرگایەکی هەڵەوە هێناوە. باوەڕ ناکەم، ئەوەی کردوە بە سزای خۆی دەگات. بە هەرحاڵ، وەک چۆن جاران لە فیلمەکاندا دەیانوت ئەتوانم خزمەتتان بکەم خاتون»؟
(روناکی کز دەبێت ئەکتەرەکان لە جێگەی خۆیاندا وشک دەبن، لەسەرەوە دەنگ دێتە گوێ)
دەنگی پیاوەکە: کە لە خەودا دەتبینم، چاوەکانت دەکەیتەوەو بۆم پێدەکەنی و منیش پێدەکەنم.
دەنگی ژنە گەنجەکە: تۆ پێدەکەنی. کاتێک چاوەکانم دەکەمەوە، تۆ دەبینم و پێدەکەنم.
دەنگی پیاوەکە: لە دەریاچەکە سواری بەلەمێک دەبین.
دەنگی ژنە گەنجەکە: لە بەهاردا.
دەنگی پیاوەکە: من تۆ لەباوەش دەگرم و گەرمت دەکەمەوە.
دەنگی ژنە گەنجەکە: کاتێک چاوەکانم دەکەمەوە تۆ بەسەر سەرمەوە دەبینم و بۆم پێدەکەنی.
(ڕوناکیەکە دەگەڕێتەوە. پیاوە تورەکە لەسەرەکە بەردەبێتەوە. ژنە گەنجەکە دەقیژێنێت)
ژنە گەنجەکە: چارلی!
(چاوش چەقەنەیەک لێدەداو پاسەوان پیاوەکە پەلکێش دەکاتە دەرەوە)
چاوش: بەڵێ تۆ لە دەرگایەکی هەڵەوە هاتویتەتە ژوورەوە. دیارە هەڵەی کۆمپیوتەرە. توشی فتق هاتوە. گوێبگرە ئەگەر ئەتەوێت زانیاریت سەبارەت بە ئێرە دەسکەوێت، پیاوێک هەیە هەموو ڕۆژانی سێ شەمە دێت بۆ ئێرە.... هەڵبەت جگە لەو ڕۆژانەی باران دەبارێت. زۆر گرنگی بەم بابەتانە دەدات، پەیوەندی پێوە بکەو هەموو زانیاریەکت پێدەدات. ناوی (دوکس) ە، جوزیف دوکس.
ژنە گەنجەکە: ئەو جوزیف دۆکسە لە گەڵمدا جوت دەبێ؟ ئەگەر ئەوە بکات هەموو شتێک جێبەجێ

دەبێ؟

چاوش: بە دڵنیاییەوە.

ژنە گەنجەکە: سوپاستان دەکەم.

(تاریکی)

٤. ژوری چاوپێکەوتن

(پاسەوان، پیرەژن، زیندانی)

(وەستان)

(دەموچاوی زیندانیەکە خویناویە. بە لەرزە لەرز لەسەر کورسیەکە دادەنیشێ. پیرەژنەکە ئارام و بێدەنگە. پاسەوان لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکات. دەگەڕێتەوە سەیریان دەکات)

پاسەوان: ئاه، بیرم چو پێت بڵێم. ئەوان یاساکەیان گو□ڕی. ئەو دەتوانێ بە زمانی خۆتان قسەت لە گەڵدا بکات. تا فەرمانی داهاتومان بۆ دێت.

زیندانی: ئەو دەتوانێت قسە بکات؟

پاسەوان: بەڵێ. تا فەرمانی نوێمان بۆ دێت.

(وەستان)

زیندانی: دایکە، دەتوانی قسە بکەی.

(وەستان)

دایکە، لە گەڵ تۆدا قسە دەکەم! دەتوانین قسە بکەین. تۆ دەتوانی بە زمانی خۆمان قسەم لە گەڵدا بکەی.

(ژنەکە ناجولێت)

دەتوانی قسە بکەی

(وەستان)

دایکە گوێت لێمە؟ ئەوەتا من بە زمانی خۆمان قسەت لە گەڵدا دەکەم.

(وەستان)

گوێت لە دەنگمە؟ (وەستان) ئەوەتا بە زمانی خۆمان قسە دەکەم. (وەستان) گوێت لێمە؟ گوێت لە دەنگمە؟ (ژنەکە وەڵامی نییە)

پاسەوان: پێی بڵێ با بە زمانی خۆتان قسەت لە گەڵدا بکات. ئەوە یاسای نوێیە. تا فەرمانی نوێمان بۆ دێت.

(پیرە ژنەکە بێ وەڵامە. ناجولێت. زیندانیەکە زیاتر لەرزی لێدێت. لەسەر کورسیەکە بە ئەژنۆکانیدا بەردەبێتەوە... هەناسەی سورا دەبێت و چاوش دێتە ژورەوە، سەیرێکی زیندانیەکە دەکات)

چاوش: (بە پاسەوان) سەیر ناکەیت. بە هەموو توانایەکمانەوە هەوڵدەدەین یارمەتیان بدەین، کەچی ئەمانە هەر ناڕازین.

(تاریکی)

کۆتایی

بۆیەکەمجار ئەم شانۆیە لە ١٩٨٨/١٠/٢٠ لە سەر شانۆی نیشتیمانی لەندەن لە دەرهێنانی خودی هارۆڵد پنتەر نمایشکرا.

- سود لە وەرگێڕانە فارسیەکەی کە لە لایەن «رەزا سرور»ەوە کراوەتە فارسی و وەرگێڕانە عەرەبیەکەی کە لە لایەن « د. نهاد صليحه «وەرگێڕاوە، وەرگیراوە.

# ویستگەکانی سەردەم

* کۆچی دوایی ڤاتسلاف هاڤل
* بۆریس باسترناک
* نامەکانی لۆرکا
* پەخشە وەرزیەکانی سابڵاخ
* بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم



# کۆچی دوایی ڤاتسلاڤ هاڤل شانۆنوس و سەرۆکی دەوڵەت

نووسینی: سەلاح سلێمان
و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

ڤاتسلاڤ هاڤل، نوسەری شانۆو شاعیرو سەرۆکی دەوڵـەت، کۆچی دوایـی کرد، ڕۆماننوس‌و سیاسی‌و تێکۆشەری چیکی لە ١٨ دێسەمبەری ئەم ساڵداو لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا، ماڵئاوایی لە دنیا کردو لە دوای خۆیەوە مێژویەکی پڕ درەوشانەوەی ئەدەبی‌و سیاسی‌و ئەخلاقی بەجێهێشت. ئەم سەرکردەیە لە ڕزگارکردنی وڵاتەکەی لـە چنگی حـوکـمـی ڕەهـا، ڕۆڵێکی ئاشتیخوازانەی مەزنی بینی، لەم ڕۆڵەیدا ڕۆشنبیریەکەی‌و داهێنانەکانی، هەستوسۆزی خەڵکی بزواندو ناڕەزاییەکانی خەڵکی دژ بە حوکمی شیوعی جۆشدا.

**وتارەکەی لە ٢٠٠٢ کە لە نیۆیۆرکو بە بۆنەی دواهەمین سەردانی بۆ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، وەك سەرۆکی کۆماری چیك، لە ناوەندە ئەدەبیو سیاسییەکاندا ناوبانگێکی باشی پەیداکرد. دواتر ئەم وتارە لە ٢٤ تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٢، لەژێر ناونیشانی (ماڵئاوا ئەی سیاسەت)لە گۆڤاری بەناوبانگ (نیۆیۆرك بۆ پێداچونەوەی کتێبەکان) بڵاوکرایەوە.**



ڤاتسلاف هاڤل

شانۆنامەو وتارەکانی، لەوەدا سەرکەوتوبوون توانیان گەلی چیکی لەدەوری شۆڕشی پرتەقاڵی کۆبکاتەوە، کە دواجار لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٩ سەرکەوتنی بەدەستهێنا. لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنەدا هاڤڵ لە ٢٩ کانونی دووەمی ساڵی ١٩٨٩ تاکو تەموزی ساڵی ١٩٩٢ بووە سەرۆکی چیکسلۆڤاکیا، پاشان دوای جیابونەوەی کۆماری چیک لە سلۆڤینیا، هاڤل لە نێوان ساڵانی ١٩٩٣ بۆ ٢٠٠٣ بووە سەرۆکی کۆماری چیک. تێکرای جیهان ڕێزو ستایشێکی گەورەیان بۆ ڕۆشنبیرییەکەی هاڤل هەبوو

کە وایکرد هاڤل خەڵاتی گاندی بۆ ئاشتی وەربگرێت کە خەڵاتێکی ئاست بەرزە. دەستنیشانکردنی هاڤل بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە، لە ئەنجامی ئەو بەشداریکردنو کۆمەکانەی (هاڤل) ەوە بوو بەرامبەر بە کێشەکانی ئاشتی جیهانیو پابەندبونی بە مافەکانی مرۆڤەوە لە دژوارترینو سەختترین کاتوساتەکاندا، ئەمەش لە میانەی گرتنەبەری هەمو ئەو ڕێچکەو شێوازانەی سەرۆکی کۆچکردوی هیند "گاندی" گرتبونیەبەر. گواستنەوەی لە جیهانی بەرزو بڵندی ئەدەبەوە بۆ جیهانی سیاسەتی ئاڵۆزو پڕ کێشمەکێش، تا هیواو

ئاواتی گەلەکەی بێنێتەدی، هیچ نەبوو جگە لە کارێکی بەرزو شکۆمەندانەو وایکرد وڵاتەکەی لەسەر ڕێگای ڕاست دابنێت. کاتێک پەیامەکەی خۆی گەیاندو ماوەی سەرۆکایەتەکەی تەواو بوو، جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ جیهانی ئەدەبو تا ئەو کاتەی ماڵئاوایی کرد تێیدا مایەوە. ئەو بووەتە مەشخەڵێک بۆ هەموو ئەوانەی لە جیهاندا بەدوای ئازادیدا دەگەڕێن.

یەکەم شانۆنامەی هاڤل کە ناونیشانەکەی (ئاهەنگێک لە باخچەیەکدا) بوو، ساڵی ١٩٦٣ لەسەر شانۆ نمایشکراو تێیدا ڕەخنەی لە سیستمی شمولی گرتوەو شانۆنامەکە سەر بە شانۆی بێهودەیی بوو. ئەم شانۆنامەیە لەگەڵ وتارو نوسینەکانی دیکەیدا، بوونە هۆکاری ئەوەی چوار ساڵ زیندانی بکرێت، چونکە هەمیشە ڕەخنەی لە شوعییەت گرتووەو هیواداربووە وڵاتەکەی لەژێر ئەو میراتە قورسەدا ڕزگار بکات. ئەم نوسەرە لەگەڵ ئەسکەندەر دۆبێتشک، لە (بەهاری پراگ) ڕۆڵێکی گەورەو بەرچاوی بینیوە. دواتر لە نوسینەوەو داڕشتنی ئەو یاداشتنامەیەی پێیدەوترێت (یاداشتنامەی ٧٧) بەشداری کردووە، ئەم یاداشتنامەیە دژ بە سەرکوتکرنی نارەزاییەکان نوسرا. دواتر لە ساڵی ١٩٧٩ بەشداری لە دامەزراندنی (لیژنەی بەرگریکردن لە چەوساوەکان) کردووە.

هاڤل لە ماوەی حوکمڕانییەکەیدا، ڕۆحی ناسکی ئەدەبو ڕۆحی قورسی سیاسەتی تێکەڵ بەیەککردبوو. سەرکردە شوعییەکان لە ساڵی

**سەرکەوتنی شۆڕشی پرتەقاڵی لە چیکسلۆفاکیا، هەڵگری هیواو ئاواتێکی گەورەبوو لە پێناو هێنانەئارای جیهانێك زیاتر مرۆڤانەتربێت. جیهانێك تێیدا ڤتسلاڤ هاڤل هەوڵیدەدا شاعیرەکانو ئەدیبەکانو رۆشنبیران دەنگیان بیستراوبێت. لە جوانترین ئەو گوزارشتانەی کە ڤتسلاڤ دەریبڕیوە، ئەو پرسیارەیە کە لە خودی خۆی کردووە، لەو پرسیارەدا دەڵێ ئایا بە هۆی ئەو ١٣ ساڵەی لە سەرۆکایەتیدا بەسەرمبردووە، گۆڕاوم؟ دواتر هەر خۆی لە ڕەخنەگرتنێکی ڕوونو ئاشکرای پڕ لە ڕاستگۆیدا کە ئێرەیی پێدەبرێت، وەڵامی خۆیدەداتەوەو دەڵێ بە پێچەوانەی ئەوەی تێگەشتبووم، لەوبڕوایەدابووم ئەو پۆستە گەورەیە دڵنیاییو متمانەیەکی زیاترم پێدەبەخشێت، کەچی بۆیدەرکەوتووە متمانەی بەخۆی کەمتربووەتەوەو لە جاران سادەترو خاکیتر بووە**

١٩٦٩ و دوای سەرکوتکردنی خۆپیشاندانەکانی بەهاری پراگی ساڵی ١٩٦٨، لێنەگەڕان وەک نوسەر کاربکات. بۆیە ناچاربوو لە کارگەیەکی دروستکردنی بیرەدا، کارێکی دەستی بکات. پاشان بزوتنەوەیەکی ئاشتیخوازانەی دامەزراند کە دواتر بە شۆڕشی پرتەقاڵی ناسرا، ئەم بزوتنەوەیە بۆ ماوەیەکی درێژ، تێکۆشانێکی ئاشتیانەی دژ بە جەبەروتو هەیمەنەی حیزبی شیوعی بەرپاکرد.

وتارەکەی لە ٢٠٠٢ کە لە نیۆیۆرکو بە بۆنەی دواهەمین سەردانی بۆ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، وەک سەرۆکی کۆماری چیک، لە ناوەندە ئەدەبیو سیاسییەکاندا ناوبانگێکی باشی پەیداکرد. دواتر ئەم وتارە لە ٢٤ تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٢، لەژێر ناونیشانی (ماڵئاوا ئەی سیاسەت)لە گۆڤاری بەناوبانگ (نیۆیۆرک بۆ پێداچونەوەی کتێبەکان) بڵاوکرایەوە. وتارەکە وەک ماڵئاواییکردنێک لە سیاسەتو ڕەخنەگرتن لە خود بوو، ئەمە پێش ئەوەی جارێکی دی بگەڕێتەوە بۆ ڕەگوڕیشەی جیهانە ڕۆشنبیرییەکەی.

سەرکەوتنی شۆڕشی پرتەقاڵی لە چیکسلۆفاکیا، هەڵگری هیواو ئاواتێکی گەورەبوو لە پێناو هێنانەئارای جیهانێک زیاتر مرۆڤانەتربێت. جیهانێک تێیدا ڤتسلاڤ هاڤل هەوڵیدەدا شاعیرەکانو ئەدیبەکانو ڕۆشنبیران دەنگیان بیستراوبێت. لە جوانترین ئەو گوزارشتانەی کە ڤتسلاڤ دەریبڕیوە، ئەو پرسیارەیە کە لە خودی خۆی کردووە، لەو پرسیارەدا دەڵێ ئایا بە هۆی ئەو ١٣ ساڵەی لە سەرۆکایەتیدا بەسەرمبردووە، گۆڕاوم؟ دواتر هەر خۆی لە ڕەخنەگرتنێکی ڕوونو ئاشکرای پڕ لە ڕاستگۆیدا کە ئێرەیی پێدەبرێت، وەڵامی خۆیدەداتەوەو دەڵێ بە پێچەوانەی ئەوەی تێگەشتبووم، لەوبڕوایەدابووم ئەو پۆستە گەورەیە دڵنیاییو متمانەیەکی زیاترم پێدەبەخشێت، کەچی بۆیدەرکەوتووە متمانەی بەخۆی کەمتربووەتەوەو لە جاران سادەترو خاکیتر بووە. هەروەها پێیوابووە ڕووبەڕووبونەوەی جەماوەر بۆ ئەو ترسێکی گەورە بووە لەوەی نەتوانێ هیواکانیان بێنێتەدیو کێشەکانیان چارەسەر بکات.

لە دەربڕینێکی ئەدەبی جوانو نایابدا دەڵێ لەوە دەترسام خۆم دووبارە بکەمەوە، بە پێی توانا خۆم لە ڕاگەیاندنو میدیاکان دەشاردەوە، هەمو ئەوەش بە هۆی ئەو ترسە بێ پاساوەوە بوو کە لەناوەوەمدا هەستمپێدەکرد، ترسی ئەوەی ئەو دەرفەتە تێکبدەمو لای خەڵکی ببم بە کەسێکی بێزارکەر. تا ژمارەی دوژمنەکانم زیادی بکردایە، ئەوا لەناوەوەمدا دژی خۆمڕادەوەستام، بەم شێوەیە خۆم بوومە خراپترین دوژمنی خۆم.

هاڤل لە وتارەکەیدا لە نیۆیۆرکو پێش ئەوەی ماڵئاوایی لە جیهانی سیاسەت بکات، کۆمەڵێ پرسیاری لە بەرگێگی ئەدەبی نایابدا، خستەبەردەم گوێگرانو دەڵێ کاتێ چرکەساتی ڕاستەقینە دێتەپێشەوە، ئیدی من لەم جیهانەدا بم یان نەبم، هەستدەکەم بە کۆمەڵێ پرسیار دەورەدراوم، پرسیار

له نمونەی ئایا ئەم پیاوە چی کرد؟ چی بەدیهێنا؟ دەرئەنجامەکان چین؟ ئەو میراتە سیاسییە چییە بەجێیهێشتووە؟ سروشتی ئەو دەوڵەتە چییە لە دوای خۆیەوە بەجێیهێشتووە؟ ئابەم شێوەیە هەست بە شپرزەییەکی ڕۆحـی‌و فیکری دەکـەم‌و ڕۆحیٚ شـۆڕش داگیرمدەکات، ئەو ڕۆحـەی ناچاریکردم ڕووبـەڕووی سیستمی شمولی پێشو بوەستمەوەو برۆمە زیندانەوە. ئەوەیە وادەکات گومانێکی بەهێزم بە بەهای کاری تاکە کەسی مرۆڤ هەبێت.

ڕۆژی هەینی، ٢٠١١/١٢/٢٣، لە پراگی پایتەخت‌و لە ڕێوڕەسمی ناشتنی تەرمەکەیدا، ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانی جیهان ئامادەبوون. زۆربەی ئەوانەی لەو ڕێوڕەسمەدا بەشداربوون، ئاماژەیان بە ئازایەتی‌و قارەمانیەتی ئەو سەرۆکە کۆچکردووە کرد کە توانی بوێرانە ڕوبەڕووی شوعییەت بوەستێتەوە. وەزیری پێشوی دەرەوەی ئەمریکا مادلین ئۆلبرایت کە لە پراگ لەدایکبووە، بە زمانی چیکی ستایشی هاوڕیٚ کۆنەکەی کردو وتی: لای تۆ جەنگ لە پێناو ئازادی، ئامرازێک بوو بۆ گەیشتن بە شێکی بەرزو بڵندتر کە حەقیقەتە.

سەرۆکی فەرەنسا سارکۆزی‌و سـەرەک وەزیرانی بەریتانیا دیڤد کامیرۆن، ئامادەی ئەو قوداسە بـوون کە سەرۆکی قەشەکانی پـراگ پێیهەستا. سارکۆزی لە وتەیەکیدا بۆ ڕۆژنامەنوسان دەڵیٚ: ئەمرۆ هەمو ئەوروپا لە پێناو یادی ڤاتسلاف هاڤل لە پراگ کۆدەبێتەوە. پەیامی ئەم پیاوە چی بوو؟ پەیامەکەی ئەوەبوو کە قەناعەتمان هەبێت‌و لە پێناویدا بجەنگین. بانگەواز بۆ گفتوگۆو ڕێزگرتن. سەیرکردنی ڕابردوو هەڵهێنجانی پەند بۆ داهاتوو. پاپا بینیدکتی شازدەهەم لە میانەی جێبەجێکردنی ڕێوڕەسمی قوداسەکەدا، نامەیەکی خوێندەوەو تێیدا دەڵیٚ: لەبیرمانە چۆن بەڕێز هاڤل بەو پەڕی بوێری‌و ئازایەتییەوە، بەرگری لە مافەکانی مرۆڤ کرد، ئەمە لە کاتێکدا بوو وڵاتەکەتان بە شێوەیەکی سیستماتیک‌و نەخشەبۆداڕێژراو، ئـەو مافانەی قەدەغەکردبوو.

ڕاوێژکاری ئەڵمانیا ئەنگێلا مێرکل کە ماوەیەک لە ژیانی لەژێر حوکمی شوعیەتدا بردووەتەسەر، لە نامەیەکی ماتەمینیدا، سەبارەت بە هاڤڵ دەڵیٚ: ئەو بە وشەو بە کردار خەڵکی بەرەو ئازادی برد. لە ڕێوڕەسمی ماتەمینیەکەدا سەرۆکی ئەڵمانیا کریستیان ڤۆڵف وەک نوێنەری وڵاتەکەی ئامادەبوو. هەروەها هێلاری کلینتۆنی وەزیری دەرەوەی ئەمریکاو هاوسەرەکەی بیل کلینتۆن بەشداریان لە ڕێوڕەسمی ماتەمینیەکەیدا کرد کە نزیکەی دوو کاتژمێری خایاند. هاوسەرەکەی‌و برایەکی ئامادەی سوتاندنی لاشەی هاڤل بوون، دوای سوتاندنی لاشەی هاڤل لە مەحرەقەی شترانیتس لە براگ، خۆڵەمێشەکەی لە گڵکۆی خێزانەکەیان‌و لە گۆڕستانی فینوهرادی دادەنرێت.

سەرچاوە: ایلاف، ٢٠١١/١٢/٢٢
الشرق الاوسط ٢٠١١/١٢/٢٤

# بۆریس باسترناك

نووسینی: عبدالاله عبدالقادر
و. له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

بۆریس باسترناک یەکێکە لە رۆماننوسە هەرە بەناوبانگەکانی سەدەی بیستەم، رووداوەکانی ژیانیو هەڵوێستە فیکرییەکانی، لە ناوەندە ڕۆشنبیریو سیاسییە نێودەوڵەتیەکاندا مشتومڕێکی گەورەی نایەوە، بەتایبەتی لە ململانێی نێوان هەردوو بەرەی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا کە جەنگی سارد لە نێوانیاندا لەئارادابوو. باسترناک نوسەرێکی روسیو شاعیرێکی بوێرە، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، بە دیاریکراوی لە ساڵی ١٨٩٠ لەدایکبووە. لەنێوان خوێندنی مۆسیقاو فەلسەفەدا خاوەنی چەندین بەهرە بووە.

**باسترناك لە ڕۆمانی دكتۆر زیفاگۆو لە میانەی پاڵەوانەكەی «زیفاگۆ» ناڕازیبونی خۆی بۆ شۆڕشی ڕوسی ڕاگەیاند، بگرە پێشبینی ڕوخاندنو لەناوچونی یەكێتی سۆڤیەتی كرد، دروست وەك ئەوەی ڕویدا. ڕەخنەگرانی سۆڤیەت هێرشیانكردە سەریو بە ناپاك لەقەڵەمیداندا، ئەمە لە كاتێكدابوو نوسەرانی جیهان كۆكبون لەسەر ئەوەی باسترناك بلیمەتێكی گەورەیە**


باسترناك

پاشان ڕوودەکاتە شیعرو ساڵی ١٩١٤ یەکەم دیوانی بەناونیشانی (دووانەیەک لە هەوردا) بڵاودەکاتەوە. دواتر تاکو ساڵی ١٩٢٢ بەردەوامدەبێت لەسەر بڵاوکردنەوەی سێ دیوانەکەی دیکەیو ڕایدەگەیەنێت: (شیعر پێوەرێکە بۆ پێوانەی ترپەی ژیان).

باسترناک لە کاروانە شیعریەکەیدا بەردەوام نەبوو، بۆیە ڕوویکردە نوسینی ڕۆمانو لە ساڵی ١٩٣١ یەکەم ڕۆمانی بەناونیشانی (ڕێگای ڕاست) بڵاوکردەوە، بەڵام سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا.

باسترناک پەرۆشیو حەماسی خۆی بۆ شۆڕشی ساڵی ١٩٠٥ نەشاردەوە، بگرە ئەو لایەنگری شۆڕشی بەلەشفیکی ساڵی ١٩١٧ بوو بە سەرۆکایەتی لینین. بەڵام زۆر بەخێرایی هەردوو شۆڕشەکەی وەک یەک ڕەتکردەوەو لە کاروانی خەباتی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی ناڕازیو بێزاربوو. لە حیزب جیابووەوەو ڕایگەیاند هەمو هەڵسوکەوتێکی هاوڕێیانی حیزب ڕەتدەکاتەوە. بەم شێوەیە لە چوارچێوەی ئەو گرنگیو بایەخدانە هاتەدەرەوە کە دەکرا دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت پێی ببەخشن، بەمەش بینیی بووەتە کەسێکی نەویستراو تەنانەت لەلایەن یەکێتی نوسەرانی سۆڤیەتیشەوە.

بەڵگەش بۆ ئەوە، ئەوەیە کاتێ لە ساڵی ١٩٥٧ ڕۆمانە نایابەکەی (دکتۆر زیفاگۆ)ی بڵاوکردەوە، یەکێتی نوسەرانی وڵاتەکەی ڕازینەبوون ڕۆمانەکە چاپبکرێتو لە هەمو جمهوریەتەکانی یەکێتی سۆڤیەتدا بڵاوبکرێتەوە، ناچار لە ڕۆما بڵاویکردەوە.

باسترناک بەهۆی ئەم کارەوە، لەلایەن دەسەڵاتدارنی سۆڤیەتەوە دووچاری چەوسانەوەیەکی تازە بوەوە، حکومەتی هەمو ئەو نوسخانەی لە ڕۆمانی دکتۆر زیفاگۆ گەشتبووە وڵات لەگەڵ کتێبەکانی دیکەیدا، دەستی بەسەراگرتنو پاشان خودی "باسترناک"ی لە یەکێتی سۆڤیەت دەرکرد.

ڕۆمانی دکتۆر زیفاگۆ لەسەر ئاستی جیهان،

یەکێکە لە شاکارە جوانەکانی ئەدەبی ڕۆمان لە سەدەی بیستەمدا. تاڕادەیەک بۆ هەمو زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراوە، دوای ساڵێک لە دەرچونی ڕۆمانەکەیو دوای ساڵێک لە دەرکردنی لە وڵاتەکەی، ئەکادیمای سویدی خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئەدەب پێبەخشی، وەلێ لەژێر فشارو هەڕەشەی دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت، ناچاربوو خەڵاتەکە ڕەتکاتەوە. بەڵام ئەمە نەبووە هۆی ئەوەی باسترناکو ڕۆمانە شاکارەکەی لە بازنەی ڕوناکیدا نەمێننەوە، ئەگەرچی باسترناک لە ساڵی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کرد.

ئەوەی لێرەدا جێگای سەرسوڕ□مانێکی گەورەیە، ئەوەیە خوێنەرانی روس تەنها لە ساڵی ١٩٨٧ ڕۆمانی دکتۆر زیفاگۆیان خوێندەوە، ئەمەش دوای ئەوەی لە مۆسکۆ بۆ یەکەمجار بە زمانی روسی بڵاوکرایەوە، پاشان تەواوی بەرهەمەکانی دیکەی بە زمانی ڕەسەنی خۆی بڵاوکرانەوە. باسترناک ژیانێکی دەوڵەمەند نەژیا، ئەو بۆ ئەوەی بژێوی ژیانی دەستکەوێت، ناچار بوو شاکارەکانی ڕۆمانی ئەدەبی جیهان وەرگێڕێتە سەر زمانی روسی. لە وەرگێڕانەکانیدا جەختی لەسەر کارەکانی شکسپیری ئینگلیزیو گۆتەی ئەڵمانی دەکرد.

باسترناک لە ڕۆمانی دکتۆر زیفاگۆو لە میانەی پاڵەوانەکەی "زیفاگۆ" ناڕازیبونی خۆی بۆ شۆڕشی ڕوسی ڕاگەیاند، بگرە پێشبینی ڕوخاندنو لەناوچونی یەکێتی سۆڤیەتی کرد، دروست وەک ئەوەی ڕویدا. ڕەخنەگرانی سۆڤیەت هێرشیانکردە سەریو بە ناپاک لەقەڵەمیداندا، ئەمە لە کاتێکدابوو نوسەرانی جیهان کۆکبون لەسەر ئەوەی باسترناک بلیمەتێکی گەورەیە.

سەرچاوە: عبدالالە عبدالقادر، ڕۆژنامەی البیان، ٢٠١١/٩/١٢

**کاتێ لە ساڵی ١٩٥٧ ڕۆمانە نایابەکەی (دکتۆر زیفاگۆ)ی بڵاوکردەوە، یەکێتی نوسەرانی وڵاتەکەی ڕازینەبوون ڕۆمانەکە چاپبکرێتو لە هەمو جمهوریەتەکانی یەکێتی سۆڤیەتدا بڵاوبکرێتەوە، ناچار لە ڕۆما بڵاویکردەوە. باسترناك بەهۆی ئەم کارەوە، لەلایەن دەسەڵاتدارنی سۆڤیەتەوە دووچاری چەوسانەوەیەکی تازە بووەوە، حکومەتی هەمو ئەو نوسخانەی لە ڕۆمانی دکتۆر زیفاگۆ گەشتبووە وڵات لەگەڵ کتێبەکانی دیکەیدا، دەستی بەسەراگرتنو پاشان خودی "باسترناك"ی لە یەکێتی سۆڤیەت دەرکرد**

# نامەکانی لۆرکا بۆ کەسوکاری

نووسینی: نەجم والی

و. لە عەرەبییەوە: سەردەم

دوای تێپەڕبونی زیاد لە حەفتا ساڵ بەسەر مەرگی شاعیری غەرناتە "فیدریکۆ گارسیا لۆرکا"، کەچی هێشتا دۆزینەوەی تەواوی میراتەکەی، مەسەلەیەکی گرنگو سەرنجڕاکێشەو یارمەتی ئاشکراکردنی هەندێ لایەنی دیکەی ژیانی ئەم شاعیرە کوژراوە دەدات. وەک حاڵی ئەم نامانەی بۆ کەسوکاری نوسیویەتیو ماوەیەک لەمەوبەر دۆزراونەتەوە. ئەم نامانەی لێرەدا چەند نمونەیەکی وەردەگێڕین، لایەنی مرۆڤانەی شاعیری ئەندەلوسیو بایەخدانی بە وردەکارییە بچوکەکانی ژیانی ڕۆژانەی، ئاشکرا دەکات.

**باسترناك لە ڕۆمانی دكتۆر زیفاگۆو لە میانەی پاڵەوانەكەی «زیفاگۆ» ناڕازیبونی خۆی بۆ شۆڕشی ڕوسی ڕاگەیاند، بگرە پێشبینی ڕوخاندنو لەناوچونی یەكێتی سۆڤیەتی كرد، دروست وەك ئەوەی ڕویدا. ڕەخنەگرانی سۆڤیەت هێرشیانكردە سەریو بە ناپاك لەقەڵەمیداندا، ئەمە لە كاتێكدابوو نوسەرانی جیهان كۆكبون لەسەر ئەوەی باسترناك بلیمەتێكی گەورەیە**



لۆركا

**بەشی ناوخۆیی خوێندکاران لە مەدرید. ١٩٢٠**

**دایكو باوكی ئازیز**

جارێ هەر لە مەدریدی خۆشەویستم، هەست بە ئیسراحەتێکی تەواو دەکەم، من زۆر دڵخۆشم، کاروبارەکانم بەو پەڕی باشییەوە جێبەجێ دەبێت. زیادەڕۆیی ناکەم گەر بڵێم سەرکەوتنی ڕاستەقینە بەدەستدەهێنم.. مەدرید تەنها شوێنە بۆ کارکردنو بۆ پەیداکردنی هاوڕێیەتی تازە.

دوێنێ لەگەڵ "خوان ڕامۆن خێمینیز" بووم، نوسینەکانمی زۆر بەدڵبوو، بە ڕادەیەک تکای لێکردم بەجێیانبێڵم تاکو بۆ هاوسەرەکەی بخوێنێتەوە. ئەو پیاوێکە گەرچی توشی لاوازیو کەمهێزی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی قسەخۆشە. بە "میگێل بیسارۆ" بڵێن کۆمەکی ئەو بەوەی لای "خوان ڕامۆن" باسیکردوم، جێگای ڕێزو خۆشەویستیە. دۆن "خوان ڕامۆن" بە ڕۆبێکی ڕەشەوە پێشوازی لێکردم، لەسەر قەنەفەیەکی پانوپۆڕ دانیشتین، ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی هەرکاتێ بتوانم، لەماڵەوە سەردانی بکەم، تاکو پێکەوە بخوێنینەوەو پیانۆ بژەنین. یەکتریمان خۆشویست.

شاعیرە گەنجەکان لە مەدرید، بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی هاتنی "تاگور"ی شاعیر دەکەن. بەڵام سەبارەت بە "مارکینا"، هەرچییەک بڵێم هێشتا کەمە، پێرێ شەو، بەشێوەی پیاهەڵدانێکی گەورە بە "مارتینیز سییرا"ی ناساندمو تا درەنگانێکی شەو لە (کامیرینۆ دی لا

بارسيناس) ماينەوە. ماركينا خانمە ئەكتەرێكی شۆخوشەنگە، هەمو ڕۆژێ لەگەڵمدا دێتەدەرەوەو بە سەرجەم خزمەكانيم دەناسێنێت. دوێنی "پيدرۆ دی ريبيدا"و "ژۆنيگا"م ناسی، ئەمەی دواييان خاوەنی درێژترين زمانە لە ژيانمدا ناسيبێتم.

دواجـار كاروبارەكانم بەشێوەيەكی زۆر ناياب بەڕێوەدەچێت، لە ساڵی ئايندەدا سەردانتان دەكەم، تاكو لە گومەزە سـورەكـەوە خـۆم فـڕێـدەم. من زۆر سەرقاڵی ئيشوكارم. تا بەيانی ماڵئاوايی لە كوڕەكەتان، فێدريكۆ، بكەن كە خۆشيدەوێن.

دەبوايە بەهێزێكی زۆرتـرەوە بمنوسيايە، بەڵام وردەكارييەكان بە ڕادەيەك زۆرە، هيچم نييە پێتانی بڵێمو بۆتانی باس بكەم.

سەلامم بۆ هەمو كورسييەكانی چاخانەی (ميدا)ی سەرسوڕهێن.

هەميشە بۆ من بمێنن.

## بەشـی ناوخـۆيی خوێنـدكـاران لـە مـەدريد. سـاڵـی ١٩٢١

ئازيزانم دايـەو بابە: دواجـار بەهۆی پەيوەندييە ديبلۆماسييەكانەوە، ئـەو سـەردانـەی بڕياربوو "تاگور"ی شاعير ئەنجاميبداتو پڕوپاگەندە دژ بە بەريتانيا بكات، ڕەتكرايەوە. بەڵێ زۆر بەداخەوە شاعيری گەورە نەهات، ئەم مەسەلەيە بۆ زۆرمان دەبێتە شوێنی پێناخۆش بوون. گەرچی من، بە ڕاستی دەڵێم، هەستم بە كەمەكێك ئيسراحەت كرد، وەك ئەوەی بارگرانييەك لەسەر شانم لاچوبێت، چونكە ئـەو بەرپرسيارەتيەی لەسەرم بـوو، بۆ ڕێكخستنی ئاهەنگەكە لە كۆمەڵگای خوێندكاراندا، زۆر گـەورە بوو. لەباتی ئەوە لە مانگی تشرينی يەكەمی داهاتودا دێت، ئەوكات هەمو شتێ زياتر ڕێكدەخرێو زياتر ئامادەباشی بۆ دەكرێت.

زۆر ئيشدەكەم، تەنها لە ڕۆژانی يەك شەممەندا، (وەك ئـەمـڕۆ) كەمەكێك پشو دەدەم، دەڕۆم لـە باخچەی سروشتی بيلازكيسيە (بـە نـاوی وێنەكێشی ئيسپانی بلازكيس ناونراوە- و،ع) پياسە دەكـەم. ئێستا ژەمی بەيانييەو سەندەويچێك بە دەستمەوەيە، لەگەڵ كۆمەڵێ لە هاوڕێيان كە لە شاعيریو مۆسيقارو ڕەخنەگر پێكهاتووە، پياسە دەكەين. ئێمە بە ڕێگاوەين بۆ سەر شاخەكان كە تا خۆرئاوابوون ناگەڕێينەوە..ئابەم شێوەيە من لەبەر خۆردا ڕەش دادەگەڕێم، وەك يەكێك لە ئەنگۆلا.

كتێبەكانم لە قۆناغی چاپكردنو كۆكردنەوەدايە، بەيانی بۆتان دەنـوسـمو بە دوورودرێـــژی باسی كتێبەكانتان بۆ دەكـەم، بڕيارمدا خـۆم ببم بە بڵاوكەرەوەی كتێبەكانم، ئەمەش دوای ئەوەی لەبەر

هەندێ هۆکاری لۆژیکی، "خوان ڕامۆن" قەناعەتی پێهێنام. بڕیارمدا بەشێکی گەورە بۆ هەڵبژاردەی شیعرە کۆنەکان تەرخان بکەم. ڕاستەخۆ دوای ئەوە، کتێبێکی دیکە بڵاودەکەمەوە کە لێرە لە مەدرید کارم تێداکردووەو کۆمەڵێ ئیشی تازەی ناوازە، لەسەر شێوەی سۆناتا، لەخۆدەگرێت. پێموایە ئەم کتێبە، لە هەمو ئەو کتێبانەی تا ئێستا بەرهەممهێناوە، پوختترو سەنگینترە. ئەم کتێبی دووەمە، کاریگەری زۆری دەبێت. لەوبڕوایەدام لە هەمو ئەوانەی لەسەر شیعر بەرهەمهاتووە، پێشکەوتوتردەبێت. ئەم کتێبە، بۆ شاعیرێکی وەک من، وەک یەکەم تاقیگە وادەبێ. بەڵام لەلایەکی دیکەوە کتێبێکی خۆشو سادەیە.

بەیانی یەکێک لەم سۆناتانە بە ناونیشانی (لە ئاوێنەکانەوە) دەنێرم بۆ لباکیتۆ( ئەم کەسە ناوی فرانسیسکۆ گارسیا لۆرکایەو برای لۆرکای شاعیرە-و تاکو ببینێت ئەوەی پێشتر خوێندبومانەوە، نەک تەنها لەئاست ئەمەی ئێستادا نییە، بەڵکو ئەوەی پێشتر نوسیومە درۆ بووە. لێتان دەپاڕێمەوە ١٥٠ بیزیت-م (دراوی ئیسانییە- و،ع) بۆ بنێرن، چونکە سەبارەت بە پارە تابڵێی حاڵم خراپەو کاتێکی زۆرم بێ پارە بردووەتەسەر، تاکو پێم نەڵێن دەستبڵاوە. شتی زۆرم بەسەر هاتووە، بۆ نمونە لەلایەن "ئەبانییز"ەوە پێشنیاری پێدانی پارەی بۆ کردم، بەڵام من گەرچی خاوەنی یەک سەنت نەبووم، وەلێ بە هۆی عیزەتی نەفسمەوە، ئەو پێشنیارە چەورەم ڕەتکردەوە. جگە لەوە لە تۆلیدۆ "دۆن فێرناندۆ"م بۆ ئێوارە خوانێک دەعوەتکرد، ناچار پێویست بوو بڕۆم بۆ لای "ئەبانییز"و داوای پارەی لێ بکەم بۆ هاوڕێیەک، پێمناخۆشە نەمتوانی دەمودەست پارەکەی بۆ بگەڕێنمەوە.

بەیانی قسەتان لەگەڵ دەکەم

سەلامم بۆ بەڕێز "ئەنتۆنیۆ سگیۆرا"، ماچی زۆرم بۆ براکانم، سەلامم بۆ خێزانەکەمان، ماچێکیش لە کوڕەکەتانەوە، فێدیریکۆ، بۆ هەردوکتان.

بەڕێز "فرناندۆ" قسەی لەبارەی "باکیتۆ"وە کردو زیاد لە پێویست ستایشی کرد.

### بۆینس ئایرس، ١٩٣٣

دایەو بابەی ئازیزو براکانم، لە ڕۆژی سێیەمی نیشتەجێبوونملەبۆینسئایریس،نامەکەتانمپێگەیشت، چەند پێی دڵخۆش بووم. من بەهۆی ئەو دیاریانەی لێرە وەریاندەگرمو بەهۆی ئەو خۆشگوزەرانیەی کە ڕۆژانە تێیدا دەژیم، شەرمەزارم. من بەهۆی ئەو یاوەریکردنە زۆرەو بەهۆی جەماوەرەوە، کەمەکێک

شەکەتم. لێرە، لەم شارە گەورەیەدا، ناوبانگی (پاڵەوانێ گاکان)م هەیە، پێش چەند شەوێک، ئامادەی کردنەوەی یەکێک لە شانۆکان بووم، کاتێ جەماوەر بینیمیان، دەستیانکرد بە چەپڵە لێدانو تەنها دوای کاتێکی درێژ لە چەپڵە لێدان ڕاوەستان. منیش پێویست بوو لە سەکۆی شانۆکەوە سوپازگوزاری خۆمیان بۆ دەربڕم، چرکەساتێکی ناخۆش تێپەڕی، چونکە ئەم شتانە، لە ژیانمدا، چاوەڕوان نەکراو بووە. ئەوە لە ڕۆژنامەکاندا دەبینن. هەر کە گەیشتمە مۆنتیفیدیۆی پایتەختی ئۆرۆگوای، هاتوهاوار لە دەوروبەرم دەستیپێکرد. لەوێ بینینی ڕۆژنامەنوسەکانی بۆینس ئایریس، بەلامەوە سەیربوو، ئەوان هاتبوون ڕیپۆرتاجێکم لەبارەوە بنوسن، نازانم چەند وێنەیان گرتم. باڵیۆزی ئەرجەنتین لە ئۆرۆگوای "کاندیۆ" لەگەڵ "مۆراس"ی خێزانی، بۆ بەخێرهاتنم سەرکەوتنە سەر کەشتییەکە، هەندێ خانم یاوەریان بوونو ئەلبومیان بەدەستەوەبوو تاکو بۆیان واژۆ بکەم، بێگومان لە پێشوازیکردنەکەدا ڕۆژنامەنوسان ئامادەبوون. هەموو ئەم بەخێرهاتنو پێشوازیکردنە، بە هۆی ئەو سەرکەوتنە بێ سنورەوە بوو کە (زەماوەندەکانی خوێن) بەدەستیهێنابوو. خەڵکی لێرە، لە ئەمریکای لاتین، شاعیر لەسەرو هەموو شتەکانی دیکەوە دادەنێنو خۆشیان دەوێت. بۆ ئێوە زەحمەتە، وێنەیەکی ئەوەی لێرە ڕویدا، بێننە پێش چاوی خۆتانو لەوە تێبگەن چۆن ئەمڕۆ لە لێکچەرێکدا، بە چێژو ورياييەوە گوێیان گرتبوو. لێرە، ڕۆژ نییە تێپەڕێتو تێیدا لە هەندێ خانمەوە نامەم بەدەست نەگات، لەنامەکاندا شتی جوانو بەپێزم پێدەڵێن، دەیانخوێننەوە. لە کەشتییەکەدا، لەنێوان مۆنتیفیدیۆو بۆینس ئایریسدا، بە چاوپێکەوتن کوشتیانم. کاتێ گەشتینە بۆینس ئایرس، ئاپۆرەیەکی گەورەی خەڵک، لەناو بەندەرەکە چاوەڕێبوون، لەنێویاندا وەزیری دەرەوەی کۆلۆمبیا، شاعیرو وێنەگران. دیمەنەکە بۆ من ترسناک بوو. لەسەروبەندی هاتنەخوارەوە لە کەشتییەکە، هەموان چەپڵەیان بۆ لێدام، لەناکاو گوێم لە دەنگێک بوو هاواریدەکرد: ئای! ئای! فێدریکۆ، فێدریکۆ! ئەوە دەنگی هاوسەرەکەی کۆکا بوو لەگەڵ منداڵەکەیدا، ماتلید+ش لە تەنیشتیانەوە بوو کە ژنی مام باستۆر بوو، هەروەها کۆمەڵە خەڵکێک لە فۆینتە باکیرۆسەوە هاتبوون (فۆینتە ئەو شارەی تێیدا شاعیر لەدایک بووە- و،ع). ڕۆژنامەکان دەخوێننەوە.

کاتێ وێنەگران وێنەی کۆمەڵە خەڵکەکەیانە گرت، دەستیانکرد بە گریانو دەیانوت: ئەو خەڵکی

گوندەکەمانە، خەڵکی گوندەکەمانە! خەڵکی فۆینتەیە! لێتان ناشارمەوە منیش دەستم بە گریان کردو فرمێسک بەچاوما هاتەخوارەوە. ئەوان بۆ ئەوەی ڕێگایان پێبدەن بێنە ناو بەندەرەکەوە، پێنج بیزیتیان دابوو، هەموو ئەو وێنانەیان بریبوو کە پێش گەیشتنم لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرابونەوە، من لەو حاڵەتەی ئەوان تێدەگەم. چونکە ئەوان ساڵانێکە کەسێکیان نەبینیوە لە گوندەکەیانەوە بێت، کەچی ئەوەتا من لەوێوە هاتووم. باوەڕیان نەدەکرد کە منیان بینیوە، کاتێ بینییان من بە خۆشحاڵییەوە پێشوازیان لێدەکەمو یەک دوای یەک ماچیان دەکەم، زۆر دڵخۆش بوون، لەو چرکەساتەوە، هەمو جیهان بەلای ئەوانەوە جوان بوو. هاوسەرەکەی کۆکا لێی پرسیم: دایکت سەبارەت بە من چی پێوتی؟ منیش پێم وت زۆر باش بیرت دەکات. دوای ئەوە هاتن بۆ ئوتێلەکە بۆلام، من لە ئوتێل کاستلار لە لا بینیدا دی مایۆ بووم کە یەکێکە لە ئوتێلە گەورەکانی بۆینس ئایریس.

ئەوان تابڵێی هەستوسۆزی منیان بزواند، چونکە بەرێزو پەرۆشییەکی گەورەوە باسی بابەیان دەکرد، لەدوورەوە هەستمکرد، هەڵسوکەوتیان هەڵسوکەوتێکی نمونەیی ئەفسانەییە، بۆ خۆشەویستیەکی مەزن کە مرۆڤ بۆ ماڵەکەی هەیەتی. کۆنجیتایان زۆر لەبیربوو، لە بەردەممدا، زیاد لە جارێک هاواریان بۆ ژیانی گوندەکە بەرزدەکردەوە.

ڕۆژی ٢٤، لەسەر شانۆی ئەبینیدا، ڕۆژی سەرلەنوێ کردنەوەی نمایشی (زەماوەندەکانی خوێن)ە، بلیتی شانۆگەریەکە بۆ سێ ڕۆژ فرۆشراوە. ئەمڕۆ مەسەلەکە زۆر گەورە دەبێت، بەهۆی ئەو ئاپۆرەیەی کە ئیسپانییەکان دەیجولێنن. بێگومان پێشوازییەکی هاوشێوەی ئەمە کراوم، بەڵام ئەوەی لێرە ڕویدا، لەسەروی چاوەڕوانییەکانەوە بوو. خانم "لۆلا میمبریس" ڕۆڵەکەی خۆی زۆر جوان بینی، خەڵکی لێرە وادەڵێن. باڵیۆزی ئیسپانیا کە پێنج یان شەش جار نمایشەکەی بینیوە، پێی وتم: "لۆلا" ڕۆڵەکەی هێجگار جوان بینی، "لۆلا" لە مەدرید بۆ یەکەمجار لەبەردەم جەماوەردا دەردەکەوێت، من تەواو دڵنیام، لەوێ لە مەدرید، وادەکات شانۆکە پڕ بێت لە بینەر. ماچی زۆرم بۆ براکانم، سەلامم بۆ خێزانەکە. لە کوڕەکەتانەوە، فیدیریکۆ، ماچێک بۆ هەردوکتان.

سەرچاوە: لاپەڕەی ڕۆشنبیری، ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، ژمارە ١١٨٩١، ٢٠١١/٦/١٩

# پەخشە وەرزیەکانی سابڵاخ لەساڵانی ١٩١١وە بۆ ١٩٢٨

نووسینی: دکتۆرە ئێدن نابی
و: لەئینگلیزیەوە عەبدولکەریم عوزێری

**پێشەکی نوسەر:**
لەئێستادا گرنگی شرۆڤەکردنی دیراساتی کوردی بەرەو فراوانکردن دەڕوات , ئەو زانستەی کە ئێستا- لەم سەردەمەدا- لە بەردەستماندایە بە کەم دەزانرێت لەبەر ئەوە زانست خوازانی ئەم دیراسەیە باسەکانیان قوڵتر دەکەن و شیکردنەوەی سیاسی ئەنجام دەدەن وە ڕاو بۆچونی جیاواز لێک دەدەنەوە. لە لایەکی تریشەوە زانایانی قاڵبووی ئەم بوارە زیاتر سەرنج دەدەنە مێژووی کولتووری کوردی.
ئەم باسەی کەئێستا دەخرێتە بەردەمی خوێنەواران بڕشتی چەند ساڵێک بەدواداچوون و گەڕانە بەشوێن چاپەمەنیە وەرزیە کوردیەکاندا (کەبەزمانی ئینگلزی پێیان دەگوترێ periodicals ).
باسەکەی من دەربارەی بڵاوکراوە کوردیەکان لەو هەوڵدانەدا بەرجەستەبوو کە بۆ بوژانەوە و پاراستنی ئەو چوار بڵاوکراوە ئاسورییەم

**لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، شاری ورمێ و دەوروبەری، ناوچەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش بوون بۆگەشەپێدانی مژدەی ئاینی مەسیحی لە نێو دانیشتوەکانیدا. ئەم سەرنج دانە بێ بنەما نەبووە بەڵکو "٧٥"ساڵ پێش دەستپێکردنی مژدەبەری بڕیاری لە سەر دەرچووبوو. بڕیارەکە لەشاری بۆستن، لەویلایەتی (ماساچوسیتس)ی ئەمریکی دەرچووە. بڕیارەکە سەرچاوەگیری شاندێکی ئەمریکی بوو کە لە ساڵی ١٨٢٩ دا. ئەم شاندە بە بڕیاری کومسیونی تەبشیری مەسیحی رەوانەی ئەو ناوچە کوردیە کرابوو**

**پێشەکی نوسەر:**

لەئێستادا گرنگی شرۆڤەکردنی دیراساتی کوردی بەرەو فراوانکردن دەڕوات , ئەو زانستەی کە ئێستا- لەم سەردەمەدا- لە بەردەستماندایە بە کەم دەزانرێت لەبەر ئەوە زانست خوازانی ئەم دیراسەیە باسەکانیان قوڵتر دەکەن و شیکردنەوەی سیاسی ئەنجام دەدەن وە ڕاو بۆچونی جیاواز لێک دەدەنەوە. لە لایەکی تریشەوە زانایانی قاڵبووی ئەم بوارە زیاتر سەرنج دەدەنە مێژووی کولتووری کوردی.

ئەم باسەی کەئێستا دەخرێتە بەردەمی خوێنەواران برشتی چەند ساڵێک بەدواداچوون و گەڕانە بەشوێن چاپەمەنیە وەرزیە کوردیەکاندا (کەبەزمانی ئینگلزی پێیان دەگوترێ periodicals ).

باسەکەی من دەربارەی بڵاوکراوە کوردیەکان لەو هەوڵدانەدا بەرجەستەبوو کە بۆ بوژانەوە و پاراستنی ئەو چوار بڵاوکراوە ئاسورییەم دەدا کە بەزمانی ئاسوری کوردستانی ڕۆژهەڵات دەرچووبوون لە شاری ورمێ (ورمێ لە زەمانی شاهەنشاهیداپێ ی دەوترا ڕەزائیە).

ئەم چاپەمەنیانە بەزمانی ئاسووری بەشێوە نوسینی ئارامی تازە Neo Aramic دەردەچــوون، وە بەستاندەری tutelage واتە بەئاستی مژدەبەرانی مەسیحی ئەمریکی- لەساڵی١٩١٨ دا دەرچوون.

ئاسوریەکان و ئەرمەنیەکان -کەکەمایەتیەکی بچوک بوون لە ئازربایـنجان وکوردستان دەژیان- ناچارکران کە ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێبهێڵن. ئەوەی کۆچی نەکردایە دەکەوتە ژێر مەترسی کوشتنەوە .

دواتر ئەم دوو شوێنە ناونران ئازربایـنجانی ڕۆژئاوا. بەواتا لە ساڵی ١٩١٨ دا ئەم چاپەمەنیانە هاتنە کۆتای! بەڵێ، وەرزیەکان وەستان و ئامێرەکانی لە چاپدان تاڵان کران. ئەم پەخشانەی ئاسووریەکان، جارێکی تر لە تاران، لەساڵەکانی ١٩٥٠ کاندا سەریان هەڵدایەوە. ورمێ جارێکی دی ئەم ڕۆژنامەگەرییەی بە خۆوە نەبینی. هەر لەو سەردەمەدا، واتالەکۆتای

جەنگی جیهانی یەکەمدا، زۆربەی گوندە ئاسووریەکانی دەڤەرەکە لەلایەن کورد و تورکەوە داگیرکران و ئاسووریەکان ئاوارەکران و مڵک و ماڵیان لێ زەوتکرا.
واژوکردنی پەخشە وەرزییەکانی زمانی ئاسووری لە شاری ورمێ، بە ڕادەیەکی بەرچاو لە ئاستێکی شکۆمەندابوو، زانستخوازان ئەم ڕاستیەیان لە بەراوردکردنەکانیاندا لە گەڵ بڵاوکراوەکانی سەردەمی ناوچەکانی تردا بۆ دەرکەوتووە. بڵاوکراوەکانی دەڤەرەکە بەم زمانانەی خوارەوە دەرچوون:
تورکی، ئەرمەنی، فارسی وە بۆ سەرسوڕمانی من بە کوردیش !
لەم سەردەمەدا، ئەم شێوە بە دواداگەڕانە کەتەلۆگەکانی سەر ئینتەرنێتیان دەوڵەمەند کردووە. بوونی ئەم زانیاریانەی سەر ئینتەرنیت نەبوون بە سەرچاوەی سەرەکی زانیاری، زیاتر سانەوی بوون. زانیاری تۆکمە لەسەر چاپەمەنی کوردی وڵاتی ئێران لەچوار کتێبخانەی ئەمەریکییەوە دەست دەکەون.
من لەم باسەدا پشتم بە بەدواداچوون و هەڵسەنگاندنی نووسەرە ئەمەریکیەکان بەستوە. هەر لەم بوارەوە کەڵکم لە سکۆلەر (زانستخواز) لوقمان مەحۆ وەرگرتووە. لەویلایەتە یەگرتوەکاندا ئەم بڵاوکردنەوانە لەبەر دەستدان. ئەم دیراسەیەی بەندە، تایبەت نیە بە مێژووی ڕۆژنامەوانی لە ئێراندا، زیاتر ئەرکی بەدواداچوونی هەرسێ بڵاوکراوە وەرزیە کوردیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم دەخەمە ئەستۆی خۆم. ئەم سێ بڵاوکراوە دەوریەی ,کە زیاتر لەگۆڤاری وەرزی دەچن , بەزمانی کوردی لە سابڵاخ لە نێوان ساڵانی ١٩١١-١٩٢٨ دا دەردەچوون. وەک سەرەتایەک، من وێنەیەکی ڕوونی مادە کلتوریەکان لە هەردوو شاری ورمێ وسابڵاخ دەخەمەڕوو (تورکەکان بە سابڵاخیان وتوە ساوج بوڵاک کەبەمانای کانیاوی سارد دێت ). لەپاڵ مادە کلتوریەکانیشدا دیقەت لەتوانای ئەدەبی و ڕوانبێژی ڕۆژنامەوانی کوردی دەدەم. بێ گومان پێشینەی سیاسی بەلای منەوە دەبێ ڕۆڵی هەبووبێ لە ڕەخساندنی ڕۆژنامەوانی وچاپەمەنیدا.
گرنگە بەلامەوە , ئەو ڕاستیانە ڕوون بکەمەوە چونکە مەبەستی من لەم کارەدا شیکردنەوەی پەیوەندی نێوان کوردو ئاسوری نیە , وە ناشمەوێ خۆم بە شرۆڤەکردنی باری سیاسی کورد و نەتەوەکانی دەوروبەریەوە خەریک کەم , وەلێ ئاواتەخوازم کەبە ئەمانەتەوە بتوانم تیشک بخەمە سەرحاڵ و باری ژیانی کوردو بارودۆخی ئەدەبی کوردی ئەو سەردەمە.
لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، شاری ورمێ و دەوروبەری، ناوچەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش بوون بۆگەشەپێدانی مژدەی ئاینی مەسیحی لە نێو دانیشتوەکانیدا. ئەم سەرنج دانە بێ بنەما نەبووە بەڵکو "٧٥"ساڵ پێش دەستپێکردنی مژدەبەری بڕیاری لە سەر دەرچووبوو. بڕیارەکە لەشاری بۆستن، لەویلایەتی (ماساچوسیتس)ی ئەمریکی دەرچووە. بڕیارەکە سەرچاوەگیری شاندێکی ئەمریکی بوو کە لە ساڵی ١٨٢٩ دا. ئەم شاندە بە بڕیاری کومسیونی تەبشیری مەسیحی ڕەوانەی ئەو ناوچە کوردیە کرابوو. کۆمسیۆنەکە ناسراوە بە. (ABCFM) ئەم کۆمسیۆنە ئەم بڕیارەی خۆی بە هەنگاوێکی پڕ مەترسیدار لە قەڵەمدا چونکە لەو کاتەدا جەنگی نێوان رووس و ئێران بۆکۆنترۆڵ کردنی ئاسیای ناوەڕاست لە ئارادابوو.بڕیارەکەش بۆ ئەوەبوو کەمەسیحیەکانی شاری ورمێ و دەوروبەری بەلای خۆیاندا ڕاکێشن. هەر لەهەمان کاتدا، لەناوچەی سالاماسی نزیک بە شاری ورمێ

کیانێکی مەسیحی رومان کاسۆلیک هەبوو. کە لە بنەمادا کاسۆلیکییە فەرەنسیەکان دایان مەزراندبوو. فەرەنسیەکان دەزگای هاوشێوەیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبوو. لەبەر ئەوە دامەزراندنی دەزگای هاوشێوەی تریان بەلاوە ئاسان بوو. فەرەنسیەکان ئەم ئەرکانەیان بۆ بەرژەوەندی دیبلۆماسی خۆیان جێ بەجێ دەکرد.

**مژدەبەری پرۆتستانێ لە ئێراندا**
(Protestant Missions in Iran)

بڕیاری (ABCFM) بۆ سەرپەرشتیاری کردنی مەسیحیەکان دوو خاڵی گرنگیان تێدابوو، یەکەمیان ئەوەبوو کە تەرکیز بکەنە سەر کەنیسەی کاسۆلیکی ئەپۆستۆلیکی لە ڕۆژهەڵاتی نەستۆریدا، دووەمیان ئــەوە بــوو کــە بــرەو بــە زمــانــی تــازەی (Neo Aramic) بدەن و بیکەنە زمانی گفتوگۆ لە ناو مەسیحیەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران. ئەم خاڵەی دووەم ئاسایی نەبوو چونکە لە دواییدا دەرکەوت کە لە ناو مەسیحییەکانی ئێراندا نامۆیی لە زمانی ئەم کەمایەتیە دەکرا.

لە ڕاستیدا، لەساڵی ١٩١٥دا پرێسیاتێریەکان (Presbyterians)کــــــە جێگەی ABCFM گرتەوە , بڕیاری بەکارهێنانی زمانی ئارمییان گۆڕی بە زمانی فارسی. هۆکاری گرنگی ئەم بڕیاردانە ئەوە بوو کە لە چەندشوێنێکی وەکو ڕەشت، تاران، مەشهەد وچەندین جێگای تر زۆرینەی دانیشتوانی فارسی لەخۆ دەگرت , لەم شوێنانەشدا خەڵکانێکی زۆر کە ئاسووری نەبوون ئاینی خۆیان دەگۆڕی بۆ مەسیحیەت.

تێبینین: (پرێسیاێریان (Presbyterians) بە مانای بەڕێوەبردنی کەنیسە دێت کە لەلایەن کۆمەڵێک قەشەوە بە یەکسانی کاردەکەن و بڕیار دەدەن ئەم تاقمە جێگەی (ABCFM) یان، لەساڵی ١٨٧١دا گرتەوە و بڕیاری بەکارهێنانی زمانی فارسییان دا).

بــەهــەرحــاڵ، یــەکــەم کــاری شــانــدی مــژدەبــەری مــەســیــحــیــەکــانــی ئــەمــریــکــا نــەک هـــەر لــەنــاو چینەچەوساوەکانی ئێراندا دەستی پێکرد بەڵکو بەزمانی ئارامیش چالاکیان نواند، بە واتا زمانێکیان بەکارهێنا کە گەیشتبووە لاوازترین ئاستی زمانەوانی لەمێژوودا. زمانی ئارامی، لەخۆیدا،

کۆنترین زمانی گفتوگۆ ونوسین بووە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڵام بەکارهێنەرانی ئەم زمانە کەوتنە ژێر فشاری سیاسی دوژمنەکانیانەوە و ناچار بوون ڕوو بکەنە شاخە سەختەکان و شوێنە دوورە دەستەکان، ئەوانەی کەنەیان توانی کۆچ بکەن کەوتنە ژێر ڕەحمەتی خێڵە ئیسلامیە سەرسەختەکان و دەرەبەگەکان وفەرمانبەرانی حکومەتەکانەوە.

بڕیاری ABCFM گۆبەندێکی نایەوە کە تا سەدەیەک دواتــریــش جۆشی دەخـــوارد. لەساڵی ١٨٣٥دا , قەشەی پایەدار جەستین پێرکینز " کە لە ساڵی ١٨٠٥ لە دایک بووە و لە ١٨٦٥ دا کۆچی دوای کردووە " قوتابخانەیەکی کوڕانی کردەوە (نەوتراوە لە چ شارێک بووە بەڵام پێدەچێت لە ورمێ بوو بێت – وەرگێڕ) دواتر لە ساڵی ١٨٤٣ دا قوتابخانەیەکی کچانیشی کردەوە. بەمانەشەوە ڕانەوەستا، یەکەم ڕۆژنامەی لە هەموو ئێراندا بە هەموو زمانەکانیەوە دامەزراند و ناوی لێ نا (Zahrira کە بە مانای تیشکەکانی ڕووناکی دێت) , ئەم تێبینیانەی لای خوارەوەی لەسەرە :

(١) ڕۆژنــامــەکــە هەرچەندە بەهۆی بــارودۆخــی جیــاوازەوە بەڕێکو پێکی دەرنــەچــووە، بــەڵام تا ساڵی ١٩١٨ بەردەوامبووە , واتە ٤٨ ساڵ دوای کۆچی دوایی دامەزرێنەری ڕۆژنامەکە ،ئەم چالاکیە هەر بەردەوام بووە. لە هەمان ساڵدا مەسیحیەکان گلۆڵەیان کەوتە لێژی، ناچار کران بڵاوەی لێبکەن

و خۆیان لە کوشتن ڕزگار کەن. هەر لەو کاتەشەوە تیشکی ڕوناکی ڕۆژنامەگەری وەستا و ئاوابوو.
قەشەپەرکینز بە ئاسووریەکانی دەووت نەستۆریەکان، پەرۆشێکی بە تینی هەبووبۆ خۆشگوزەرانیان و هۆشیارکردنەوەیان.
پەرکینز بە هەمان ئاست خەمخۆری نەتەوەکانی تری وەک کورد و فارس و تورک بووە. باشترین شایەتحاڵی ئەم ڕاستیە ئەو دوانزە تابلۆیەیە کە بەبۆیەی ئاوی کێشاونی. ئەم تابلۆیانە تا ئێستا ماون و خۆشەویستی ئەم پیاوەی بەهەمووپێکهاتەکانی ورمێ بەزیندووی بە جێهێشتوە-ماوەیەک ورمێ ناوی گۆڕابوو بە ڕەزائیە.
(٢) لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، بوونی ئەمریکی لەشاری ورمێ و دەوروبەری تەواو سەقامگیرو داڕێژراو بوو. دەزگایەکی ئەمریکی بەتەنها توانی ١٥٠ قوتابخانە، لەو شارەو شارۆچکەکان وگوندەکانی دەوروبەری دامەزرێنن.پێشەواکانی ئەم قوتابخانەیە بەپیاو وئافرەتەوە دەرچووی هەمان قوتابخانەکانی ناوچەکە بوون بەم کارە گرنگە ڕێژەی خوێندەواریان لە ورمێدا، گەیشتە ٤٠٪ ی دانیشتوان، کەچی لەهەموو ئێراندا ڕێژەی پیاوی خوێندەوار دەگەیشتە تەنها ٢٠٪ و ئافرەت دەگەیشتە ٧٪ , ئەمە لەشارەکاندا بەڵام لەلادێکاندا ڕێژەی خوێندەواری پیاوان ٥٪ بووە و ئافرەتی خوێندەوار بوونی نەبووە.
پێدەچێت بەهۆی سەرکەوتنی مژدەبەران لەلایەکەوە و زۆربوونی تاقمە کۆچکەرە لۆسەریەکان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان (کە بۆخۆیان حەزیان لە ئەرکی مژدەبەری دەکرد) سەر لە نوێ ڕوویان دەکردەوە باکوری ڕۆژئاوای ئێران. لەلاکەی ترەوە، کاری مژدەبەری ئەمریکای باشوور پەرەی دەسەند. ئەم کوچکەرانە بەزۆری خەڵکی ئەڵمانیا و سوید و نەرویج بوون , لە ویلایەتە یەگرتوەکان و کەنەدا نیشتەجێ دەبوون. وە بەهۆی دەزگای لۆسەری ڕۆژهەڵاتەوە کار ئاسانییان بۆ کراو بەرێکران بۆ ئێران (بە واتا مەسیحییەکی زۆر ڕویان دەکردە ئەمەریکای باشوور , لە پاش نیشتەجێ بوونیان دەستیان دەکرد بە کاری تەبشیری لە ئەمەریکا و کەنەدا و وڵاتانی دەرەوەدا-وەرگێڕ)
(٣) هۆکاری دامەزراندنی کاری کەنیسە لە نێوان کوردەکاندا، دەگەڕێتەوە بۆ بڕیاری کۆنفرانسی یەکلایی کەرەوەی مژدەبەری لەجیهاندا. ئەم کۆنفرانسە لەساڵی ١٩١٠ دا لەشاری ئەدنبەرەی سکۆتلەندی بەڕێوە چوو. ئەم کۆبوونەوەیە بەرفراوان بوو، کەسی زۆری خاوەن بڕیاری تێدا بوو. بڕیار درا کە ناوچەی کورد کراوە بێت بۆ لۆسەرییەکان. ئەمریکیەکانیش ئەم هەلەیان قۆستەوەو چوونە ناوەوە.
پەیوەندی مژدە بەرانی لۆسەری ڕۆژهەڵات بە کوردەوە
The Lutheran Orient Mission and the)
(Kurds
مژدەبەرانی لۆسەری ئەڵمانی تامەزرۆی ئەو کارە مژدەبەریە بوو بوون کە لەئەوروپا و وڵاتانی ئینگلزی زماندا پراکتیزەیان دەکرد، چاویان بڕیە سەر گەلی کورد. لەساڵی ١٨٩٥ دا شاندێکیان دامەزراند بۆ کارکردن لەناوچە کوردیەکاندا.
ئەم شاندە بەرێ نەکرا و ئەرکێکی تریان کەوتە بەردەم ! هەر لەو ساڵانەدا کۆمەڵکوژی مەسیحیەکان لە لایەن تورکەکانەوە , بە پێشڕەوایەتی سوڵتان عەبدول حەمید لەناوچە عوسمانیەکاندا جۆشی سەند. لەبەرئەوە شاندەکە بڕیاری دا کە بە هەموو گورو توانایەکەوە دەست بکەن بە کاری فریاگوزاری و فریاکەوتنی ئەرمەنیەکان و ئاسووریەکان لە تورکیادا. بەهەرحاڵ لۆسەریەکان پێشتر شاندێکی

بچکۆلەیان ناردبوو بۆ ئێران و توانیبویان مەشق بە قەشە ئاسووریەکان بکەن و دوو کەنیسەی لەناوچەی ورمێ دا دامەزرێنن.

دکتۆر فۆسوم، هەڵگری بڕوانامەی phD، "لەدایکبووی ١٨٧٩ و کۆچکردووی ١٩٢٠" کاری مژدەبەری ورمێی گرتە ئەستۆی خۆی.

شارەزایانی کورد ومێژووناسان فۆسوم بە چالاکەوانی سەرەکی له دیراساتی کوردیدا دادەنێن , زوربەی کارەکانی له شاری سابلاخ ئەنجامداوە (ئەم شارە دواتر بە مهاباد ناسرا) ئەم قەشەیە هەرچەندە ئەمریکی بوو بەڵام بەڕەگەز نەرویجی بوو. فۆسوم ساڵانی ١٩٠٤ بۆ ١٩٠٩ ی لە ورمێ بردۆتە سەر، هەر لەوێ فێری زمانی سیریاک (ئاسووری) و تورکی بووە. دواتر لە سابلاخ فێری کوردی بووە. ئەڵمانیەکان پێش ئەو لەوێ بوون. دواتر کۆمەڵی ئەمریکی، سویدی، فەرەنسی لەگەڵ مژدەبەرانی لۆسەری لەوڵاتانی تری ئەورووپاوە هاتوون و کاریان پێکەوە کردووە.

سپۆنسەری سەرەکی ئەم شاندانە , مژدەبەری لوسەری ڕوژهەڵات (Lutheran Oriental Mission) بووە کە لە ناوەڕاستی ڕۆژئاوای ویلایەتە یەگرتوەکاندا بارەگای سەرەکیان دامەزراندبوو. ئەم شاندە زۆر بە ڕوونی پرێنسیبی کارکردنیان لە سابلاخ واژۆ کردبوو، بەڵام دوو فاکتەری ناقۆڵا لە بونیەی ئەم شاندەدا کاریگەری خراپیان هەبووە:

١-ئەندامانی شاندەکە فرە ڕەگەز بوون وەک شاندی ئەمریکی Presbyterianپێکە وگونجاو نەبوون کە تەنها هاوڵاتی ئەمەریکی بوون.

٢-شاندی لۆسەری ڕۆژهەڵات بە خەستی تەرکیزی دەکردە سەر کوردەکان، بە هەرحاڵ دواترهەندێ ئاسووریان لەخۆیان کۆکردەوە.

دوکتۆر ڕیف فۆسوم کاتی پشووی خۆی لەویلایەتە



**لەپاڵ سمکۆدا، هەندێك ناوی وجاخ زادەی کوردەکان هاتووە، تەنانەت باسی هاوسەرەکانیشیان کراوە. ناوی مستەفا قازی هاتووە کە ئەوسا قوتابی کۆلێژی پزیشکی، لە خەستەخانەی فێرکاری حەیدەر پاشای ئەستەنبوڵ بووە. مستەفا کوڕی خانەوادەیەکی ناسراوی سابڵاخ بووە. خەڵکە محەلیەکانی تری سابڵاخ (کەباس کرایێتن ) جولەکە و ئەرمەنی و کارمەندانی ڕوسی بوون لە سابڵاخ. بەهەرحاڵ ناوی هەندێ بازرگانی موسڵاوی هاتووە کە بۆ خۆیان کاسۆلیکی کلدانی بوون و پەیوەندی مژدەبەریان بەو گروپانەوە نەبووە**

یەکگرتوەکاندا بەپارەکۆکردنەوە , بۆ خزمەتی کورد , لە کەنیسەکانی وڵاتەکەی بردۆتە سەر، وێڕای خزمەتی ئامانجە ئاینییەکان بۆ کاری مرۆییش بەکاری هێناون.

فۆسوم لەساڵی ۱۹۱۱ دا گەیشتۆتە سابڵاخ. (هەموو مـژدەبـەران تەنها نـاوی ساوج بولاکیان لە جیاتی سابڵاخ بەکارهێناوە). ئەم شارۆچکەیە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ورمێوە و نزیکی ۳۰۰ کیلۆمەتر بە ئاڕاستەی ڕۆژئاوا لە شاری تەبرێزەوە دوورە. ئەم شوێنە ستراتێجیە گرنگبوو بۆ پاراستنی ژیانی شاندەکە. لە تەنگەشەکانی ۱۹۱٦- ۱۹۲۱دا ئەندامانی شاندەکە لە کاتی سەفەرکردنیاندا بەرەو ئەوروپا و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان شاری تەبرێزیان بەکاردەهێنا. بەڵام بۆپێداویستی تر و چارەسەری پزیشکی، دەزگاکانی شاری ورمێیان بەکاردەهێنا چونکە خەستەخانەی (وێست مینستەر) لەوێ بوو، ئەمە یەکەم خەستەخانەی ئێران بوو.

خاڵی گرنگ و سەرەتایی پرینسیپەکانی کاری ڕێخراوەکانی مژدەبەری بیانی کەسەر بەلۆسەری ڕۆژهەڵات بوون: داکۆکی کردن بوو لەسەر فێرکردنی زمان. وێڕای ئەمەش مژدەبەران ئامۆژگاری کرابوون کە لە ساڵی یەکەمدا خۆیان فێری زمانی کوردی بکەن. بەواتایەکی تر تێکەڵاوی کوردەکان ببن. لەمیانەی ئامۆژگاریەکانەوە پێیان وتـرابـوو کە کارێکی نەشیاوە کوردەکان لە ڕێگەی ئاسووری و ئەرمەنیەوە فێر بکرێن. جیاوازی بنەچەی ڕەگەزی مژدەبەران هەمیشە هەڕەشەی ژیانی لێدەکەوتەوە، ئەم نا دڵنیاییە بەتایبەتی لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمدا پەرەی سەند. دوکتۆر ئێدماند کە یەکەم پزیشک بوو هاوکاری شاندی مژدەبەری فۆسومی کرد، هەر لەسەرەتای جاڕدانی جەنگدا گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی و ئیتر سەردانی سابڵاخی نەکردەوە.

بەنیسبەت هاوڵاتیە ئەمریکیەکانەوە , پشتیان بە قونسولی ڕوسی لەسابڵاخ بەستبوو. ئەم قونسولە بۆخۆی لۆسەری بوو، ناوی کۆلۆنیل ئەلێکساندەر لیاس بوو , بە ئەسڵ فینلەندی بوو , لە دایک بووی ساڵی ۱۸٦۹ بوو. لەتەمەنی ٤٥ ساڵیدا لەشەڕی میاندوواودا لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگی جیهاندا کوژراو ئەمریکیەکان ئەم پارێزەرەیان لە کیس چوو. (٦)

## تەرکیزی مژدەبەری کاسۆلیکی لەرۆژهەڵاتی ناوەراستدا

Catholic Mission Focus in the Middle) (East

سوودبەخشە ئەگەر لەوە بە ئاگا بین کەهەموو شاندەکان لە مێژەوە گرنگییان بەکورد داوە. هەر لە کۆنەوە، لەساڵی ۱۷۸۷ ەوە بڵاوکراوەیەکیان دەکرد کە دەشێ یەکەم دیراسەی زمانی کوردی بێ لە لایەن ڕۆژئاواییەکانەوە (۷).

نوسەری بڵاوکراوەکە مژدەبەرێک بووە کە بۆ ماوەی دوو ساڵ لەشارۆچکەی عەمادیە، لە باکوری موسڵ، ژیاوە (۸).لەسەدەی نۆزدەهەمدا، قەشە سامۆئێل ڕەهیا کە ئەمەریکی بوو، وە ئەندامی (ABCFM) بوو، لەساڵی ۱۸٥٦ دا دووەم دیراسەی کوردی بڵاوکردەوە (۹). ئەمەش لە کاتێکدایە کە پیتەر لێرچ لەساڵانی (۱۸٥۷-۱۸٥۸)دیراسەیەکی کوردی گەیاندە بڵاوکردنەوە. پشتی بەستبوو بەکورتە چیرۆک و شیکردنەوەی زمانی کوردی، ئەم کورتە چیرۆکانەی لەدیلەکانی جەنگەوە وەرگرتبوو کە لە بەندینخانەی شارۆچکەیەکی باشوری موسکۆ گیرابوون (۱۰). فۆسوم کەبۆخۆی یەکەم نوێنەرایەتی مژدەبەری لۆسەری ڕۆژهەڵاتی دەکرد لەسابڵاخ , مەوادێکی زۆری وەرگێرا بۆ کوردی و گرنگی تەواوی بەزمانی کوردیش دا. لە ساڵی ۱۹۲۰دا گرنگیدان بەزمانی

کوردی چڕتر بووە و لەلایەن ئاسوریەکانیشەوە , یەکێک لەپێشەواکانی کەناوی پێرۆز ئلیبا ئاغا بوو کارێکی کوردی خۆی بڵاوکردەوە (١١)
هەرچەندە پەیوەندی کاسۆلیکی مژدەبەرایەتی لە سەدەی هەژدەیەمدا دەستی پێکرد , وەلێ شاندە کاسۆلیکییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەک دەردەکەوێ، گرنگییان بە کورد نەداوە. خولیای چارەسەری نەخوێندەواری و باری خراپی تەندروستییان نەبووە , گوێشیان نەداوەتە تەفسیری ئینجیل. ئەگەر چی لە ورمێ بووبێ یاخود لەسەلاماس، تەرکیزیان کردۆتە سەر ئەوانەی لە خۆیاندا مەسیحی بوون، واتە مەسیحی ڕۆژهەڵات بوون، بەتایبەتی ئەوانەی ئارامی بوون و بەڕادەیەکی کەمتریش دوای ئەوان ئەرمەنیەکان هاتوون.
دامەزراندنی کەنیسەیەکی کاسولیکی کلدانی لەسەدەی ١٦ یەمدا , بۆ بەندو باوی ئاینی بەشێوەی ڕۆژهەڵاتی تەنها نزیک بوونەوەی ڕۆما بوو لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. خاوەن تیوریەکانی کاسۆلیکی کە پێش نوێژییان دەکرد , ترسی ئەوەیان هەبوو کە ئەوانەی ئاینی ئیسلام بەجێ دێڵن دووچاری سزای سەختی شەریعەتی ئیسلامی ببنەوە , چ لەگرویە ئاینیەکانەوەو چ لەتاکە کەسەوە (١٢). لەنامە گۆڕینەوەکانی شاندە مژدەبەرانی ئەو ساڵەدا، دوو ڕێگەی مەترسی دار کەوتوونەتە بەرچاو:
(١) ترسی بەسەردا سەپاندنی سزای کوشتنی بەسەر ئەو کەسانەدا کەدینەکەیان بەجێ دێڵن
(٢) سزادانی ئەو کەسانەی کەهەوڵی گۆڕینی موسوڵمانان دەدەن بۆ ئاینێکی تر، ئەوەی ئەم کارە دەکات بەکافر هەژمار دەکرێت و دوچاری سزای سەخت دەبێتەوە.
لێرەدا ئەو هۆیە ڕوون دەبێتەوە کە بۆچی تەرکیز دەکرایە سەر ئەو کەسانەی بە سروشتی مەسیحی بوون وەک (ئاسوری وئەرمەنی )یاخود جولەکە بوون. لەم ئاڕستەیەشەوە پەنجەرەیەکی ئومێد دەکرایەوە کەئەمانە بەنهێنی بتوانن موسوڵمانەکانی دەوروبەریان لەدین وەرگێڕن. ئەمە بەتایبەتی ئومێدێ بوو
لەڕابوردوودا. شاندە بیانییەکانی مەسیحییەت بەتۆمەتی سەرپێچی کردنی یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی نەدەخرانە بەردەم دادگا، یاخود بە ئاشکرا سزا نەدەدران. بەڵام بەداهاتنی سەدەی بیستەم ئەم حاڵ و بارە گۆڕا (١٣). ئەو مژدەبەرانەی کەلەلایەن کوردەوە کوژرابوون، بەحوکمی یاسا بڕیاری کوشتنیان بۆ دەرنەچوو بوو، نە لەئێران و نە لە مێسوپۆتامیادا (١٤). ئەمە هەمان شێوە هەڵسوکەوتە کە لەکۆماری ئیسلامی ئێران دا کوشتن , لەساڵی ١٩٧٩پەیڕەو دەکرێ.
هەمان سزا بەزۆری بەسەر موسڵمانەکاندا پەیڕەو دەکرێت ئەگەر هاتوو لەسەر دینی خۆیان لایاندا. یەکەم کورد کە سزای کوشتنی بەسەردا سەپێنرا ئەو کەسە بوو لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەشاری ورمێ هەڵواسرا. یەکەم کورد کە لەلای ڕۆژئاوایەکان ناسراو بێ لەئیسلامەوە گۆڕابێ بە مەسیحی لەساڵی ١٨٩٤ دا بە دەستی ئاسوریەک لەشاری سنە کراوە بە مەسیحی (١٥).
چی بوو وای لە ئەوروپییەکان و ئەمەریکیەکان کرد ئەوەنە خوو بدەنە کوردەکان ؟ چەندین لێکدانەوە هەن بەڵام زانیاری تەواو نا بەخشن , تەنها دوو فاکتەریان شیاون، یەکەمیان ئەوەیە کە کوردەکان بە زۆری سوننەن و لەژێر دەسەڵاتی پیاوە ئاینیەکانی شیعەدا نین کە بەشێوەی مەلاکانی ورمێ و تەبریز و ناوەندەکانی تر بڕیاریان بەسەردا دەردەکەن. ئەم ڕاستیە بوو کە وای لە لۆسەریەکان کرد کە کوردێک بە ناوی عەلی ئیلاهی لەشاری کرماشان، ساڵی

١٩٢٠ بگۆڕن بە مەسیحی. دووەم پاش سەدەیەک کۆکردنەوەی زانیاری بۆ تێگەشتن لەو مۆتیڤەی کە کوردە موسڵمانەکان چۆن مەسیحەکانیان کوشتوە , بەتایبەتی لەساڵانی ١٨٩٥- ١٨٩٦ دا , ئەو کاتەی کە کوردەکان لەیەکەکانی سوپای حەمیدیە دا کاریان کردوە و وێڕای کوشتنیش , ماڵی مەسیحیەکانیشیان کاول کـردووە , بە تایبەتی لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئیمپڕاتۆریای عوسمانی دا. بە واتا مەبەستی نزیک بونەوەی مـژدەبـەران لە کـورد بۆ ئـەوە بـووە کە ڕوخساری مەسیحیەکان لای کوردەکان شیرین کەن و لە کوشتن و تاڵان کردن دووریان خەنەوە.

هیچ کام لەم ئامانجانە ئەوەی نەسەلماند کە لە واقعەوە نزیک بێت. لە یەک حاڵەتدا نەبێت کە مژدەبەران توانیان خەڵکێکی زۆر لەساڵی ١٨٨٨ بگۆڕن بە مەسیحی (ئەمانەش ئێزیدیەکانی دەور و بەری موسڵ بوون ).ئەم لە دین وەرگەڕاوانەش دەست بەجێ کەوتنە بەر شاڵاوی یەکە سەربازییەکانی تورک و کورد , نەک هەر لەسەر ئاینی تازەیان لابردن بەڵکو بە زۆرە ملێ کردنیان بە ئیسلام (١٦) هەر چەندە گەشبینی بەردەوام بوو، ئەم گەشبینیەش لە ماوەیەکی زەمەنی کورت دا بوو لە سابڵاخ. بەڵام شاندی مـژدە بـەری لۆسەری گەلێک پیاویان لە دەستدا، یەکێکیان لە سالی ١٩٠٧ دا کوژرا، یەکێکی تریش لە ساڵی ١٩٢١ دا.

مژدەبەران هەرگیز باوەڕیان بەوە نەدەکردوە کە کوردی ئەو ناوچەیە بەم کردەوانە هەڵسابێتن، بە هەمان شێوە باوەڕیشیان بەوە نەدەکردوە کە ئەو هەموو چاکەیەی بۆ دانیشتوانیان کردوە بە خراپە بشکێتەوە بە سەریاندا و بەرز نەینرخێنن.

لە هیچ شوێنێک دا حیساب بۆ ئەوە نەدەکرا کە ئەم جۆرە کوشتنە لە سابڵاخ لەبەر مۆتیڤی ئاینی بێت. لە ڕاستی دا، هەر چەندە ژمارەی ڕێژەییان لە ورمێ گەلێ زۆرتربوو، لە ناو تورک و ئاسوریدا دەژیان , کەچی ڕێژەی کوژرانیان کەمتربوو وەک لە شوێنانی دەور و بەری. کوشتن لە ئاکامی ڕق و کینەدا دژ بە ئاینی مەسیحی و دژ بە شاندی مژدە بەر دروست دەبوو. ئەمەش کۆڵی بە مژدەبەرانی لۆسەری نەدا کە بۆ نزیکەی ٣٠ ساڵ ئەم شاندە لە شاری سابڵاخ کار بکەن , قوتابخانە بکەنەوە، کلتوری کورد برەو پێبدەن، ڕۆشنبیری بە هێز بکەن. وە هەر ئەمانیش بوون ڕێگەیان ساز کرد بۆ پتەو کردنی هەستی نەتەوایەتی کوردی کە بوو بە هۆی دامەزراندنی کۆماری مهاباد لە ساڵی ١٩٤٤-١٩٤٦ دا.

## ئامانجەکانی مژدەبەران و بڵاوکراوە وەرزیەکان
## Missionary Goals and the Periodical) (Press

وەک تـەواوکـەری ئامانجی بە مەسیحی کـردن، مژدەبەران بەلایانەوە گرنگ بوو کە خوێندەواری -نوسین و خوێندنەوە -پەرەپێبدەن نەک هەر بۆ تێگەیشتن لە وتاری نوێژکردن و زانینی سروودی ئایینی و وتنەوەی ئەم سروودانە لەگەڵ ئاوازی ئامێری مۆسیقای "ڕۆت" دا , بەڵکو بۆ تێگەیشتن لەو وتارە نوسراوانە کە لە ئایینە تازەکەدا بەکاریان دەهێنا . لەبەر ئەم هۆیانە بەلای مژدەبەرانەوە زەروری بوو کە ئاسووریەکان و کوردەکان بە زمانی دایکی خۆیان بتوانن بنوسن. هەر لەبەر ئەوە قوتابخانەیان بۆ ئامادەکەن و چاپخانەیان بۆ دامەزرێنن تاوەکو بە هەمان زمان چاپەمەنیان بۆ دەربکەن , وە ئەگەر توانرا، ئەوا بڵاوکراوەی وەرزیش پەخش کەن.

ئەم ئامانجە تەنها لە ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەوڵی بۆ نەدەدرا , بەڵکو لە هەموو شوێنێکدا کە ئەمەریکیەکان، بەتایبەتی پرۆتستانیەکان ڕوویان

تێکردبێت ئەوە دەستیان کردووە بە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری. شێوازی ئۆرسۆگرافیان واتە (رێنوسی بە هەڵە) یان واژۆ دەکرد، هەر یەکە بە زمانی زگماکی خۆی و گەلێ جاریش بە زمان و دیالێکتی سەرەتایی وەکو کرمانجی، بگرە سۆرانیش فێر دەکران، یەکەم کار کە کرابێ , نوسینەوەی گۆسپێلێکە یان (هەر چوار گۆسپێلەکەیە) کە بەو زمانە نووسراونەتەوە کە بۆ هەر چوار کتێبەکەی عەهدی تازە یاخود ئینجیل Bibleی پێ نوسراونەتەوە و باسی ژیان و هەڵسوکەوت و رێنمایەکانی عیسا کوڕی مەریەمی تێدایە.

کۆمەڵەی ئەمریکی تواناکانی پرۆفیسۆر ئەبراهام یۆهانانی خستە گەڕ بۆ خزمەتی زمانی ئاسووری. ئەم پرۆفیسۆرە مامۆستای زمانی ئاسووری بوو لە زانکۆی کۆلۆمبیا , بۆ خۆی لە دایک بووی ١٨٥٣ یەو لە ساڵی ١٩٢٥ دا کۆچی دوای کردووە. ئەنجیلی بۆ زمانی ئاسووری لە ساڵی ١٨٩٣ دا، بۆ یەکەم جار وەرگێڕاوە. بەڵام مادە مەسیحیەکان بەزمانی کوردی لە دەرەوەی بازنەی لۆسەریەکانی سابڵاخ نووسراونەتەوە. قەشەی پایەدار (Detwig von Oertzon) ئەنجێلی مارکوسی لە ساڵی ١٩٠٩دا وەرگێڕاوە بە کوردی و بڵاویکردۆتەوە ١٧)). وە هەروەها دوکتۆر فۆسوم هەر چوار گۆسپێلەکەی لە ساڵی ١٩١٩ دا بەناوی ئینجیلی موقەدەسەوە بڵاوکردۆدەوە , بە هەمان شێوەش بەزاری موکری سابڵاخیش بڵاویکردۆتەوە.

لەمیانەی بەردەوامبوون لەئامانجی دابینکردنی ئاسانکاری رۆشنبیریدا، هەرچەندە بەرقەراری ئاسایش بۆ ئەندامە لۆسەریەکان مسۆگەر نەکرابوو، توانیان قوتابخانە، خانەی هەتیوان و خزمەتگوزاری پزیشکی بەهەمان ئاستی گەشەسەندووی کاری پزیشکی ئەمریکی لە ورمێ و لە سابڵاخیش دابین بکەن (١٨). لە میانەی پیلانی خزمەت گوزاری پزیشکی بۆ سابڵاخ و دەوروبەری، هیچ گروپێکی نەتەوایەتی یان ئاینی ئەو ناوچەیە بێبەش نەکرا. پێکهاتەی شاندی لۆسەری لە سابڵاخ دەوڵەمەند بوو. چەند دکتۆرێک و چەند ئافرەتێکی پەرستار و کۆمەڵێ پیاوی ئاینی گرتبوە خۆ.

ئەوەی لە هەموان خزمەتی زۆرتر کردبێ قەشە فۆسوم (لودڤیگ ئۆلسن فۆسوم )بوو ئەم پیاوە هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا بوو بە یاوەری هاوسەرەکەی و کچە کۆرپەکەی هاتبوون بۆ سابلاخ. کاتێک کە ئەم خێزانە گەڕایەوە بۆ ویلایەتە یەگرتوەکان، خوشکەکەی فۆسوم، وەک پەرستارێک، دەستی کرد بەکارکردن لەگەڵ شاندەکەدا. شایانی باسە هەموو ئەندامانی شاندەکە تووشی لەرزوتا دەبوون , زەحمەت بوو کەس لە نەخۆشی مەلاریا خۆی بپارێزێ. ئەم نەخۆشیە تا ساڵانی پەنجاکان لەو ناوچەیەدا زۆر باو بوو.

بێجگە لە زمانی سەریانی "Syriac " کە زمانی ئاسووریەکان بوو، زمانی ئارامیش لە نووسینەوەی دۆکۆمێنتەکاندا بەکار هاتووە (١٩). لەهەمووی سەرنج ڕاکێشتر ئەوە بوو کەفۆسوم بە شێوەیەک فێری کوردی سابڵاخی بوو بوو , کەتوانی نوێژی خوداوەند Lords Prayer وەرگێڕێت بۆ کوردی , ئەم وەرگێڕانە یەکەم ئەرک بوو کە ئەم پیاوە بەم زمانە ئەنجامی داوە.

فۆسوم ) (The Battle of Hymnی وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردی , ئەمە دەقێکە کە باس لە خەباتی چاکسازی دەکات لە ئاییندا، لە ٣ ئایەت پێک هاتووە , وە ڕەنگە ئەمە یەکەم دەق بێت کە لە کتێبەکەی (مارتین لۆسەر) ەوە کرابێت بە کوردی. نوسراوەکە ناونراوە " قەڵای سەختی ئێمە هەر یەزدانە" بە ئینگلزی پێ دەوترێ ( A Mighty Fortress

(is our God).ئەم کارە بەبۆنەی یادەوەری چوار سەد ساڵەی چاکسازی پرۆتستانییەوە ئەنجامدراوە (٢٠). ئەم قەشە پایەدارە، لە شاری ئەریڤانی ئەرمەنی توشی نەخۆشی بووە , هەر لەوێ گیانی لە دەستداوە. تاوەکو ڕۆژی مردنی بە کاری ڕێکخستن و دابینکردنی فریاگوزاری هەڵدەسا. ئەم مردنە کتوپڕە لە شاری ئەریڤان لە ساڵی ١٩٢٠دا ڕوویدا. هەتا ڕۆژی پێش زایەبوونی , فۆسوم هەر لە هەوڵی ئەوەدابوو بگەڕێتەوە بۆ سابلاخ و ئەو جێگەیە پڕکاتەوە کە لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا بە چۆڵی مابوەوە. (وەک لە شوێنی تری ئەم کتێبەدا باسکراوە جێگەی زایەبوونی ڕاستەقینەی فۆسوم چیاکانی ئاراراتە).

فۆسوم هەوڵی زۆری دەدا بۆ گەیاندنی یارمەتی بە کورد , بەتایبەتی لە ساڵەکانی جەنگدا بەڵام مەسیحیەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان ئەم داوایەیان ڕەت کردەوە و تەنها بڕیاری یارمەتیدانی ئەرمەنی و ئاسوورییان دەرکرد. فۆسوم بەم کارە زۆر نیگەران بوو. لە نامەیەکدا کەبۆکۆمەڵەی لۆسەری ویلایەتە یەگرتوەکانی ناردوە دەڵێ:"هەموو کۆمەڵکوژیەکانی و کارەساتەکانی ئەرمەنیەکان بەسەر کوردیشدا دێن , بەڵام کەمێک دواتر". فۆسوم لە داواکەیدا بۆفریاکەوتنی کورد , ئاماژە بە نامەکەی دوکتور ئالین (ئەندامی شاندی مژدەبەران لە ورمێ) دەدا کە مۆڵەتی لە حاکمی عەسکەری ڕووسی ناوچەکە وەرگرتوە و سەردانی سابلاخی کردووە "ئەم حاکمە عەسکەرییەی ڕوسیا لە ساڵی ١٩١١ بۆ ١٩١٧ حوکمڕانی شاری ورمێی کردوە".

دوکتۆر ئالین , لە نامەکەیدا نوسیویەتی دەڵێ: "من سەردانی سابلاخم کرد، تەنگەشە و نەبووبی و نا ئومێدی کوردەکانم بەچاوی خۆم دی. .هەزاران ڕەشوڕووت لەسەر جادەکاندا داوای سواڵ دەکەن ,

**کاتێ کەشاندی لۆسەری گەڕانەوە بۆ سابلاخ بینیان کە شوێنگەکەیان وێران بووە، سەقفەکەی داڕماوە و ئەوەی لەناویدابووە تالان کراوە, لێرەوە کاری شاندەکە چڕوپڕتر بووە, دەستیان کردوە بەپارە کۆکردنەوە بەشێوەی Funding بۆ کڕینی خۆراك، جل وبەرگ، دەرمان و دۆزینەوەی شوێنی کار بۆ خزمەتی دانیشتوانی ناوچەکە. لە هەمان کاتیشدا خەمی بونیادنانەوەی پەرستگاکەیان و خانەی منالانی بێ باوك وخەستەخانە و قوتابخانە و شوێنێکی ژیان بۆ شاندەکە بووە. ئەمانە هەموو لە کاتی جەنگدا وێران کرابوون. ئەم وێرانکردنە لە سەراپای باکوری ڕۆژئاوای ئێراندا ڕوویدابوو، هەمان چیرۆکی نەگریسی تالانکردن و وێرانکردنی پەرستگاکانی مەسیحیەکان و ماڵی مژدەبەران دووپات بوو بووە.**

هەرچی نەخۆشی هەیە لەوێ بڵاو بۆتەوە , هۆی گرانی و برسێتی لەوەوەیە کە کوردەکان لایەنگری عوسمانیەکانیان دەکـرد وە دژ بـە ڕوسـەکـان دەوەستان. بەهۆی ئاگربارانی جەنگەوە دەغل و دانەکانیان سووتاون، وشکە ساڵیش هاتۆتە پاڵی. فریا گـوزاری کەم بوو. وە بە هۆی وێران بوونی گوندەکان و نەمانی ئاسایش , ڕێگە و بان خۆراک نەدەگەیشتە گەلێ شوێن. دکتۆر ئاڵین داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات کە چل هەزار دانیشتوی شارەکە ٧٥٪ ئافرەتی بەتەمەن و بێوە ژن و منداڵی بێ باوکە. ٢٥٪ کەی تری پیرە پیاو و پەککەوتەیە. بە پێی ئاماری ساڵی١٩١٠ ژمارەی دانیشتوانی سابڵاخ لە نیوان دە هەزار بۆ پانزە هەزار بوو بەڵام ڕێژەی دانیشتوان بەهۆی کۆچکردنی خەڵکانی گوندەکانی دەوروبەر و گوندە ئەرمەنیە کانەوە بۆ سابڵاخ (٢١) , قەرەباڵغیەکی لە سنوور بەدەری بەخۆوە بینی. فریا گـوزاری ڕۆژهـەڵاتـی نزیک، لە بنەمادا بۆ یاریدەدانی ئەرمەنیەکان و ئاسوریەکان دامەزرا بوو، دواتر تەرخان کرا بۆ یاریدەدانی یۆنان، تورکیا، سوریا و ئێران (٢٢).

## کۆنترین بڵاوکراوەکانی زمانی کوردی لە ئێران دا

The Earliest Publishing in Kurdish in)
(Iran

پەخش بە هەچ زمانێک بێت پێویستی بە دوو فاکتەر دەبێ: جەماوەری خوێنەر و ئامێری لە چاپدان ئەم بە تایبەتی گرنگ بوو لە حاڵەتی بڵاو کـراوەی وەرزیدا، چونکە ئەم جۆرە بڵاوکراوانە دەنگوباسیان باش تر دەگەیاندە جێ لە سەدەی بیستەمدا وەک لە کتێب (٢٣). چاپەمەنی ئەوسەردەمەی ئاسوریەکان دەنگوباسی ئێران و بەتایبەتی هەردوو شاری تاران و تەبرێز و ناوچەیی و نێو دەوڵەتی دەخستە ڕوو.

لە حاڵەتی بەخشی دەوری کوردیدا، گرنگ ئەوەیە پێشینەی مێژوەکەیان تێبگەین، بە پێی زنجیرەی دامەزراندنیان، تاکو وێنەیەکی ڕوون بخەینە بەردەست کە چۆن ئەم سێ بڵاوکراوە کوردیە هاتونەتە ئاراوە. ئێمە تاکو ئێستە یەکێک لەو بڵاوکراوانە کەوتووەتە دەستمان , بە هەر حاڵ گرنگی سەرەکی لەوەدایە کە بتوانین سەر لەو سەرلێکچوونە دەرکەین کە لە پەخشی شاندی لۆسەری ڕۆژهەڵاتەوە کەو تبووەوە پەخشێکەوە کە ناوی مژدە بەری کوردستان بوو، واتە:

"Missionary The Kurdistan" یاخودTKM hence forth""ئەم پەخشە نابێ تێکەڵاو بە بڵاو کراوە کوردیەکانی باشوری ڕۆژئاوای ئێران بکرێت کە بە شێوەی گۆڤاری وەرزی یان کتێب دەردەچوون. TKMپەخشێ بووە کە لە ویلایەتە یەگرتووەکان دەردەچوو , لە هەمان کاتدا لە گەلێ شاری وەکو شیکاگۆ، یەک لە دوای یەک مانگانە هەر لەساڵی ١٩١٠ تاوەکو ١٩٢٨بە زمانی ئینگلزی دەردەچوون و دەخرانە بەر دەستی خوێنەران.

TKM یەکەم بڵاوکراوە بوو کە ناوی کوردستان هەڵگرێ لە دەرەوەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕستدا , ئـەم ڕاستیە بەتەنها سـەرنـج ڕاکێشە , وێـڕای ئەمەش TKM بەهەمان شێوەی ئەو وێنانەی کە مژدەبەرەکان لەسەفەرەکانیانەوە دەیان هێنانەوە , یان باسیان دەکرد، بەشداریان دەکرد لەوەی کە کورد بەگەلانی ئەوروپا و ئەمەریکا بناسێنن (٢٤) ئەم ڕاستیە لە مەودایەکی دووردا، ڕەنگە بوو بێتە هۆی سۆزی ئەوروپی و ئەمریکی بەرامبەر بە کورد , وە بوو بێتە خواستی زانستخوازان لەساڵی ١٩١٧وە. Mons Alson Wee (مونس ئەڵسۆن وی) (١٨٧١-١٩٤٢) بوو بە سەرنووسەری گۆڤارەکە. وی پرۆفیسۆرێکی نەرویجی بوو لە کۆلێژەکانی

سانت پۆلی لۆسەری لەویلایەتە یەکگرتووەکان وانەی دەوتــەوە. ئەم پرۆفیسۆرە داکۆکیکەرێکی پتەوی Haugeanism بــوو، واتــە هەوڵی بۆ بوژانەوەی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی سیاسی دەدا. هۆگیانیزم بزوتنەوەیەک بوو بۆ پێکەوە ژیان و یەکتری قبوڵ کردنی نێوان کۆچەرانی نەرویج و نەتەوەکانی تر لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا , کە لە سەدەی هەژدەهەمەوە لە نەرویج پەرەی سەندبوو. ئەڵسۆن وی لەگەڵ سەرۆکی مژدەبەری لۆسەری ڕۆژهــەڵات کە نــاوی N.H.Lohre بوو کەوتنە هاوکاری بۆ دابین کردنی فریاگوزاری بۆ کورد، دژ بەوانە وەستانەوە کە بەلایانەوە وا بوو موسڵمانەکان پێویستیان بە یارمەتی مرۆیی نییە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە کــوردەکـان بەشداری هێرش بردنە سەر مەسیحیەکانیان دەکرد (٢٥).

لەو سەردەمەدا، گۆڤاری TKM گوڕوجۆشی دا بە کاری مژدەبەریی بۆ کوردەکان. کاری سەرەکی گۆڤارەکە لەو بوارەدا ئەوەبوو کە زەمانەت بۆ ئەو ژن و پیاوانە دابین بکەن لە کاتێکدا کە لە دەرەوەی وڵاتن. وەک نموونەیەک , خاتوو ئاگۆستا گودهارت پەرستیارێکی ئەڵمانی بەئەسڵ پۆڵەندی بوو , پەیوەندی کرد بە کەنیسەی فیلادێلفیاوە بۆکاری مژدەبەری سەر بە کورد، کەنیسەکەش مەسرەفی ئەم خاتوونەو زەمانەتی تەندروستی گرتە ئەستۆ. لەهەمان کاتیشدا ئەم لەخواترسانە یارمەتیدانی کوردی سابڵاخیان پەسەند کرد (٢٦) و لە هەمان کاتیشدا شاندی ڕۆژهەڵاتی لۆسەریەکان هەستیان جوولا و قەرزیان دا بە سپۆنسەرەکانی کەنیسە. بۆ ئــەوەی Rev. and Mrs. Bachimont لە ئەڵمانیاوە ڕەوانەی کوردستانی ئێران بکەن و کاری مژدەبەری و یارمەتی بۆ کورد دابین بکەن.

ئەڵمانییەکان هەمیشە یارمەتی ئاسوورییەکانیان دەدا , بــەڵام لەساڵی ١٩٢٠ دا ناچاربوون ئەم یارمەتیە ڕاگرن , ئەوەش بەهۆی دابەزینی نرخی مارکەوە بوو.

بــەهــۆی ئــەم بــڵاوکــراوەوە , کــە یەکەم بڵاوکراوەی ئەمریکی بوو تایبەت بە کورد، مژدەبەرانی نێو مەیدانی ئیشکردن دەیان توانی زانیاری لە بابەت چۆنێتی بەرەوپێشەوە بردنی کاری ڕوونکردنەوەی ئەنجیل لەناو کوردەکاندابخەنە ڕوو. کار لەنێو کوردەکاندا بەهەمان شێوازی ئەو سەردەمە دەکرا کە لەشوێنانی تری جیهاندا مژدەبەرانی تر ئەنجامیان دەدا. مژدەبەرانی ئەو سەردەمە وەک ئێستەی دەزگا ناحکومەتیەکان (NGO) لە میانەی ڕۆژنامەنووسی ئازاددا کاریان دەکرد. هەر ئەوان بوون کە توانیان ببن بەچاو و گوێی هەردوو چینی ناوەڕاست و باڵای کۆمەڵگەی ئەمریکی بۆ ئەوەی وێنەی شوێنە دوورە دەستەکانی وەک ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، چین، هیند و ئەفەریقا بخرێنە بەرچاو.

لەبەر ئەوەی بڵاوکراوە گشتیەکانی مەسیحیەت، بۆ نمونە (Christian Herald) زۆر بە فراوانی دابەش دەکرا لە ویلایەتە یەکگرتوەکاندا لە نیوەی یەکەمی سـەدەی بیستەمدا، توانرا کێ برکێ لە گەڵ بـڵاوکـراوە ئەڵمانیەکاندا بکەن و سەرنجی ئەمریکیەکان زیاتر بەرەو کوردەکان ڕاکێشن. لە سەرو ئەمانەشەوە پێشەوای نیشتمانی جۆن مۆت (١٨٦٥-١٩٥٥) بەدەستهێنەری خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئاشتی , لە ساڵی ١٩٤٦ دا , دەوری سەرەکی بینی لە خۆشکردنی پەیوەندیەکانی حکومەتە ڕۆژ ئاواییەکان و مـژدەبــەران , بە تایبەتی ئەوانەی کارەکانیان کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی نزیکەوە. لەبەر ئەوە بە سونبلی هەمیشەیی TKM ڕەچاو دەکرا. لە ڕاستیدا هەر ئەویش بوو کە ژمــارەی هەموو کوردەکانی بە سەراپای جیهان ناساند ئەوساکە ٣

ملیۆن و نیو دەبوون.
بڵاوکراوەکانیTKM به بەشداری کردنی کۆلێژەکان و کەنیسەکان دەکرا. تاکە کەسیش ڕۆڵیان دەبینی لـەم گـۆڤـارەدا. مەسرەفی گۆڤارەکە بە پـارەی بەشداربووەکان دابین دەکرا. ژمارەی مانگانە بە ڕێکی و لە کاتی خۆی دا دەردەچـوو , کاتێک کە دەنگ و باسی کوردستان بەرەو کزی ڕۆیشت، سەر نووسەر کومەڵێ وتاری لەسەر دەقەکانی قورئان بڵاو دەکردەوە، لەسەر موسڵمانەکانیش وتاری دەنووسی , لە هەمان کاتیشدا وتارە کۆنەکانی لەسەر مەسیحیەت دووبارە بڵاودەکردەوە , بە تایبەتی ئەو وتارانەی کە لە ئەفریقاوە نێردرابوون نەک لە ئێرانەوە یاخود لە ڕۆژهەڵاتی نزیکەوە. گرنگی دان بە ڕۆژهەڵاتی نزیک و باسی تایبەت بە کوردەکان لەبەر ئەوە بوون کە سەرنج ڕاکێش بوون.
تەنانەت دوای ئەوەی کە ڕێگە لە ئەندامانی شاندی لۆسەری گیرا کە لەساڵی ١٩١٦ دا و نەیانتوانی بگەڕێنەوە بۆ سابڵاخ , ناچار بوون کە لە ڕێگای فریا گوزاری لەڕۆژهەڵاتی ناوراستدا کار بۆ کورد بکەن , بۆ نمونە لە ئەریڤان پایتەختی ئەرمینیاوە،لە تەبرێزەوە بە هۆی دانیشتووە ئاسوریەکانەوە یارمەتی کوردییان دەدا. بگرە لە هەمەدان و بەغدادیشەوە ئەم کارەیان ئەنجام دەدا.
مژدەبەرانی کوردستان بوو بوون بە سەرچاوەیەکی گرنگی زانیاری دەربـارەی ڕوداوەکـانـی سابڵاخ و شارۆچکەکانی دەوروبـەری. لە سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا گەیشتنی مـژدەبـەران قەدەغە کرابوو، لە لایەکی تریشەوە بەهۆی پیکدادانی نێوان کۆساک و جەندرمەدا کە دوا بە دوای شۆڕشی ئێرانی ڕوویدا , و بارو دۆخی کار و ئەرکی مژدەبەران بوو بە کارێکی نائاسایی.
ئـەو وێنانەی کە فۆسوم دەی کێشان لە کاتی سەفەرەکانی تەبرێزو دەوروبـەری تەبرێزدا پێش جەنگی جیهانی یەکەم و لە گۆڤاری TKM دا بڵاوی کردۆتەوە بە جوانترین و کونترین دیمەنی فۆتو گرافیکی شاری سابڵاخ دەژمێردرێن. هاوکات ئەو نەخشە جیوگرافیانەی کە لە ناوچە کوردیەکاندا کێشاویەتی تا ئێستاش بە گرنگ دەژمێردرێن. ئەم گۆڤارە وەرزییەی ئەمریکا ئەوەی ڕادەگەیاند " کە کەنیسەی لۆسەری ئەمریکی ئەوەندە گرنگی بەم بابەتە دابوو کە ئەتوت بەلایانەوە: کوردستان موڵکی حەزەتی عیسایە!" (٢٧). هەرچەندە بەشی زۆری ژمارەکانی گۆڤاری TKM ماوەو تەواو سوود بەخشن، بەڵام مژدەبەرانی ناوچەی کوردستان زۆر کەم نمونەی نووسینی کوردییان پیشان داوە , ڕاستە حاشاش لەوە ناکرێت کە سەرچاوە کوردییەکان کەمن.
فۆسوم کامێرەیەکی بەدەستەوە بوو , وێنەی مناڵ و گەورە و چەندین گروپی تری دەگرت. بەشێکی زۆری ئەم وێنانە لە بڵاوکراوەکانی TKM داپیشاندراون وا دەردەکەوێ کە پەیوەندی لەگەڵ تاکی کوردا ناوبەناو بووبێت , ئەو کەسەی کە بەزۆری ناوی براوە , یان باس کراوە , ئیسماعیل ئاغای سمکۆ بووە
(لەساڵی ١٩٢٩دا کوژراوە).سمکۆ بۆ نزیکەی بیست ساڵ بە خۆی و میلیشیاکانیەوە لە دەڤەری ئازربایـنجانی ڕۆژئاوا بینراوە، پەلاماری گوندەکانی هاوڵاتیەکانی خۆی داوە کە نیشتەجێی کورد و تورک بوون، گوندە ئاسووریەکانیش لەم پەلاماردانە بێ بەش نەبوون.
لەپاڵ سمکۆدا، هەندێک ناوی وجاخ زادەی کوردەکان هاتووە، تەنانەت باسی هاوسەرەکانیشیان کراوە. ناوی مستەفا قازی هاتووە کە ئەوسا قوتابی کۆلێژی پزیشکی , لە خەستەخانەی فێرکاری حەیدەر پاشای ئەستەنبوڵ بـووە. مستەفا کوڕی خانەوادەیەکی

ناسراوی سابڵاخ بووە.خەڵکە محەلیەکانی تری سابڵاخ (کەباس کرابێتن ) جولەکە و ئەرمەنی و کارمەندانی ڕوسی بوون لە سابڵاخ. بەهەرحاڵ ناوی هەندێ بازرگانی موسڵاوی هاتووە کە بۆ خۆیان کاسۆلیکی کلدانی بوون و پەیوەندی مژدەبەرییان بەو گروپانەوە نەبووە.

ئەو کەسانەی زۆر بە تایبەت سوودبەخش بوون بۆ لۆسەریەکان، خێزانە تێکەڵەکەی میرزا شمۆئێل بوو کە مەسیحی و جولەکەبوون و بە زمانی ئارامی قسەیان کـردووە. کاتێ کە مـژدەبـەران سابڵاخیان بەجێ هێشت ئەمانیش کەوتنە تەکیان , بەقسەی خۆیان لەبەر برسێتی کۆچیان کرد نەک لەبەر مەترسی ژیان (٢٨). لە کاتێکدا کە میرزا لە ساڵی ١٩١٥دا تەقەی لێکرا و کوژرا , مژدەبەران بەڵێنیان دا خێزانەکەی بەخێوکەن. ئەم خێزانە پێکهاتبوو لە خاتوو جەواهیر و چوار منداڵ. لە بنەڕەتدا میرزا مامۆستای زمانی کوردی قەشەی پایەدار فۆن ئۆرتسۆن بوو، وە کاری وەرگێڕانیشی بۆ دوکتۆر فۆسوم کردوە. پێدەچێت میرزا شمۆئێلی ڕێنیشاندەری فۆسوم بوو بێت. لەڕاستیدا بەرپرسەکانی لۆسەری تەبرێز میرزاخان کەرەمیان کردبوو بە ڕاوێژکاری خۆیان. لەکاتی سەردانی سابڵاخ دا (٢٩).

کەمی سـەرچـاوەدان بە تاکەکانی کـورد ئەوە ناگەیەنێت کە جیاوازی کراوە. تەنانەت دوای کوشتنی ڕێڤ ئیمانۆئێڵ دامان لەساڵی ١٩٠٧دا (٣٠) قەشەی فەڕەنسی بەناوبانگ جۆرج باشیمۆنت کە شارەزای کوردۆلۆجی بـوو , بەرگری زۆری لە گەلی کورد کردوە. وە وەک سەرنووسەری TKM لەساڵی ١٩٢١ دا وتارێکی نووسیوە و دەڵێ "ئایا ئێمە دەتوانین ٣ ملیۆن و نیو کورد تۆمەتبار بکەین بە کوشتنێک؟ " (٣١) بەهەمان شێوەش کاتێ کە قوربانی دووەم، پیاوێکی فەڕەنسی بـوو , کـوژرا، وایـان خەمڵاند کەهۆی کوشتنەکەی ئەوە بووە لەپیاوێکی ئەرمەنی چووە. بەرگریش لە کورد کراوە و وایان هۆنیوەتەوە کە بکوژان کـوردی دانیشتووی سابڵاخ نەبوون. وە ئەگەری ئەوە هەبووە کە چەکدارەکانی سمایل خانی شکاک بووبن (٣٢). لەوە دا، کە کوردەکان کاندیدی چاکن بۆ بە مەسیحی کردنیان، قەناعەتی بە ئەمەریکیەکان و ئەڵمانیەکان کردوە کە باش وایە ڕۆژێک زووتر بچن بەدەنگ کوردەوە و هەوڵی بەمەسیحی کردنیان چڕتر بکەنەوە. هەرهەمان قەناعەت وای لەئەندامانی لۆسەری ڕۆژهەڵات کرد کە نزیکەی سەد ساڵ لەمەوپێش هەمان هەوڵ بدەن وەڵی هەوڵەکانیان لە سابڵاخ بێ هۆدەبوو (٣٣).

ئەمڕۆ بەشێوەیەکی مۆدێرن لەسایتەکانی ئەنتەرنێت وانە بەو کوردانە دەگوترێتەوە کە بوون بە مەسیحی , ئەم باسە هەرچەندە کورتە بـەڵام مژدەبەرێکی بەرفراوان دەگرێتە خۆ، باسی لەحاڵوباری سەردەمی دەرچـوونـی بـڵاوکـراوە وەرزیەکانی کـوردی بۆیە دەکرێت چونکە زانیاری دەربـارەی زمانی کوردی دەدات. ئەو پەخشە کوردیانەی کە لە باکوری ڕۆژئاوای ئێران، لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا دەردەچوون. ئێستا ڕوونیان دەکەینەوە و سەرچاوە دامەزرێنەرەکانیشیان باس دەکەین.

## پەخشـە وەرزیەکـانـی زمـانـی کـوردی لەئازربـایـنجـانـی ڕۆژئاوا

## (Kurdish Language Periodicals from West Azarbaijan)

ئاهەنگی ڕۆژنامەوانی کوردی بە بۆنەی تێپەڕبوونی سەدەیەک بەسەر دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لە قاهیرە، لەساڵی ١٩٩٨ دا , گێردرا. ڕۆژنامەکە ناوی کوردستان بوو لە میسری سەر بە بەریتانیا دەردەچوو. لە ئێران و ئیمپراتوریای عوسمانی دا کە کوردەکانی تێدا دەژیان، پەخشی وەرزی بەزمانی

کوردی دە دوانـزە ساڵێک دواتر دەرچـوو. یەکەم پەخشی کوردی کە بڵاوکرایەوە لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، لە ئەستەمبووڵ لە چـاپ درا، لە ساڵی ١٩٠٨ دا , ئەمەش دوابـەدوای نووسینەوەی دەستووری لیبراڵی تورکی لە هەمان ساڵدا ڕوویدا. ئەی کەواتە کەی بۆ یەکەم جا ڕپەخش بە زمانی کوردی لە ئێراندا دەسپێکرد؟ پەخشێکی زمانی کوردی کتوپڕ لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری مهاباد دا دەرچوو، چاپخانەکەی لە لایەن یەکێتی سۆڤیەتی دۆستیانەوە دابینکرا بوو.لەوە دەچێ چاپخانەیەکی هاوشێوەش لە تەبرێز لە هەمان کاتدا هەبووبێ (٣٤).

چالاکی ئەوسەر وەختە بەباشی لەلایەن سەر چاوە سۆڤیەتیەکان و جیهانی ڕۆژئاواوە ناسراوە بەڵام بە کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران لە ساڵی ١٩٤٦ دا , پەخشی ڕۆژنامەوانی لە باکووری ڕۆژئاوای ئێراندا بە هەڵکوتانە سەر سوپای ئێران بۆ سەر هەردوو کۆماری مهاباد و ئازربایـنجان ڕاوەستێنرا، بزوتنەوەی ئازادی خواز و ڕۆژنامەوانیەکان هاتنە کۆتایی. هەموو ئەو بڵاوکراوانەی ئەو سەردەمە وەک ئەوانەی پێشتریان کە لە ئێران دەردەچـوون، بە پیتی عەرەبی دەستکاری کراو لە چاپ دەدران.

لە ساڵی ١٩٤١ دا هەڵمەتی خوێندن لە ئێراندا دەستی پێکرد، لە شار و شارۆچکەکاندا قوتابخانە کرایەوە. خوێندن بە زمانی فارسی بوو , منداڵانی نەتەوەکانی تر بە زۆرە ملێ فێری زمانی فارسی دەکـران بەبێ گوێدانە زمانی دایـک. بە هەرحاڵ وەرگێڕانی زمانی فارسی بۆ کـوردی لە میانەی خوێندندا کارێکی قـورس نەبوو. لە کاتێکدا کە دامەزراندنی کۆماری کوردی لە مهاباد جاڕی بۆ درا , ئاسانی ئەم کارە دەرکەوت بە تایبەتی کورد و فارس هەمان ئەلف و بێیان بەکار دەهێنا. بە هەر حاڵ، هەتاکو ئێستاش سەرچاوەکان یەکلایان نەکردۆتەوە، لە کوێ و کەی لە چ بارەدۆخێکدا پەخشی کوردی لە ئێران بۆیەکەم جار دەرکەوتوە. ئیدوارد براون، لە دیراسە سەرچاوەییەکەیدا، دەربـارەی پەخشی دەوری لە ئێراندا، هەرچەندە باسەکەی گەیشتۆتە زەمانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم بەڵام سەرچاوە بە بڵاوکراوەی کوردی نادا. تەنانەت شرۆڤەخوازێکی هوشیاری وەکـو داڤـیـد مـاکـرواڵ، کـە بـۆ خۆی باڵاترین سەرچاوەی زانیاری سەردەمی ئێستەی کوردە، دووچاری سەرلێتێکچوونێک بووە لە میانەی دەستنیشانکردنی بڵاوکراوە کۆنەکانی کورد لە ئێران. باس لە ڕۆژی کوردستان دەکات کە گوایە لە سابڵاخ دەرچووە (بڕوانە لاپەڕەی ٢٢١ ی کتێبەکەی). کە باس لە بڵاوکراوەیەک دەکات بە بێ ئەوەی هیچ سەرچاوەیەک بدات بە ناونیشانی.

ئەو بڵاوکراوە ئێرانیەی زمانی فارسی کە هەوڵی پێشنیارکردنی مێژووی ڕۆژنامەگەری ورمێی داوە، نـاوی ٣ ڕۆژنـامـەی کـوردی دەخـاتـە ڕوو کە لە سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا دەردەچـوون. ئەمانەش لە هەمان سەردەمدا بوون کە چالاکی ئەمریکی مژدەبەری لە کوردستاندا بەهێز بووە , هەر لەو سەردەمەدا بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد و هەموو گروپە نەتەوایەتیەکانی تری ناوچەکانی عوسمانی و ئێران جۆشیان سەندبوو. لە بەر ئەوە هەموو شیکردنەوە و شرۆڤەیەکی بڵاوکراوەکانی کوردی ئەو سەردەمە لە گەلێک ڕووەوە سوودبەخش دەبن. ئەمەش بڵاوکراوە دەوریەکانی کوردیە کە لە

سەرچاوە فارسیەکاندا خراونەتە ڕوو:

| ناو | سەرنووسەر | دەسگای پەخش | زمان | شوێن | بەروار |
|---|---|---|---|---|---|
| کورد | موحەمەد قاریحی | نەی بوو | کوردی | | ١٩١١ زاینی /١٣٣٠ کۆچی |
| کوردستان | عەبدول رەزاق بەدرخان | سمکۆ | کوردی | | ١٩١٢ زاینی /١٣٣١ کۆچی |
| کورداە | موحەمەد تارجانی | نەی بوو | کوردی | | ١٩٢١ زاینی /١٣٤٠ کۆچی |

| Periodical | Editor | Publisher | Language | Location | Dates |
|---|---|---|---|---|---|
| Kurd | Mohd. Qarihi | none | Kurdish | Urmia | 1330 HQ/1911 |
| Kurdistan | Abdul Razzaq Kak Badr Khan | Simku | Kurdish | Urmia | 1331 HQ/1912 |
| Kurdah | Mohd. Tarjani | none | Kurdish | Urmia | 1340 HQ/1921 |

لەنەخشەیەکی شیکاری زانیاریەکانی بڵاوکراوەکانی ئاسووریدا ئەم زانیاریانەی سەرەوە دەربارەی پەخشی کوردی وەرگێڕدراوە , بەهەرحاڵ ئەوەی زانیاریەکانی کۆکردۆتەوە نەیتوانیوە بۆخۆی هەموو بڵاو کراوەکان یان نمونەکانی بخوێنێتەوە. تووشی سەرلێتێکچوون بووە لە نێوان زمانی کلدانی و ئاسووریدا، وە هەروەها لە دەرخستنی بەروارەکاندا (٣٧). بەڵام گومان لەو بۆچوونە ناکرێ کە ئەو ئەلفابێیەی بەکار هاتوون لە بڵاوکراوە کوردیەکاندا , یان فارسی بوون یان تورکی ئازەری بوون.

لە لایەکی تریشەوە، لە حاڵەتی پەخشە ئاسووریەکاندا بۆخۆی نەیتوانیوە ئارامی بخوێنێتەوە وە نەی توانیوە رەمزی ئەلفابێی ئارامی شیکاتەوە , وە هەستی بەو هەڵانەش نەکردووە کە لەو زمانەدا کراون.

بە هەرحاڵ مێژووی چرپڕی ورمێ بەو شێوەیە بووە، وەلێ ڕەنگە کەم وکوڕی هەبوو بێت لە ناسینی بڵاوکراوەکانی زمانی کوردی. لێرەدا دوو خاڵ پەیوەندییان بەم بڵاوکراوانەوە هەیە: یەکەم سمایل خانی سمکۆ کاریگەری هەبووە بەسەر هەموو ئازربایجانی ڕۆژئاوادا , بەڵام بەڵگە کەمە کە تاوەکو ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢١ کاری بەشاری ورمێ هەبوبێ. دووەم ڕەنگە ڕۆژنامەی کوردستان هەمان ڕۆژنامە بووبێ کە لە میسر دەرچووە و لەڕێی ئەستەنبوڵەوە هێنابێتیان بۆ سابڵاخ. بەڵام ئەگەر وابوایە ئەوە لە ساڵانی ١٩١١-١٩١٢ دەیان هێنا چونکە ئەوساکە خێزانی بەدرخان لەوێ دەژییان. جێی گومانە کە سمکۆ بەو کارەی پەخش و بڵاوکردنەوە هەستابێ.

ئێمە خۆمان لەبەرامبەر ئەم پرسیارانەی خوارەوەدا دەدۆزینەوە: تا چ ڕادەیەک کەموکوڕی لەباسەکەی پەخشە وەرزیەکانی کوردی دا هەیە ؟ دەشێ پەخشی کوردستان لەورمێ بووبێ بەڵام لەلایەن کەسێکی ترەوە بڵاو کرابێتەوە ؟ دەبێت بڵاوکراوەیەک هەبووبێت ناوی ڕۆژی کوردستان بووبێت وە ئەم بڵاوکراوەیە، وەک ماک دواڵ باسی دەکات، لەسابڵاخ دەرچووبێت؟ لەسەروو

ئەمانەشەوە، ئایا ئاستی ڕۆشنبیری سەرنووسەران چۆن بووە ؟ لەکوێ خوێندویانە ؟ چ چاپخانەیەکیان بەکار هێناوە ؟ ئایە دەقی ئەم پەخشانە دەبێ بەدەلیلی ئـەوەی کەنووسەران نوێنەری ویژدانی کوردبن و لەڕەحمی چینە ڕۆشنبیرەکانی کوردەوە هاتبن , یان ئۆرگانی ئاغاو بەگزادەکان بووبێتن ؟
بەبێ بوونی نموونەی ڕاستەقینەی بڵاوکراوەکان ئەستەمە وەڵامــی ئـەم پرسیارانە بـدرێـتـەوە. وەلێ دەتوانین پێناسەی ئەوانەی کە بەشداریان لەسەرەتای ئەم پەخشە کۆنانەدا کردووە، بخەینە ڕوو. بەڵگە هەیە کە یەکێک لەو سێ گۆڤارەی کە بڵاوکراوەتەوە وێنەی هەیە و بووە بە تەوەری سەرەکی باسنامەکەی حەسەن پوور (٣٨). ئەم ژمارەیە لەساڵی ١٩٢١ زاینی بەرامبەر بە ١٣٤٠ کۆچی لەورمێ دەرچووە. باس لەپلانێک دەکات کە ببێتە زمان حاڵی هەفتانەی حکومەتەکەی سمایل خانی سمکۆ!
لە ناونیشانی بەرگی گۆڤارەکە و ئەو زانیاریە و دەست دەکەوێ کە بەهەرسێ زمانی کوردی وفارسی وتورکی نوسراوەی تێدا هاتووە. ڕستێکی عەرەبی لـەسـەرووی هەموویانەوە هاتووە کە لەڕاستیدا ئایەتێکی قورئانە , دەقی ئایەتەکەش دەڵێ : ( "واعت×موابحبل الله جميعا□ ولاتفرقوا". ئەم ئایەتە لەسوورەتی عمران دایە ژمارەی ١٠٣ هەڵدەگرێ) سـەرچـاوە فارسیەکە دەڵــێ نـاوی سەرنووسەر موحەمەد تەرجانی بـووە , وێنەیەکی سەربەرگی گۆڤارەکە ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێ.
حـەسـەن پـوور نـاوی بـڵاوکـراوەکـە بـە ڕۆژی کـورد دەناسێنێ , و دەڵــێ ئورگانی ئـیـدارەی شۆڕشگێرسمایل ئاغای سمکۆ بووە لە ئێران (٣٩). ناوی هیچ تۆمارکراوێکی بڵاوکراوەی کوردی ساڵی ١٩١١ لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا دەرنەکەوتووە.

بە هەمان شێوەش سەرنووسەر موحەمەد قاریحی لەلایەن سەرچاوەکانەوە پێناسە نەکراوە , کێشەی دڵنیابوون لەبوونی بڵاوکراوەی سێهەم (کوردستان) , لەوە دەچێ بەرەو یەکلایی بوون بڕوات. سەرچاوەی فارسی بەروارەکەی دەگێڕێتەوە بۆ ١٩١٢ ز-١٣٣١ک. بەڵام گومانی جدی لەوەدایە تاچ ڕادەیەک سەرچاوە فارسیەکە جێگەی باوەڕە. ڕاستە سەرنووسەر ناوی خێزانی بەدرخان هەڵدەگرێ و دەڵـی سپۆنسەر سمکۆ بووە , لێرەدا گومان پەیدا دەبێ ! چونکە سمکۆ لە ناوچەی سەرنووسەری ئێران و ڕۆژهەڵاتی تورکیادا جموجۆڵی کردووە و ئەستەمە ئیشێکی بە بەدرخانیەکان هەبوبێ.
ئەوەی ڕوون نییە، ئایە هەر لەبنەڕەتدا بڵاوکراوەیەک هەبووە بەناوی کوردستانەوە؟ بەڵگەی پەسەند کراو لەوەوە ڕەچاو دەکرێ کە شاندێکی مژدەبەری لۆسەری یاخود ئاینزایەکی تر لەورمێ حەزیان بە بڵاوکردنەوەیەکی دەوری کوردی کردبێ. وە هەمیشە حەزیان بەوە کردووە کە بچنە ناو کوردەکانەوە، هەتاکو ساڵی ١٩١٣ هەوڵیان بەردەوام بۆ کارکردن لەگەڵ کوردا کردووە. فۆسوم و ئێدمان چاوەڕێیان دەکــرد کـە ئەمریکیەکان بـەکـاری کـردنـەوەی خەستەخانە هەستن و کاری ڕۆشنبیری بسپێرن بە لۆسەریەکان. دەشێ ڕۆژنامەیەکی کوردی لە سابلاخ لەلایەن لۆسەریەکانەوە بڵاوکرابێتەوە ؟ ڕەنگە نەبووبێ ، هەرچەندە ماک دوال باس لەکەسێک دەکات کە لەو شوێنەدا بڵاوکراوەی وەرزی بۆ سمکۆ دابین کـردووە. بە هەرحاڵ هۆکاری گومان کردن لەوەدایە ئایە چۆن دەستیان گەیشتووە بەچاپخانە؟ هەر لە ساڵی ١٩١٣بۆ ١٩١٥ فۆسوم لە نامەکانیدا باس لە زەروورەتی چاپخانەیەک دەکات. فۆسوم سەرقاڵی ئامادەکردنی کتێبی زیکر و سرودی ئاینی و کتێبەکانی خوێندنی قوتابخانە بوو، بۆ ئەم کارە

پێویستی به دەسگای چاپەمەنی بوو. بەکارهێنانی دەسگای چاپەمەنی له شاری ورمێ کاتی زۆری دەویست و مەسرەفی قەبەی تێدەچوو. لەبەر ئەوە ناچار بوو به دەست کۆپیان بۆ بکات. بەڵێ فۆسوم گرێبەستی لەگەڵ دەزگای چاپەمەنی له ورمێ ئیمزا کردووە بۆ بڵاوکردنەوەو پەخشی زمانی کوردی. هەوڵی تۆکمەی داوە بۆ وەرگێڕانی چوار کتێبی ئاینی مەسیحی سەر زمانی کوردی که به (Gospel) ناسراون. ئەم پڕۆژەیە ماوەی دوو ساڵی خایاندوە. دەسگاکه تەنها ئامێرێکی دەستی شکاویان داوە به فۆسوم. سەد دۆلاریان لەبری بەکارهێنانی ئامێرەکه و سەد و پەنجا دۆلاریش لەجیاتی وردە بابەتی تر بۆ زمانی کوردی داواکردووە. ئەم ٢٥٠ دۆلارە دەبوایە لەلایەن کۆمەڵەی مژدەبەری لۆسەری ڕۆژهەڵاتەوە -له ئەمریکاوە بنێردرایە - بەڵام هەرگیز نەیان ناردوە , وێڕای ئەمەش خانەی چاپەمەنی تر له سابڵاخ نەبووە، ئەم پاشەکشێیە لەپارەدان کارەکانی فۆسومی قورس کردوە بەڵام ڕاینەگرتوون. بەواتا کتێبەکان پابەندی مۆرکردنی ئەم گرێبەستە نەبوون. دیارە فۆسوم کۆڵی نەداوە , به بەڵگەی ئەوەی چەند جارێک ژمارەکانی TKM لاپەڕەیان تەرخان کردوە بۆ ڕێزمانی کوردی که فۆسوم له ساڵی ١٩١٩ دا نووسیویەتەوە و له پاڵ ڕێزمانەکەیدا داکۆکی نەگۆڕاوی لەسەر وەشاندنی پەخشی دەوری زمانی کوردی کردووە , بەتایبەتی دوای ڕێکخستنەوەی شاندی مژدەبەر.

حەسەن پوور گومان دەخاتە سەر بوونی بڵاوکراوەی وەرزی کوردی کەلەدوای ساڵی ١٩١٤ وە دەرچوبێ (٤٠). حەسەن پوور ئاماژە به نامەیەکی کچەکەی فۆسوم دەدات که گوایە گوتوویەتی باوکی هیچ بڵاوکراوەیەکی کوردی دەرنەکردووە. (ئەم کچە کۆرپەیەکی دوو ساڵان بووە که سابڵاخی بەجێ هێشتووە، تەنها له تەمەنی ٤ساڵ بۆ ٦ساڵ چاوی به باوکی کەوتۆتەوە چونکه باوکی گەڕاوەتەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی نزیک و لەوێ کۆچی دوایی کردووە.) لەبەر ئەوە له توانای ئەو منداڵە ساوایەدا نەبوە ببێتە شایەتحاڵ لەسەر بڵاوکراوەیەک که به زمانێک نوسرابێت و بۆ خۆی شارەزای نەبووە ئەگەرچی باوکی دەری کردووە. ئەوەش ڕاستە که هەر به نامە ناردن ئەم کچ و باوکە پەیوەندیان به یەکترەوە کردوە.

هۆشیار قەرەداغی، مێژووناسی ڕۆژنامەوانی و چاپەمەنی کوردی له ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، پێناسەی بڵاوکراوەی کوردستان وەک (گۆڤارێک دەکا که له لایەن ئەڵمانیەکانەوە له شاری ورمێ بڵاوکرابێتەوە). ئەو نووسەرە ئەڵمانیانە سەر به شاندی مژدەبەری ئەڵمانی بوون، ژمارەی یەکەمیش دەگەڕێنێتەوە بۆ نیسانی ١٩١٤. قەرەداغی، هەر وەکو زانستخوازانی تری مێژووی بڵاوکراوەکانی کوردی و کەمە نەتەواویەتیەکانی تر زانیاری زۆری دەست نەکەوتوە , سەرلێتێکچوونی پێوە دیارە، له لایەکەوە داکۆکی لەسەر ئەمە دەکات که یەکەم شاندی مژدەبەری ئەمریکی له ساڵی ١٨٢٤ داگەیشتون، دەڵێ بڵاوکراوەکانیان ئامانجی سیاسی ڕوونیان هەبووە. وەلێ له لایەکی ترەوە دەڵێ ئەلمانیەکان ئینجیلیان وەرگێڕا بۆ زمانی کوردی به مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان له نێوان کوردەکاندا (٤١).

بەگەڕانەوە بۆ سەرباسی فۆسوم، ئەگەر بێتو بڵاوکراوەیەکی به ناوی کوردستانەوە دەرکردبێ - وەک ئەوەی بۆ خۆی لەگەڵی نوسراوەدا داکۆکی لەسەر دەکات- ئەوە بەبێ گومان یەکەم بڵاوکراوەی کوردیە له وڵاتی ئێراندا. ئەم کارەش خاڵێکی گەشەداری بەرچاوە له مێژووی کولتووری ئەدەبی

کوردیدا. بەڵام کێشەکە لەوەدایە تا ئێستا هیچ نموونەیەک نەخراوەتە ڕوو. هیچ ڕووبەرێک بۆ ئەم بڵاوکراوەیە لە گۆڤاری TKM دا تەرخان نەکراوە. بەهەرحاڵ ئەم جۆرە ڕووبەرە بۆ بڵاوکراوەکانی تریش تەرخان نەکراوە.
کاتێ کەشاندی لۆسەری گەڕانەوە بۆ سابڵاخ بینیان کە شوێنگەکەیان وێران بووە، سەقفەکەی داڕماوە و ئەوەی لەناویدابووە تاڵان کراوە , لێرەوە کاری شاندەکە چڕوپڕتر بووە , دەستیان کردوە بەپارە کۆکردنەوە بەشێوەی Funding بۆ کڕینی خۆراک، جل وبەرگ، دەرمان و دۆزینەوەی شوێنی کار بۆ خزمەتی دانیشتوانی ناوچەکە. لە هەمان کاتیشدا خەمی بونیادنانەوەی پەرستگاکەیان و خانەی مناڵانی بێ باوک وخەستەخانە و قوتابخانە و شوێنێکی ژیان بۆ شاندەکە بووە. ئەمانە هەموو لە کاتی جەنگدا وێران کرابوون. ئەم وێرانکردنە لە سەراپای باکوری ڕۆژئاوای ئێراندا ڕوویدابوو، هەمان چیرۆکی نەگریسی تاڵانکردن و وێرانکردنی پەرستگاکانی مەسیحیەکان وماڵی مژدەبەران دووپات بوو بووە. تەنها هۆکار بۆ مانەوەی نموونەکانی چوار بڵاوکراوەکەی زمانی ئاسووری ئەوەیە کە ئەم بڵاوکراوانە بۆ ماوەی ٧٩ ساڵ (بەتایبەتی یەکێک لەم بڵاوکراوانەیە ) بەردەوام بوون ، نوسخەیان لای بەشداربوان لە تەبرێز و وسانت پیترسیورگ و ویلایەتە یەگرتوەکان ماوەتەوە. لە ئەرشیفی مژدەبەرانیش هەندێکیان پارێزراون (٤٢).
لە هەموو حاڵوبارێکدا بڵاوکراوەکانی فۆسوم لە بازنەیەکی بچکۆلەدا خولاونەتەوە بەڵام ئەگەری ئەوە بەدوور نازانرێت کە لە تەبرێزدا پارێزراوبن.
ئایا ڕاستە مژدەبەرانی لۆسەری یەکەم بڵاوکراوەی کوردیان لە ئێران بەرهەم هێنا ؟
گومانکردن لەوەی کە دکتۆر لۆدڤێگ ئۆڵسن فۆسوم ئەوەندە دلسۆزی کورد و کـوردەواری بوو بێت عادیلانە نیە. بەڵێ فۆسوم مژدەهێنەر بووە بەڵام بە بەڵگەوە کاری زۆری کـردووە بۆ کورد. هەروا بە ئاسانی فێری کوردی نەبووە , ئەوە کە یەکەم ئیمامەتی خواپەرستی (بە ئاینی مەسیحی) بەزمانی کوردی بردوە بەڕێوە لە پەرستگایەکی هاکەزایی شـاری سابڵاخدا. لە پێنجی مایسی ١٩١٢ دا، چەندین سرودی ئاینی کردوە بە کوردی. کتێبەکانی قوتابخانەی لە فارسی و تورکی و ئاسووریە بۆ قوتابیانی کورد وەرگێڕاوە، گرامەری زمانی کوردی هۆنیوەتەوە و چوار کتێبی بە زمانی کوردی خستۆتە پاڵ ئەم خەزنە کولتوریانەوە. کاری خزمەتکردنی کوردی فراوانتر کردووە و لەگەڵ سەرجەم شاندە مژدەبەرەکانی ناوچەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی کاری کردووە بۆ لە ناوبردنی نەخوێندەواری لە ناو کوردەواریدا. ویستویەتی زمانی کوردیش- بە هەموو زاراوەکانیەوە- یەکخات (٤٣). بەرگری لە نووسین و چاپکراوەکانی خۆی کـردوە، کارەکانی بە ناو خوێنەوارە ئەمریکیەکانەوە بڵاوکردۆتەوە.
لـەو کاتانەدا کە برسێتی و گرانی کوردستانی گرتبۆوە , دەسەڵاتە مەسیحیەکان بڕیاریان دابوو کە یارمەتی بۆ موسڵمانەکان بە کوردەکانیشەوە نەنێرن بەڵام فۆسوم هەوڵی گۆڕینی ئەم بۆچوونەی داوە، هەوڵیشی داوە بوونی کوردەکان بپارێزێت لە کاتێکدا کە ئەوانیش وەکو ئەرمەنیەکان دووچاری کۆمەڵکوژی بونەتەوە لەلایەن سوپای تورکەوە- ئەم سوپایە بۆ خۆی کوردیشی تێدابووە- هەر بەهەمان شێوەش لەکاتی پەلاماری ڕووسەکاندا کەنیسە و خانە ئاینیەکانی کردووە بە پەناگای کوردەکان بۆئەوەی لە کوشتن بیان پارێزێ. کەواتە چ دەرفەتێک بۆ گومان کردن دەمێنێتەوە؟ چۆن دەکرێ گومان لەو قسانەی خۆی بکرێ کە گووتوویەتی بڵاوکراوەی کوردیم دەرکردوە , بەتایبەتی گومانەکەش لەو ڕێچکەیەوە

بێت کە لە مەسیحیەکی ئەمریکیەوە بۆ کورد وەشابێتەوە! لە کۆتایی ئەم قسەوباسەدا باشتر وایە ئەوە بە یاد بێنینەوە کە هەر مژدەبەرە مەسیحیەکان بـوون یەکێک لە گۆڤارە هـەرە درێژخایەنەکانی مێژووی ئێرانیان – تاوەکو کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم — بڵاوکردەوە! وەکو لەسەرەتای ئەم وتارەدا باسمان کرد ، گۆڤارەکە ناوی زاهیری دی بەهرەی ئاسوریەکان بوو.
لە ئاسیای ناوەڕاست جادیدیستەکان (Jadidists) هەوڵی چاکسازیان دەدا لە سەرجەم ناوچەکانی قەوقاس و تاتار دا، ڕێنماییە ئاینیەکانی خۆیان خستبووە ئەولاوە و ئەو مادانەیان پەسەند کردبوو کە مژدەبەرە ئەوروپیەکانیش ئەیانویست بەهەمان هیمەت و دەقــەوە لە باکوری ڕۆژئــاوای ئێراندا بڵاوبکەنەوە . وە هەر وەکو مژدەبەرە ئەوروپییەکانیش پاشکۆی نەهێشتنی نەخوێندەواری لەگەڵ بڵاوکراوە وەرزیەکاندا دەردەکـرد. فۆسوم هەمان کاری بۆ کـوردی سابڵاخ دەکـرد , بەڵام لایەنە ئاینیەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران بەرهەڵستی دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیەیان دەکرد کە بەکوردی و ئینگلزی دەیان خوێندو خوێندنیش بێ بەرامبەربوو. قوتابخانەکان لە لایـەن فۆسوم و هاوکارەکانیەوە دەکرانەوە، پرۆگرامی ئاینی مەسیحیشن تێیدا بڵاودەکردنەوە . بەڵام کاتێک کە شاندی لۆسەری بۆجاری چوارەم لەساڵی ١٩٢٢ گەڕانەوە بۆ سابڵاخ، کوردەکان لە هەرچوار لاوە باوەشیان بۆگرتنەوە و داوایان لێدەکردن کە قوتابخانە بۆ کوڕ و کچ بکەنەوە .
لێرەوە ئەگەرێکی بەهێز دێتە ئاراوە کە کۆمەڵێک لە پێشەواکانی ژیانەوەی کوردستان لەسەردەمی منداڵیاندا لەو قوتابخانانە خوێندبێتیان. دواتر لەساڵی ١٩٢٤ دا کۆمیتەیەکیان دامــەزرانـد. شارەزاکانی بایۆگرافی ئەم ئەگەرە بە دوور نازانن بـەڵام ڕەنگە پیاوی ئاینی و سۆفی وەکـو قازی موحەمەد و شێخ گەیلانێ لەم جۆرە قوتابخانەدا نەیان خوێندبێت , بەڵام لەو سەردەمەدا بوون، کە شەپۆلی ناشیۆنالیزمی کوردی لە هەڵچووندا بووە. هەندێ کورد دان بەفەزلی ئەمریکیدا نانێن بۆ ئەو ڕۆڵە گرنگەی کەبینیویانە لە بڵاوکراوکانی زمانی کوردیدا لە ناوچەیەکی چرپڕی کوردنشیندا.
ئەوەی ڕاستی بێت سمکۆش بەم کارە هەستاوە، خوێندەوارەکانی دەوروبــەری سابڵاخ و ساملاسی کۆکردۆتەوەو هانی داوە ڕۆژنامە بڵاوبکەنەوە , بانگەشەی بەناو وەستاکانی کردووە بۆ بونیادنانەوەو ئاوەدانکردنەوەی کوردستان (٤٤).
لەپاڵ بوون یان نەبوونی بڵاوکراوەی وەرزی کوردیدا، پرسیارێکی گرنگتر دێتە پێشەوە: ئایا فۆسوم چۆن ئەم ڕۆژنامەگەرییەی لە ڕووی فیزیاییەوە خولقاندووە ؟ ئایە وەک کتێبێکی "گۆسپێل"ی ئاینی مەسیحی وابــووەو لە ورمــێ لەچاپی داون ؟ لــەوە ناچێ. چونکە توشی تەنگ و چەڵەمە دەبوو لە ئاکامی ئەو هێرشانەی کە کوردەکان دەیانکردە سەر شاری ورمێ و گوندەکانی دەوروبەری لە ساڵی ١٩١٤ دا. هەر لەو ساڵەدا گوڵپاشان کە دەوڵەمەندترین شارۆچکەی دەڤەرەکە بوو توانای ئەوەی نەمابوو سەرانە بە کوردە هێرشبەرەکان بدات , ڕووبـەڕووی تاڵان و وێرانکردن بووونەوە لە لایەن چەکداری کوردەوە .
ئاسووریەکانی دانیشتووی دەڤەرەکەی ئەو سەردەمە ڕوویـان کردە خانووبەرەی مژدەبەرە فەرەنسی و ئەمریکیەکان. لەوێشدا بەهۆی نەبوونی بەرگرییەوە دووچاری پاکتاوی ڕەگەزی بوونەوە . وە هەروەها لە ساڵی ١٩١٨دا کوشتارێکی زۆریان لێ کرا.
گەڕانەوە بۆچالاکیەکانی دکتۆر فۆسوم لە ساڵی ١٩١٤ دا، ئەگەری گەورە هەیە کە چاوەڕێی داهاتی هاوینی هەمان ساڵی کردبێ بۆ هێوربوونەوەی بارودۆخەکە , چونکە لە هاوینی هەمان ساڵدا دەستی کرووە بە کاری وەرگێڕانی گۆسپێڵ بۆ زمانی کوردی.

دەزگـای سـەردەم وەک دەزگایەکی ڕۆشنبیریو چاپکردنی کتێبو گۆڤار، لـەماوەی دوو مانگی ڕابردودا، کۆمەڵێ کتێبی گرنگو بایەخداری، لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا، خستەبەردەست خوێنەرانی کورد. لەوانە بواری ئەدەب کە دوو ڕۆمان لەخۆدەگرێتو بریتین لە ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) ی ڕۆماننوس کـاروان عومەر کاکە سـور، لەگەڵ ڕۆمانی (ئەستێرەی زەرد)ی ڕۆماننوس جێنیفەر ڕۆیو وەرگێڕانی ڕەوەز. بواری زمانزانیو پەروەردەو فێرکردن کە ئەویش دوو کتێب لەخۆدەگرێتو بریتین لە کتێبی (سیستمی فێرکاری) هۆمەر قەرەداخیو کتێبی (زمانی فەرمی کوردستان) غازی عەلی خورشید. بـورای فەلسەفە کە سێ کتێب لەخۆدەگرێتو بریتین لە کتێبی (گرێ کوێرەکانی فەلسەفە) لە نوسینی فوئاد عەبدولرەحمان، کتێبی (چیرۆکە نەمرەکانی فەلسەفە) لە نوسینی هی□نری تـۆمـاسو دانـا لی تـۆمـاسو وەرگـێـڕانـی فەرشید شەریفی، کتێبی (فەلسەفە بۆ منداڵان) لە نوسینی کەریم مستەفا. یەکێک لە خەسڵەتەکانی کتێبەکانی ئـەم دوو مانگەی دەزگـای سـەردەم، بریتییە لە قەبارەی گـەورەی کتێبەکان، بۆ نمونە ژمـارەی لاپەڕەکانی کتێبی کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان، بریتییە لە ٥٤٣ لاپـەڕەی قەبارە گـەورە، ژمارەی لاپەڕەکانی کتێبی مێژوویەکی کورتی شارستانییەتو فەرهەنگی ئێران لە پێش ئیسلامدا کە لەلایەن وریا قانع لە فارسییەوە کراوە بە کوردی، بریتییە لە ٥٠٠ لاپەڕەی قەبارە گەورە. ژمارەی لاپەڕەکانی کتێبی چیرۆکە نەمرەکانی فەلسەفە بریتییە لە ٥٠٧ لاپەڕەی قەبارە گەورە. بەشێوەیەکی گشتی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم لە ماوەی ساڵی ٢٠١١ زیاد لە ٣٢ کتێبی قەبارە بچوکو مامناوەندیو گەورەی چاپو بڵاوکردۆتەوە، هاوشان لەگەڵ ئەم کتێبانەدا، زیاد لە ١٠ کتێبی گیرفانی چاپو بڵاوکردۆتەوە، ئەمە سـەرەڕای دەرکردنـی گۆڤارە وەرزییەکانی وەک سەردەمو زانستی سەردەمو گۆڤاری مانگانەی منداڵی سەردەم. واتە دەکرێ بڵێین سەردەم لەم ساڵەدا توانیویەتی مانگانە زیاد لە سێ کتێب بخاتە کتێبخانەی کوردییەوە، بەمەش ئەم دەزگایە بووەتە سەرچاوەیەکی باش بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیو وایکردووە خوێنەری کوردی تاڕادەیەک بە جیهانی کتێبو بە زمانی دایک ئاشنابکات.

## چیرۆکە نەمرەکانی فەلسەفە



# سیستمی فێرکاری




ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە نایابانەی دەزگای سەردەم لەم ساڵدا، بە چاپێکی جوانو دیزاینێکی جوانترەوە چاپو بڵاویکردۆتەوە. کتێبەکە لە دوتوێی ٥٠٧ لاپەڕەدا، باسی بەسەرهاتو وێستگە گرنگەکانی ژیانی کۆمەڵێ فەیلەسوفو بیریاری مەزن دەکات کە هەریەکەیان بەشێوەیەک لە شێوەکان، کاریگەریان لەسەر فیکرو فەلسەی جیهان هەبووە. کتێبەکە بە زمانێکی کوردی پوخت باس لە ئەندێشەو بەسەرهاتە سەیرو سەرنجراکێشەکانی ژیانی کەڵە نوسەرانی خۆرئاوا دەکات. ئەم کتێبە نایابە کە پێویستە هەمو خوێنەرێکی هەواداری زانینو مەعریفەو فەلسەفە بیخوێنێتەوە، تەنانەت هەمو خوێنەرێکی ئاسایش دەتوانێ بیخوێنێتەوەو چەند ساتێکی پڕ زانیاریو چێژو لەزەت لەگەڵ لاپەڕەکانیدا بەرێتەسەر، جگە لە پێشەکی وەرگێڕی کتێبەکە، لە ٣٠ وتار پێکهاتووە، هەر وتارێک باس لە ژیانو فیکری فەیلەسوفێک یان بیرمەندێک دەکات. بۆ نمونە لە لاپەڕە ٣٢ کتێبەکە تا لاپەڕە ٥٠ باس لە دادگایکردنو مەرگی سوقرات دەکات. لە لاپەڕە ٥١ بۆ لاپەڕە ٦٦ باس لە خەباتی ئەفلاتون لە پێناو دادپەروەریدا دەکات. لە لاپەڕە ١٥٩ بۆ ١٧٣ باس لە سانت ئۆگۆستین دەکات کە چۆن لە ناپاکییەوە بەرەو پاکی ڕۆشتووە. لە لاپەڕە ١٨٨ بۆ لاپەڕە ٢٠١ بەم ناونیشانە باس لە ماکیاڤیلی دەکات: ماکیاڤیلی.. قوتابی شەیتان. دواتر لە وتارێکی دیکەدا باس لە ڕۆسۆ دەکات کە بە باوکی شۆڕشی فەرەنسا لەقەڵەمی دەدات. پاشان باس لە ڤۆڵتێرو کانتو گۆتەو ئۆگۆست کۆنتو نیتچەو کرۆچەو چەندان بیریاری دیکە دەکات.

ئەم کتێبە وەک لە سەرەوە ئاماژەمان پێداوە لە ٥٠٧ لاپەڕەی قەبارە گەورە پێکهاتووەو تیراژەکەی هەزار دانەیەو نرخی حەوت هەزار دینارە.

بایەخو گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە بەڕێز هۆمەر قەرەداغی نوسیویەتی، ئەم بەڕێزە بۆ خۆی ماوەیەکی زۆرە لە قوتابخانەو خوێندنگاکانی وڵاتی سویدا مامۆستایەو لەوبارەیەوە شارەزاییەکی باشو فراوانی هەیە. هەروەها ئەم بەڕێزە یەکێک بووە لەوانەی لە ساڵی ٢٠٠٧، بەشداری ئەو کۆنگرە پەروەردەییەی کرد کە لە هەولێر بەستراو تێیدا بڕیاری گۆڕینی سیستمی خوێندنی کوردستان درا.

ئەم کتێبە وەک لە سەرەتای کتێبەکەدا هاتووە: بریتییە لە کۆمەڵە وتارێکی پەروەردەیی دەربارەی

چۆنایەتی سیستمی فێرکاری، بەردەوامبوون لەسەر ڕیفۆرم لەناو سیستەمەکەدا، نوێخوازی لە شێوەی کارکردندا، کارکردن لە پێناوی نەهێشتن یان کەمکردنەوەی نەخوێندەواریو کۆمەڵێک چاوپێکەوتنو گفتوگۆ دەربارەی زیاتر گەشەسەندنو بە دیموکراتیکردنی پرۆسەی فێرکاری لە کوردستاندا؟ لە ڕاستیدا پێویستە هەموو ئەوانەی لە کوردستان بەرپرسن لە لایەنی پەروەردەو فێرکردنەوە، هەر لە وەزیری خوێندنی باڵاو وەزیری پەروەردەوە، تا دەگاتە سەر بەڕێوەبەرەکانو سەرپەرشتیارانو تەواوی مامۆستایانی قۆناغە جیاواز جیاوازەکانی خوێندن، پێویستە ئەم کتێبە بخوێننەوە، تا لەژێر ڕۆشنایی زانیاریە بەکەڵکو نایابەکانی ئەم کتێبەدا، لە چۆنیەتی بەڕێوەچونی سیستەمە تازەکە تێبگەنو سود لە باسوخواسەکانی ناو کتێبەکە وەربگرن. بریا وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان هەڵدەسا بە کڕینی ئەم کتێبەو دابەشکردنی بەسەر سەرجەم قوتابخانە بنەڕەتیو ئامادەییەکاندا، ئەمەش بۆ ئەوەی لە هەر قوتابخانەو خوێندنگایەکدا دانەیەک لەم کتێبە لەبەردەست ستافی قوتابخانەکە یان خوێندنگاکەدا هەبێتو بیخوێننەوەو ڕێنماییەکانی جێبەجێ بکەن، بەمەش سیستەمی تازەی خوێندن، تاڕادەیەک لەو ئاڵۆزیو ناڕوونییەی ئێستای ڕزگاری دەبوو.

## خۆکوشتن

پرسیاری هەرە سەرەکی لەم کتێبەدا کە خراوەتەڕوو ئەوەیە: مرۆڤ بۆ خۆی دەکوژێت. نوسەری کتێبەکە بە درێژایی کتێبەکە هەوڵیداوە وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە کە تاڕادەیەکی زۆر پرسیارێکی فەلسەفیو ئەزەلییەو بەدرێژایی سەردەمو ڕۆژگارەکان هاتووەو بەردەوامیش دەبێت. ئەم کتێبە لە نووسینی د. ئەحمەد عەیاشەو لەلایەن بەڕێز خاتوو سۆزان جەمال، بە زمانێکی جوانو پوخت کراوە بە کوردی. کتێبەکە یەکێکە لە لێکۆڵینەوە جدییەکان لەسەر مەسەلەی خۆکوشتن. یەکێک لە خاڵە بەهێزەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە گێڕانەوەی چیرۆکی ئەو کەسانەیە کە خۆیان کوشتووە یان هەوڵی خۆکوشتنیان داوەو ئەو کەسانە نەخۆشی د. ئەحمەد خۆی بوون. ئەمەش شێوازێکی سەرکەوتووە بۆ ئاشنابوون لەگەڵ خۆکوشتندا. چونکە کاتێک ئەو چیرۆکانە دەخوێنینەوە، لەگەڵ ئازارو کۆژانەکانی قوربانییەکاندا دەژینو لەو هۆکارو فاکتەرانە تێدەگەین کە ئەو



کەسانەی هانداوە بۆ خۆسوتاندن. واتە تێدەگەین لە پشت هەر هەوڵێکی خۆسوتاندنەوە، دنیایەک لە نایەکسانیو نا دادپـــەروەریو ناحەقی کردن بەرامبەر بە قوربانییەکان ئامادەیە. دنیایەک هیچ تروسکاییەکی تێدا نەماوە بۆ ژیانو بۆ بەردەوامبوون. بەمانایەکیتر نوسەری کتێبەکە، بۆ نوسینەوەی کتێبەکەی، مادەیەکی زۆری لەبەردەستدا بووە کە زۆربەیان بریتییە لە بەسەرهاتی ئەو کەسانەی نەخۆش بـوونو نوسەر وەک پزیشکێک، گوێی لێگرتنو چـارەسـەری کــردوون. ئەمە وادەکـات کتێبەکەو تێزەکانی ناو کتێبەکە لەسەر خۆکوشتن، دەوڵەمەندتربێت. چونکە ڕووداوەکـان لە واقعدا ڕوویانداوەو نوسەر لە نزیکەوە ئاگاداری وردەکاری چۆنیەتی ڕووداوەکان بووە. لێرەوە ئێمە لەبەردەم کتێبێکدا کە بەشێکی بریتییە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ڕاستەقینەی چۆنیەتی ژیانو گوزەرانی ئەو مرۆڤانەی، لە ساتێک لە ساتەکاندا هەوڵی خۆکوشتنیانداوە.

جگە لەو بەسەرهاتانەی کە لە کتێبەکەدا هەیە، کتێبەکە بەشێوەیەکی تیۆری بـاس لە کـردەی خۆکوشتن دەکاتو وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە کە زۆرجار لەکاتی خۆکوشتنی کەسێکدا دەکرێت یان دەپرسین: بۆچی ئەو کەسە خۆی کوشت؟ هەروەها کتێبەکە دیـاردەی خۆکوشتن لە ڕووی بایۆلۆژیو ئایینیو فەلسەفییەوە لێکدەداتەوە. دواتر باس لە مەسەلەی خۆکوشتن لە ڕووی یاساییەوە دەکاتو باس لەو کاریگەریانە دەکات کە خۆکوشتن لەسەر کەسە نزیکەکانی ئەوانەی خۆیان دەکوژن دەکات. واتە باس لەو دەرئەنجامە سەختو دژوارانە دەکات کە کەسی خۆی کوژ، دوای خۆکوشتنەکەی، لەسەر خزمو ناسیاو هاوڕێوو دۆستەکانی بەجێدەهێڵێت. باس لەو کەسوهەواو بارودۆخە سایکۆلۆژیو ناخۆشە دەکات کە لە دوای خۆکوشتنەکەوە بۆ خەڵکانی نزیک لە خۆکوژەکە دروستدەبێت.

کتێبەکە لە بەشێکی دیکەیدا بـەوردی باس لەو ڕەفتار یان هێما یان نیشانانە دەکات کە لە کەسێکدا دەردەکەون و ئاماژەن بۆ خۆکوشتن. لێرەوە لەگەڵ دەرکەوتن یان هەستکردن بەو هێماو ڕەفتارانە، پێویستە بەخێرایی فریای ئەو کەسە بکەوینو بەهانایەوە بچینو لێنەگەڕێن خۆی بکوژێتو کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێت. هاوکات کتێبەکە خۆکوشتنو هەوڵەکانی خۆکوشتن لەیەک جیادەکاتەوە، هەروەها باسی هاوتاکانی خۆکوشتنیش دەکات.

نوسەری کتێبەکە لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئامادەژی بەوە داوە ئەم کتێبە خوێندنەوەیەکی وەسفییە بۆ دیاردەی خۆکوشتنو هۆکارو شێوەو لێکدانەوەی ئەم حاڵەتە مرۆییە کە تا مرۆڤ هەبێت ئەمیش بەردەوام دەبێتو دەشێ لەگەڵ دژواریو ئاڵۆزبوونی ژیاندا، مەسەلەی خۆکوشتنیش بەرەو زیادبوون بچێت. بە مانایەکی دیکە دیاردەی خۆکوشتن ئەستەمە بنبڕ بکرێتو لە هەمو سـەردەمو ڕۆژگارێکدا، کەسێک هەیە کە چیتر بـەرگـەی نـاڕەحـەتـیو ناحەقیو ناخۆشییەکانی ژیان ناگرێت، بۆیە ئاگر لە جەستەی خۆی بەردەداتو سنورێک بۆ ژیانی خۆی دادەنێت. بەڵام خاڵی گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە ئێمە چۆن لێنەگەڕێن ئەم دیاردەیە تەشەنەبسێنێتو چۆن هەوڵی نەهێشتنی، یان ڕاستتر کەمکردنەوەی بدەین.

ئەم کتێبە بریتییە لە ٣٨٠ لاپەڕەی مامناوەندیو تیراژەکەی هەزار دانەیەو نرخی شەش هەزار دینارەو لە بەرگێکو دیزاینێکی جواندا چاپو بڵاوکراوەتەوە.